# گەڕانەوەیەکی کاتی بۆ دایەلۆگێکی بەردەوام

## کاروان عومەر کاکەسوور


- سەرپەرشتیاری چاپ: سۆران عەزیز
- نەخشەسازیی ناوەوە و بەرگ: محەمەد زاری
- پیتچنین: نووسەر
- بابەت: ڕەخنەیی
- نۆبەتی چاپ: یەکەم/٢٠١٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٧٠٠٠ دینار
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەرتووکخانەگشتییەکان ژمارە (١٣٨)ـی ساڵی ٢٠١٩ـی دراوەتێ.



لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی

ناونیشان: هەولێر ـ فولکەی زەراعە ـ نێو پارکی وەفایی

https://www.facebook.com/mali.wafai

٠٧٥٠٤٨٢٦٦٤٧

# پێڕست

# پێشەکی

ساڵی (١٩٨٢)ـە و گەیشتوومەتە قۆناغی پێنجەمی ئەدەبی. سەردەمی ڕاپەڕینی لاوانە و وەک زۆربەی هاوڕێ و هاوپۆلەکانم خوێنم دەکوڵێت. لە کاتی قسەکردندا کۆمەڵێک وشە و ڕستەی ئاگرینم لە دەم دەردەچن. (ئاراس عەلی) قوتابییەکی خەڵکی سلێمانییە، لە زانکۆی سەلاحەدین دەخوێنێت، بووەتە هاوڕێمان و ڕۆژانە لە باخی گڵکەندا یەکتر دەبینین. کەسێکی هۆشیارە و بەردەوام لێوەی فێر دەبین. ڕۆژێکیان لە کاتی گفتوگۆدا من گوتەیەکی (ژان ژاک رۆسۆ) دەهێنمەوە و بە عەرەبییش دەیڵێم، وەک ئەوەی لە کتێبەکەدا نووسراوە، تاکوو بزانن چەند ڕۆشنبیرم. ئەمە گوتەکەیە: (یولد الانسان حرا، لکنه مقید بالاغلال في کل مکان: مرۆڤ بە ئازادی لە دایک دەبێت، بەڵام لە هەموو شوێنێکدا زنجیر کراوە).

(ئاراس) لێم دەپرسێت: (ئەم گوتەیەت لە کوێ هێناوە؟). منیش دەڵێم: (لە کتێبی مێژووی ئەورووپای قۆناغی پێنجەمی ئەدەبیدا هەیە). قاقایەکی ناشیرین لێ دەدات و دەڵێت: (گوتەی ناو کتێبی قوتابخانەمان پێ دەفرۆشێتەوە!). یەکەمجارە لە ژیانمدا کەسێک بەو شێوە سەیرە تەریقم بکاتەوە. ناتوانم یەک وشەیش بڵێم. ئەو لەبارەی (رۆسۆ)وە کۆمەڵێک شت دەڵێت، کە لای من هەم نوێن و هەم قورسن. (دیارە رۆسۆ هەر ئەو گوتەیە نییە، کە من خوێندوومەتەوە و هێندە ئاسان لە بەرم کردووە، بەڵکوو زۆر لەوە زیاترە!)... بەو تێکشکاوییەوە بۆ ماڵ دەگەڕێمەوە، بەڵام شەوەکەی خەوم لێ ناکەوێت، چونکە نازانم چۆن جارێکی تر ڕووی خۆم پێشانی هاوڕێکانم بدەمەوە. ئەمە بۆ لاوێکی خۆێنگەرمی وەک من زۆر بەئازارە. ئەمڕۆ وەک ڕۆژانی پێشوو بۆ گڵکەند ناچم، ئەگەرچی هەتاوێکی زۆر خۆشیشە. ئێوارە لە هاوڕێکانم دەبیستم، (ئاراس) زۆر بەدوامدا گەڕاوە و گوتوویەتی: (ئیشێکم پێیەتی. پێی بڵێن سبەی ئێوارە هەر دەبێت بیبینم!). دەچمە ئەوێ. دەیبینم و بە شەرمەوە لێی دەڕوانم. دەستی دەخاتە سەر شانم و کتێبی (ئیمیل، یان پەروەردەی منداڵ لە بێشکەوە تاکوو کاملی)ی (ژان ژاک رۆسۆ)م بە دیاری دەداتێ. پێم دەڵێت: (تۆ ئەگەر دەتەوێت رۆسۆ بناسیت، ئەم کتێبەی بخوێنەرەوە!). ڕاستییەکەی ئەو کتێبە لە بنەڕەتدا ناوی (ئیمیل، یان لەبارەی پەروەردەوە)یە، بەڵام وەرگێڕی عەرەبی (د.

نەزمی لۆقا) بەو شێوەیە گونجاندوویەتی. لاتان سەیر نەبێت ئەگەر بڵێم بە ڕادەیەک لەو کتێبە دەترسم، کە وا دەزانم مینە و هەر ئێستا پێمدا دەتەقێتەوە. باشە، بۆچی وا زیرەم کردووە؟ خۆیشم لەوە ناگەم. هەموو گیانم دەلەرزێت. (ئاراس) هەستم پێ دەکات و لێم دەپرسێت: (ئەوە تۆ چییتە؟). هەرچۆنی بێت بەسەر خۆمدا زاڵ دەبم و کتێبەکە دەهێنمەوە، بەڵام خۆ ناوێرم چەند لاپەڕەیەکیشی لێ بخوێنمەوە. ماوەیەکی پێ دەچێت، تاکوو ترسم لێی دەشکێت و دەست بە خوێندنەوەی دەکەم. لە پۆلی دووەمی کۆلیجدا، وانەیەکمان هەیە، ناوی پەروەردەیە، کە لە سەردەمی فەلسەفەی یۆنانییەوە تاکوو سەردەمی نوێ دەگرێتەوە. یەکێ لەو فیلۆسۆفانە (ژان ژاک رۆسۆ)یە، کە بەرهەمەکانی دەخوێنرێن. دۆکتۆرەکەمان لە لێکچەیەکدا دەڵێت: (ژان ژاک رۆسۆ پێی وایە مرۆڤ تاکوو تەمەنی هەژدە نابێت جگە لە زمانی دایکی، فێری هیچ زمانێکی تر ببێت)، لە کاتێکدا من دەزانم ئەو زانیارییە لە کتێبی (ئیمیل)دا بە شێوەیەکی ترە: ئەو نووسیویەتی: (باوەڕ ناکەم منداڵ تاکوو تەمەنی دوانزدە تا پانزدە بە تەواوی فێری دوو زمان ببێت، مەگەر هەر زۆر بلیمەت بێت). هەروەها بە وردییش ئەمەی شی کردووەتەوە. لە دەرەوە بە دۆکتۆرەکەمان دەڵێم ئەو زانیارییە بەو شێوەیە نییە، کە ئەو دەیڵێت، بەڵکوو بەو شێوەیەیە، من دەیزانم. سەرەتا دەیەوێت نکووڵی لەوە بکات، بەڵام کاتێ پێی دەڵێم بە وردی کتێبەکەم

خوێندووەتەوە و ناوی وەرگێڕەکەیش دەهێنم، ئینجا دەچێتە عەقڵی و بڕیار دەدات لێی بکۆڵێتەوە.

ئەو شێوازەی (ئاراس عەلی) لەگەڵ مندا بە کاری هێنا، بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت (shock and awe). واتە ڕاچڵەکین و تۆقین. تا ئەم ساتەیش قەرزداری ئەو قاقایە ناشیرین و قسە ڕەقەیم، کە لێیانەوە فێر بووم، سەرچاوەی گوتەکان بخوێنمەوە، نەوەک لە دەستی دووەم و سێیەمەوە وەریانبگرم.

ڕەخنەگری میللی، کە هەندێک گوتەی ساکاری لێرە و لەوێ بیستوون، وا دەزانێت، ئاگای لە تێکڕای فیکری فیلۆسۆفانی دنیایە، بۆیە بە ڕەوای دەزانێت پەلاماری داهێنەران بدات و بە چەند وشەیەکی ساکار خۆیان و بەرهەمیان بسڕێتەوە. من خۆم یەکێ لەو نووسەرانەم، کە زیاتر لە جارێک بەر ئەو پەلامارە کەوتوون. هێندە هەیە ئەو شێوازی (شۆک ئاند ئۆ)یەی (ئاراس عەلی)م گرتووەتە بەر، کە سەرەڕای ئەوەی ڕۆشنبیرێکی بەتوانا بوو، بەڵام لاپەڕەیەکی نەنووسی، یان بڵاو نەکردەوە. لەم نووسینەمدا هەوڵم داوە جارێکی تر ئەم شێوازە لەگەڵ ئازیزێکدا بگرمە بەر، کە پێشتریش لە ڕێگەی نامەی تایبەتەوە هەر ئەوەم لەگەڵدا کردووە. ڕەنگە خوێنەر بپرسێت ئەگەر پێشتر کردووتە و ئەنجامەکەی هەر وەک خۆیەتی، پێویست دەکات جارێکی تر بۆی بگەڕێیتەوە؟ وەڵامی ئەو پرسیارە نادەمەوە، یان با بڵێین ڕاستەوخۆ نایدەمەوە، بەڵکوو

بە کراوەیی جێی دەهێڵم. هێندە دەڵێم ئەم شێوازە تەنیا پێوەندیی بەو ئازیزەوە نییە، بەڵکوو ئەمە جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی ئەو زمانەی من هەمە و بەو شێوەیە بە کاری دەهێنم، (بوون)م دەردەبڕێت، بۆیە ناکرێت ئاستێکی وای نەبێت. بەو مەبەستەی ئەم ئاستەیش نەک بپارێزم، بەڵکوو بەرزتری بکەمەوە، ئەوا پەنا بۆ دایەلۆگ دەبەم. ئایا دەکرێت منێک هێندە (بوون)ی خۆم بە گرنگ بزانم، بە زمانی لاواز و کرێسپیش تەعبیری لێ بکەم؟ چ خوێنەرێکی پرسیارکەری یاخی بەرهەمی نووسەرێک بە گرنگ دەزانێت، کە (بوون)ێکی لاوازی هەیە و بە زمانی لاوازیش دەریدەبڕێت؟ مرۆڤ لە ئەلفوبێی فەلسەفەدا بەوە دەگات، کە زمانی لاواز، ئەو زمانەی پەنا بۆ جوێن، هەڵبەستن و شتی دیکەی لەم بابەتە دەبات، هیی (خود)ێکی لاواز و داڕووخاوە، کە فیلۆسۆف و زماناسەکان جەختیان لەسەر کردووەتەوە. بەرهەمی (خود)ی لاوازیش ناکرێت وەک داهێنان لێی بڕوانرێت، بەڵکوو بە ئاسانی تێکەڵی قسەی ڕۆژانەی خەڵک دەبێتەوە، مادام هەر لە بنەڕەتەوە لەوێوە هاتووە. بە مانایەکی تر، (بوون)ی ڕووکەش و لاواز لە ڕێگەی زمانی لاوازەوە خۆی دەردەخات، کە دواتر لەم نووسینەدا وردەکارییەکەی دەخوێنرێتەوە.

ڕەنگە لەم نووسینەمدا گوێتان بە قاقای ناشیرین و قسەی ڕەقی لە شێوەی ئەوەی (ئاراس عەلی) بزرینگێتەوە، بەلام لە

خۆم ڕادەبینم بڵێم بۆ ساتێ هەست ناکەن ئەوەی وا بۆ ئەم دایەلۆگەی بانگهێشت دەکەم، ڕقێکم لە ئاستیدا هەیە، بگرە لە دڵەوە دەڵێم هیوای ژیانێکی جوانتری بۆ دەخوازم. لەوەیش دوورتر دەڕۆم و دەڵێم چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکەم ئەویش بیەوێت لە ئاستێکی تردا بێتەوە دەنگ، بەتایبەتی، کە دەزانم ئەمە کاری هەمیشەی نەبووە و تواناکەی لەمە گەورەترە وا لێرەدا پێشانی داوە. باوەڕم وایە هەمووومان لە ساتێکی زەمەنیدا لاوازین و دەکرێت لە زەمەنێکی تردا بە شێوازی تر خۆمان دروست بکەینەوە، کە ئەم دایەلۆگە مەبەستیەتی هێزێکی وا ببەخشێت. بەوەدا (بوون)ی خۆم هەم بە گرنگ و هەم بە جوان دەزانم، ئەوا ئەو ئازیزە وشەیەکی لاواز لە دەمی منەوە نابیستێت، وەک چۆن پێشتریش نەیبیستووە، کە ئەمە مانای وا نییە ڕەخنەی توندی لێ ناگرم. ئەو ڕەخنەیەیش هەر لەبەر ئەوەیە خۆم بە خاوەنی (بوون)ێکی لاواز نازانم.

ڕەنگە هەندێک بپرسن: ئایا دەبێ تۆ لە ئاستی ڕەخنەی میللی هەڵبچیت و هاوارت لێ بەرز ببێتەوە؟ گوتەیەکی (ڕۆسۆ) هەر لە کتێبی یەکەمی (ئیمیل) وەردەگرم: (ئێوە دەڵێن یەکەم دەنگ، کە لە منداڵان بەرز دەبێتەوە، گریانە؟ من بە چاکی باوەڕ بەوە دەکەم. ئێوە هەر لەو دەمەی دێنە دنیاوە، سەرکوتیان دەکەن. یەکەم دیاری لە ئێوەوە پێیان دەگات، زنجیرە. یەکەم چارەسەر، کە پێی ملکەچ دەکرێن، ئازارە. هیچ شتێک شک

نابەن ئازاد بێت، جگە لە دەنگیان. بۆچی ئەو دەنگە ئازادە بۆ سکالاّ بە کار نەهێنن؟ بە هۆی ئەو ئازارەوە دەتلێنەوە، کە ئێوە بۆتان هێناون. ئەگەر خۆتان بە هەمان شێوەتان لیّ بکرێت، هاواری بەرزترتان لیّ هەلّدەستێت).

ئەگەر تێکست بەو منداڵەی (رۆسۆ) لەو کتێبەدا باسی دەکات چۆن دێتە دنیاوە و چۆن پیّ دەگات، بچوێنین، ئەوا ڕەخنەی میللی هەمان ئەو زنجیرەیە، دەیەوێت بیبەستێتەوە و هەمان ئەو ئازارەیشە، پێی دەگەیەنێت، بۆیە نووسەرەکەی تەنیا دەنگی ئازاد شک دەبات، تاکوو لە ئاستی ئەو ڕەخنەیەدا هەلّیببڕێت.

من نایشارمەوە ئازار دەچێژم، بەلاّم بەو دەنگە ئازادەم ئازاری خۆم بۆ خۆم دەردەبڕم. هاواری من هیی ناوەوەیە و لە ئاستی کۆت و زنجیردا بەرز دەبێتەوە، بیّ ئەوەی ئەو ناوەوەیەم جیّ بهێڵێت. بە شێوەیەک ئەو ئازارەمم خۆش دەوێت، کە دلّم نایەت لە خۆمی دوور بخەمەوە. هیچ شتیّ لەوە ئاسانتر نییە ئازار بگەیەنیت، بەلاّم سەختە دەست بە ئازارەوە بگریت. لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکاندا نەتانبیستووە چۆن نەشارەزاکان گەوهەری دەگمەن، زۆر بە هەرزان بە گەوهەرناسەکان دەفرۆشن؟ بە لاکەی تریشدا توانای تۆ لەوەدایە لە ناخەوە ئازارت خۆش بوێت، بە ڕادەیەک دلّت نەیەت بە کەسێکی تری بدەیت. ئایا دورڕناسەکان بە ئاسانی

دەستیان لەو گەوهەرە دەگمەن و دانسقانە دەبێتەوە، کە بە هەرزان، بگرە بە خۆڕایی لە نەشارەزاکانیان دەست کەوتوون؟ ئەوانەی هێندە ئاسان ئازار دەگەیەنن، ئەوە لەبەر ئەوەیە ئازارنەناسن و ساتێ نرخی ئازاریان نەزانیوە. ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویستیان بەوە نەبووە ئازاری (شۆپێنهاوێر)، (نیتشە)، (هایدیگەر) و دوڕناسەکانی تر لە نزیکەوە بناسن. کەواتە ئەگەر لەم نووسینەمدا وەک هەموو ئەوانەی ترم بەم زمانە دەنووسم و ئەوەی بەرانبەرم ئازار نادەم، لەبەر لاوازی نییە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە لەم ڕووەوە کەسێکی خۆپەرستم و نامەوێت کەمێک لەو ئازارە نازدارەم بە یەکێکی تر بگەیەنم.

گوێ بگرن! ئەوەتا ئەو ئازارەی نەشارەزایانی بواری ئازار بە نەشارەزایی پێیان دام، ئەم نووسینەم لێ خوڵقاند!

ئازیزان، گلەییم لێ مەکەن، ئەگەر ئازارم هەیە، بەڵام ڕێگەتان دەدەم ڕەخنەی توندم لێ بگرن، ئەگەر ئەو ئازارەی خۆمم خۆش نەویست و بە جوانی نەمخستە گەڕ! ڕەخنەم لێ بگرن، کاتێ دەبینن لە نرخی ئەو ئازارەم کەم دەکەمەوە و لە ئاستی نزمدا هەڵیدەسووڕێنم!

ئەمەی بەردەستتان نامیلکەیە، کتێبە، یان هەر ناوێکی دیکەی هەیە، گرنگ نییە، بەڵکوو ئەوەی گرنگە، ئەوەیە، لە ڕێگەیەوە

به ئازاری خۆمدا دەچمەوە. لێرەدا تەنیا من و ئازار هەین، بەڵام شوێنیش چۆڵە بۆ هەر کەسێکی تر، کە ئازاری هەیە.

دەیڵێمەوە: ئەگەر توانیومە لەم نووسینەمدا شتێکی جیاواز بە دەستەوە بدەم، ئەوا بزانن لەبەر ئەوەیە ئازاری خۆم وەک ئەوەی (نیتشە) پێی لەسەر دادەگرێت، بە گرنگ دەزانم.

بەوەدا نووسینەکە لە شێوەی نامەدایە و لەوێدا دەروازەیەک هەیە، کە لێیەوە دەچمە ناو بابەتە سەرەکییەکەوە، ئەوا بە پێویستی نازانم لێرەدا لەوە زیاتر بڵێم.

**کاروان کاکەسوور**

**من تەنیا بە دەست نانووسم،**

**قاچیشم هەر لە خۆیەوە دەنووسێت.**

**بەتین، ئازاد و ئازایە قاچم،**

**دەکەوێتە ڕاکردن لە کێڵگە و لە کاغەزدا.**

پارچەی پەنجاودووی کتێبی (زانستی هۆژی)ی (نیتشە) لە ژێر ناونیشانی (نووسین بە یەک قاچ).[1]

---

[1] Friedrich Nietzsche, The Gay Science, Edited by Bernard Williams, Translated by Josefine Nauckhoff, Cambridge University, Seventh printing ٢٠٠٨, pp.٢١

# دەروازەیەك

برای ئازیزم، کاک ئارام سدیق!

سەلاو و خۆشەویستیت بۆ دەنێرم. هیوادارم ئاسوودە بیت. لە سەرەتاوە پێت دەڵێم تۆ وەک مرۆڤێک ئازیزی لای من، بۆیە ئەگەر هەر وشەیەکی ئەم نامەیە، دەنگدانەوەی تووڕەی هەبوو، ئەوا بزانە ئاڕاستەیە بۆ ڕوانینت، نەوەک بۆ خودی خۆت! پێویستە ئەوەیش بگوترێت سروشتی بابەتەکە وای ویستووە. دەیڵێمەوە ساتێکم لە بیر نییە دڵم لە تۆ ئێشا بێت و وشەیەکی ناشیرینم پێ گوتبێتی، لە کاتێکدا ئەمە هەر دوورە لە من. ئەگەر دەبینی ئاوا بە ئاشکرا و بە دەنگی بەرز ئەمە دەڵێم، لەبەر ئەوەیە یەک کەس نییە لە دەمی منەوە وشەیەکی نەگەتیڤی لەبارەی تۆوە، یان لەبارەی هیچ کەسێکی ترەوە، بیستبێت.

له ڕێگەی ئەم نووسینەوە لەسەر دوو گوتارت دەوەستم، کە هەردووکیان لەبارەی وازهێنانی منەوەن لە نووسین، دروستتر لە بڵاوکردنەوە. وەک دەزانیت لە سەرەتای ئابی پاردا لە ڕاگەیاندنێکدا ئەوەم بە خوێنەر گەیاند، کە من وازم لە نووسین، دروستتر لە بڵاوکردنەوە هێناوە. ئەگەرچی نەمدەویست هیچ پێوەندییەکم بە دنیای نووسینی کوردییەوە بمێنێت، کە ئەمەیان تەنیا لەبەر ئەوەی باری دەروونیم وای خواستووە، بەڵام یەکێ لە هاوڕێکانم لە کوردستانەوە، لە ڕێگەی ڤایبەرەوە پێی ڕاگەیاندم، کە تۆ لە فەیسبووک هێرشێکی باشت بۆ سەر من دەست پێ کردووە و بە ئارەزووی خۆت شت دەڵێیت. لێت ناشارمەوە بە لامەوە سەیر بوو، چونکە من ماوەیەکی زۆر تۆ هەر بابەتێکت بڵاو دەکردەوە، لەبارەیەوە هەم پرسیارم لێ دەکردیت و هەم چەند سەرنجێکم بۆ دەنووسیت، بەو مەبەستەی گفتوگۆ بکەین.([2])

سەرەتا تا ڕادەیەکی کەم ئەوەت ویست، بەڵام دوایی وردەوردە ئەو ئارەزووە کەمەیشت نەما، تاکوو گەیشتە ئەوەی هەر نەڵێیت نامەکانمت پێ گەیشتوون، ئەگەرچی بەردەوام ئەو داوایەم دەخستە بەر دەمت و دەمگوت با گفتوگۆ بکەین. دیارە ئەمەیش مافی خۆتە و کەس ناتوانێت بە زۆر بتخاتە گفتوگۆوە، بەڵام وەک گوتم سەیرەکە، ئەوەیە،

---

[2] لەم نووسینەدا یەک دوو نموونەیان لێ وەردەگرم، بەڵام ئەگەر تۆ خۆت پێت خۆشە، هەموویان بڵاو بکەمەوە، ئەوا بە خۆشحاڵییەوە ئەو کارە دەکەم.

کاتێ دەزانیت وازم هێناوە، ئینجا دەکەویتە خۆ و حەماست بەرز دەبێتەوە.

پێویستە هەر لێرەیشدا ئاماژە بەوە بکرێت، کە گفتوگۆی ئێمە لە ڕێگەی نامەوە، تەنانەت لە ڕێگەی تەلەفۆنیشەوە مێژوویەکی تا ڕادەیەک درێژی هەیە، کە یەکەمجاریش تۆ ئەو دەستپێشخەرییە جوانەت کرد، کاتێ چیرۆکنووسێکی هاوڕێم گفتوگۆیەکی لەگەڵ کردم، کە دواتر وەک کتێب لە ژێر ناونیشانی (منداڵێک بە دزییەوە کتێب دەخوێنێتەوە)دا چاپ کرا. تۆ لەو بارەیەوە نامەیەکت بۆ ناردم، کە هەتا ئێستایش لای خۆمدا پاراستوومە و لەوێ هەندێک سەرنجت لە شێوەی پرسیاردا نووسیوە، کە سەرنجەکان ئەگەرچی سادەن، بەڵام بە ڕاستی دەڵێم شێوازێکی نەرمیان هەیە. من لەو گفتوگۆیەدا لەبارەی کۆمەڵێک چەمکی ئەدەبی، هونەری، فەلسەفی، زمانەوانی و هیی ترەوە قسەم کردووە، کەچی تۆ لەسەر هیچ یەکێ لەمانە نەوەستاویت، بەڵکوو تەنیا دوو سێ خاڵی لاوەکیت دەستنیشان کردوون، بەڵام دەیڵێمەوە ئەگەر لەگەڵ ئەم دوو گوتارەتدا بەراوردی بکەم، ئەوا وەک ئەوە وایە دوو کەسی جیاواز نووسیبێتیانن. هەستم کرد نووسەری ئەو نامەیە گەنجێکە و خەونی داهێنانی هەیە. لەمەوە بووینە هاوڕێ. دواتر ڕەنگە وەک زۆر شتی تر بۆ ئەم نامەیش

بگەڕێمەوە، بەڵام لێرەدا هێندە دەڵێم ئەمە سەرەتای دەستپێکردنی گفتوگۆی نێوانمانە.

من هەر کە زانیم نیازت وایە بابەتێک لەبارەی وازهێنانمەوە بنووسیت، خێرا نامەیەکی کورتم بۆ ناردیت و داوام لێ کردیت، ئەگەر هەر شتێک دەنووسیت، بۆمی بنێرە، تاکوو لەگەڵ ئەوەیشدا وازم هێناوە، بەڵام گفتوگۆت لەگەڵ بکەم. تۆ وەڵامی ئەوەیشت نەدایەوە. پەنام بۆ هاوڕێ نزیکەکانت برد، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان هاوڕێی منیشن، بەو هیوایەی بتوانن وات لێ بکەن لەو بارەیەوە گفتوگۆ بکەین، بەڵام دیار بوو تۆ نەتدەویست. یەکێ لەو هاوڕێیانە وەڵامی نامەکەمی نەدایەوە، کە ئەمەی لەسەر جوانی بۆ حیساب دەکەم، نەوەک لەسەر ناشیرینی، چونکە ڕەنگە من خۆیشم لە شوێنی ئەو بوومایە، نەمویستایە بێمە ناو باسێکی هێندە بێکەڵکەوە. ڕەخنەگرێک ئامادە نییە لەگەڵ نووسەرێکی ئەدەبیدا گفتوگۆ بکات، بەڵام بە زمانی میللی باسی وازهێنانەکەی دەکات و بە ئارەزووی خۆی کۆمەڵێک شتی بۆ هەڵدەبەستێت. ئەمە بە هەموو مانایەک دوورە لە کەسێک، چەند کتێبێکی چاپ کردوون. دوو هاوڕێکەی تریش بە شێوازی خۆیان هەڵوێستی جوانیان هەبوو، کە لێرەوە سوپاسیان دەکەم. وەک گوتم لەم نووسینەمدا نموونەیان لێ وەردەگرم، بەو مەبەستەی خوێنەر چاکتر ئاگای لەو بابەتە بێت.

ئەودەم ئەم نوکتەیەم بە بیر هاتەوە: ساڵی (١٩٩٣) لە کەمپێکی دانمارکدا کوڕێکی کورد بە زمانی کوردی لە پیاوێکی دانمارکی دەپرسێت: (تۆ ئینگلیزی دەزانیت؟). بێگومان کابرا لێی تێناگات، بەڵام لەو کاتەدا کوردێکی تر، کە هەندێک ئینگلیزی دەزانێت، دێتە نێوانیانەوە و بە دانمارکییەکە دەڵێت: ئەو کوردە دەپرسێت: (Do you speak English?). ئەویش دەڵێت: (کەم). (وەک سەرنجێک: دانمارکی کاتێ دەڵێت ئینگلیزی کەم دەزانم، ئەوە لە چاو ئێمە زۆر دەزانێت). ئینجا وەڵامی کابرای دانمارکیی بۆ دەکاتە کوردی و لێی دەپرسێت: (دەتەوێ لەبارەی چییەوە قسەی لەگەڵ بکەیت؟). ئەویش دەڵێت: (ڕاستییەکەی دەمەوێ کەسێکی دانمارکی بدۆزمەوە، ئینگلیزییەکی باش بزانێت، تاکوو لەبارەی نیزامی دانمارکییەوە گفتوگۆی لەگەڵ بکەم). ئەویش لێی دەپرسێت: (باشە، بۆ لەگەڵ ئەمەیان قسە ناکەیت؟). ئەم وەڵامەی دەداتەوە: (ئەو گێلە ئینگلیزی نازانێت. پێی بڵێ من لەگەڵ کەسێک گفتوگۆ ناکەم، تەنیا کەمێک ئینگلیزی بزانێت).

خۆم ئەم نوکتەیەم لەسەر بنەمایەکی ڕیالیستی هەڵبەستبوو. وەرە، من ماوەیەکی زۆر داوات لێ بکەم گفتوگۆ بکەین و هەر وەڵام نەدەیتەوە، کەچی هاوکاتی وازهێنانم بە پەلەپەل گوتارێک بەو زمانە بنووسیت! لەگەڵ ئەوەیشدا لە دۆخێکی سایکۆلۆجیی ناخۆشدا بووم، کە تۆ خۆت زۆر چاکت دەزانی،

بۆیە ئەو دەرفەتەیشت قۆزتبووەوە، بەڵام نامەیەکم بۆی ناردیت، (لە لاپەڕەکانی کۆتاییدا بەشێکی ئەویش بڵاو دەکەمەوە). لەوێیش پێم گوتوویت با دایەلۆگ بکەین، بەڵام هەر وەڵامت نەداومەتەوە. ئاگایشم لە خۆم بووە ئەو دۆخە دەروونییە کار نەکاتە سەرم و بە زمانێک نەینووسم، کە ئاستێکی نزمی هەبێت. هێشتا وەڵامت نەدایەوە. ئینجا دوای ساڵێک دیسان هاتوویت گوتارێکی ترت هەر لەبارەی منەوە نووسیوە، کە بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەو زمانە نەک هیی ڕەخنەگرێک نییە، باوەشێک کتێبی نووسیبێت، بەڵکوو باوەڕ ناکەم هەر کەسێک تەنیا چەند جارێک بە لای کتێبخانەیەکی باشدا تێ پەڕیبێت، ڕێگە بە خۆی بدات ئەم وشانەی بە دەمدا بێت. ئەمەیشم هەر لە ڕێگەی هەمان هاوڕێوە پێ گەیشت، کە پێشتر لە گوتاری یەکەمتی ئاگادار کردبوومەوە.

ئەوەی وای لێ کردوویت ئەم گوتارەت بنووسیت، ئەوەیە، کە شاعیرێک دوای ئەوەی تۆ بەو زمانە میللییەت پەلامارت داوە، هاتووە لەبارەی گوتارەکەتەوە پرسیاری لێ کردوویت، کە لەوێدا ئاماژەی بە ناوی من داوە، بەوەی پێشتر ئەم میتۆدەم بە کار هێناوە. تۆ لەمەوە لە جیاتیی ئەوەی بە دەنگ پرسیارەکانیەوە بێیت، هاتوویت تۆپەڵێک جوێنت بە من داوە، بەڵام لە ئێستاوە پێت دەڵێم وەکو جوێن وەریان ناگرم، بەڵکوو

لەسەر هەر یەکێ لەو چەمکانەی فڕێت داون، دەوەستم و لە بوارەکانی مەعریفەدا بۆیان دەگەڕێم.

بۆچی هەتا ئەو شاعیرە بە پرسیار ڕووبەڕووت نەبووەوە، تۆ باسی ئەو نامانەت بۆ خوێنەر نەکرد؟ کاتێکیش باست کرد، بۆچی نموونەیەکت لێ نەهێنانەوە؟ ئەگەر وات بکردایە، ئێستا لانی کەم پێویستی نەدەکرد ئەم بەشەی نووسینەکەم بنووسم، چونکە هەر کەسێ چوار دێڕ لەو نامانە بخوێنێتەوە، لەوە دەگات، کە لە چ ئاستێک و بە چ مەبەستێک نووسراون، لە کاتێکدا تۆ وات پێشان داوە ئەوانە شتی پووچن، کە دواتر بۆیان دەگەڕێمەوە و قسەیان لێوە دەکەم.

ڕاستییەکەی من دەستی ئەو شاعیرە دەگوشم، کە نەهات وەک زۆر نووسەری تر بە هەمان شێوازە کۆنەکە وەڵامی ئەو پەلامارەت بداتەوە، بەڵکوو تەنیا پرسیاری لێ کردیت، ئاخۆ ئەم چەمکانەت لە کوێ هێناون و مەبەستت لەم شت و لەو شت چییە.

پێم وایە ئەمە ئەلفوبێیە، کە کاری ڕەخنەگر ئەوەیە لە شت بکۆڵێتەوە، بێ ئەوەی بڕیار لەسەر ئەو شتانە بدات، یان بیەوێت بگاتە ئەنجامێکی دیاریکراو، کە لە فیکردا (بێگومان ئەدەب و هونەریش دەگرێتەوە)، ئەنجام بوونی نییە، چونکە فیکر جیاوازە لە زانست، کە هەوڵ دەدەم بە درێژاییی ئەم

نووسینەم لای نووسەر و فیلۆسۆفە گەورەکانی دنیادا بۆی بگەڕێم. ئەوەی تۆ کردووتە، بە ئینگلیزی پێی دەگوترێ ( The fallacy of jumping to conclusions). واتە هەڵەی بازدان بۆ ئەنجام. بەکورتی مەبەست لەوانەیە واز لە لێکۆڵینەوە دەهێنن و دەیانەوێت بگەنە ئەو ئەنجامەی، خۆیان پێشتر دیارییان کردووە، کە ئەمە لۆژیکی دەرەوەی فیکرە، بەڵکوو هیی ئاستی میللییە، کە تۆ مادام وەک ڕەخنەگر خۆتت ناساندووە، دەبێت تێکی بشکێنیت، نەوەک دەستی پێوە بگریت. دانانی یەک هۆکاریش بۆ شت، پێی دەگوترێت: ( The fallacy of the single cause)، کە مانای هەڵەی تاکەهۆکارە و تەنانەت لە بواری زانستیشدا زۆر بە کار دەهێنرێت.

بەگشتی هەردوو گوتارەکەت بەپێی ئەو دوو پرینسیپە نووسراون. کۆمەڵێک شتت بە خەیاڵدا هاتوون و لەوانەوە بە ئەنجامێک گەیشتوویت، کە من بۆیە ئیتر نانووسم، چونکە موفلیسم، چونکە هیچم نەماوە بیڵێم، چونکە دەمەوێ خوێنەر بۆ خۆم ڕابکێشم و کتێبەکانم بکڕن. دواتر لە شوێنی گونجاودا بۆ ئەمەیش دەگەڕێمەوە. پێشتریش پێم گوتووی، کە ئەوەی تۆ کردووتە، بە هەر کەسێکی تر دەکرێت. ئەوە پێی دەگوترێت (Culture habits). واتە تۆ پەنات بۆ شتێکی ئاسان بردووە، کە لە دنیای کەلتووری ئێمەدا مێژوویەکی درێژی هەیە و ناسراوە، بگرە بووەتە زمان و تێگەیشتنی ڕۆژانەی جەماوەر.

بەکورتی هیچی نوێت نەگوتووە و ناشکرێت نووسەر بەم زمانە میللییە هیچی نوێ بڵێت.

ئەوەی لێرەدا من بۆی پەرۆشم، بەرگرییە لە خۆم وەک ئەوەی کراوەمەتە بابەت، بابەتێک بۆ سڕینەوە، نەوەک لەبەر ئەوەی وام پێ گوتراوە، کە دواتر دەبیینیت ئاخۆ هیچ کاردانەوەیەکی خراپم لا دروست دەبێت! بە مانایەکی تر، من لێرەدا لە ڕێگەی دایەلۆگەوە بەرگری لە جیاوازی دەکەم، نەوەک لە حەقیقەت، کە ئەو دووانە تەواو لە یەکتر جودان، ئەگەرچی زۆرجار لای ئێمە تێکەڵی یەکتر دەکرێن. لێرەدا تۆ وەک ڕەخنەگرێکی میللی ویستووتە هەر جیاوازییەک بسڕیتەوە، کە بە دەست هاتووە. بەکورتی هەوڵت داوە جیاوازییەکان نەهێڵیت و تێکەڵی زمان و تێگەیشتنی باویان بکەیتەوە، کە ئێرە ئەو شوێنەیە، خۆت لەم دوو گوتارەتدا، تێیدا چەقت بەستووە، دروستتر ئەو شوێنەیە، کە هەموومان، ئەوەی نووسەرە و ئەوەی نووسەریش نییە، تێیدا چاو دەکەینەوە، بەڵام هەندێکمان جێی دەهێڵین و هەندێکمان لە ناویدا دەمێنینەوە. (دێریدا) پێی وایە چەمکی نووسین تێپەڕاندنی چەمکی زمانە و لە ناخی خۆیشیدا هەڵیدەگرێت، کە ئەمە بێگومان ئەوە دەسەپێنێت پێناسەی نووسین و زمان پێکەوە بکەین. ئینجا ئەگەر زمان بە هەموو کردار، جووڵە، فیکر، بیرکردنەوە، ئاگایی، نائاگایی، ئەزموون، سۆز و هیی دیکە بگوترێت، ئەوا ئێمە ئەمڕۆ پەرۆشانە

ڕووبەڕووی ئەوە دەبینە ناوی نووسین لە تێکڕای ئەوانە بنێین.[٣]

واتە نووسین زمان دادەپۆشێت و دەبێتە خاوەنی سەرجەم موڵکی ئەو زمانە، بۆیە نووسین پرۆسەسی تێپەڕاندن و جیاوازییە. بێگومان مەبەستی (دێریدا) لە نووسین، نووسینەوەی قسەی ڕۆژانە نییە، بگرە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەیشیەتی، بەوەی وەک سێنترالیک خۆی سەپاندووە، کە ئەمە ناوەڕۆکی ڕێگە فەلسەفییەکەیەتی. واتە گرنگیی نووسین لەوەدایە بەر شتێک دەکەوێت، زۆر گەورەیە، کە ناوی زمانە و هەر لەو ڕێگەیەیشەوە جیاوازی دەهێنێتە کایەوە. پێشتر لەوە دواوم.[٤]

تۆ لێرەدا نەک هەر لەم جیاوازییەوە دەستت پێ نەکردووە، تاکوو خۆیشت هەر لە ڕێگەی نووسینەوە جیاوازیی تر بەرهەم بهێنیت و ئاستی من تێ بپەڕێنیت، بەڵکوو گەرەکتە بەو زمانە ساکارەی ڕۆژانەی خەڵک هەموو ئەو جیاوازییانەیش بۆ دۆخی خۆیان بگەڕێنیتەوە، لە کاتێکدا ناگەڕێنەوە. دیسان دەیڵێمەوە ئەمە ئەو جیاوازییەیە، کە من بە درێژاییی ئەم نووسینەم بەرگریی لێ دەکەم. ئەو پەرۆشییەیشم بۆ بەرگریکردن لە جیاوازی، نەوەک لە حەقیقەت، پاڵم پێوە دەنێت

---

[٣] جاك دريدا، الكتابة والاختلاف، ترجمة كاظم جهاد، تقديم محمد علال سيناصر، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، الطبعة الثانية، ٢٠٠٠، ص١٠٧

[٤] http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٠/٣/karwan_bakhtyar.htm

بە زمانێکی قووڵ بنووسم، بگرە وام لێ دەکات سوور بم لەسەر ئەوەی ئەو زمانە لە ئاستێکی بەرزدا بە کار ببەم و شتی نوێ بە خوێنەر بڵێم.

هاوڕێ نزیکەکانم گەلێجار گلەییم لێ دەکەن، بەوەی نووسینی ئەو نووسەرانە فەرامۆش ناکەم، کە لەم ئاستەی زماندا لەبارەمەوە دەنووسن، بەڵکوو بە هەندیان وەردەگرم و ڕووبەڕوویان دەبمەوە. ڕاستییەکەی تا ڕادەیەک هەقیان دەدەمێ، کە ئەوان بینیویانە چۆن بەشێکی زۆری نووسەرانی ئێمە کاتێ ڕووبەڕووی ئەم جۆرە نووسینە دەبنەوە، پەنا بۆ هەمان زمان دەبەنەوە و بە هەمان مێتۆد وەڵام دەدەنەوە، بەڵام من نە پێشتر ئەو زمان و مێتۆدەم گرتووەتە بەر و نە ئێستایش ڕێگەیان دەدەم بێنە ناو ئەم نووسینەمەوە، بەڵکوو هەموو شتێک بە ئاڕاستەی دایەلۆگدا دەبەم و خۆم لە بڕیار و حوکمدان دوور دەگرم، کە ئەمە ئەوەم بەسەردا دەسەپێنێت لە هەر شوێنێکدا مەودایەکی فراوان بۆ قسەی تری جیاواز بە کراوەیی جێ بهێڵم.

کاتێ دەڵێم دایەلۆگ دەکەم، هیچ مەرجێکم نییە، ئاخۆ ئەوەی ڕووبەڕووی دەبمەوە، کێیە و لە چ ئاستێکدایە، بەڵکوو ئەوە بە گرنگ دەزانم جیاوازیی خۆم لە بەرانبەر ئەوەی ڕووبەڕووی دەبمەوە، بخەمە ڕوو و ئاستێکی تری زمان پێشان بدەم. لای من ئەو مەودایە گرنگە، کە لەنێوان بابەتی ئەو نووسەرە و

نووسینی خۆمدا دروستی دەکەم. بەم شێوەیە (چی گوتراوە) و (چی لەبارەیەوە دەڵێم)، من بۆ ئەو دایەلۆگە دەبەن، نەوەک ئەو کەسە کێیە وای گوتووە. (فۆکۆ) لە (نووسەر چییە؟)دا پێی وایە ئەوە نووسەر نییە گرنگە، بەڵکوو ئەوەی بایەخی هەیە، چەمکە. هەر لەبەر ئەوەیشە ناپرسێت نووسەر کێیە. ئەو پرسیارە لە (بیکیت) وەردەگرێت: (ئاخۆ گرنگە کێ قسە دەکات؟)، کە بە گوێپێنەدان (indifference)ـەوە دەیلێت، بەو مانایەی گوتە گرنگە، نەوەک خاوەنی گوتە. (فۆکۆ) لەو ڕێگەیەوە ڕۆڵی نووسەر لە بەرانبەر نووسیندا، یاخود لە ئاست گوتراودا کەم دەکاتەوە.(٥)

خەڵکی ئاسایی هەم بەر لە (ئەریستۆ) و هەم دوای ئەویش ڕۆژانە باسی ئاو، خاک، ئاگر و هەوایان کردووە، بەڵام ئایا وەک ئەو لێیان ورد بوونەتەوە و توانیویانە بەو شێوەیە قووڵاییان ببینن؟ ئەو شتانەی فیلۆسۆفەکان لەبارەیانەوە دەنووسن و مانای نوێیان تێدا دەدۆزنەوە، هەر ئەوانەن، کە خەڵکی تریش دەیانناسن، بۆیە ئەوە ناوی شتەکان نییە، بەڵکوو ئەو مانا نوێیانەن، کە لێیانەوە بەرهەم دێن، زمان و تێگەیشتنی کەسێک لە هی کەسێکی تر جودا دەکەنەوە. دەمەوێت بڵێم

---

(٥) لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکیەتی: Michel Foucault, What Is An Author? http://seas٣.elte.hu/coursematerial/HarasztosAgnes/Foucault_WhatIsAnAuthor.pdf

لێرەدا تۆ لە دیدی خۆتەوە باسی ئەو شتانە دەکەیت، کە تێگەیشتنەکەت لەگەڵ ئاستی کەلتووری ئەمڕۆی کوردیدا ڕێکە و منیش لە دیدی خۆمەوە، کە دەتوانم بڵێم دیدێکی ڕەخنەیی فەلسەفییە. لای من بایەخی ئەو جیاوازییە لەم دایەلۆگەدا دەردەکەوێت. دیارە بۆیە دەڵێم (لێرەدا)، چونکە تەنیا مەبەستم لەو دوو گوتارەتە، دەنا بەرهەمی تری جیاواز لەمانەیشت هەن، کە پێشتریش وام پێ گوتوویت.

باوەڕم بە دابەشکردنی نووسەریش بۆ هیی گەورە و هیی بچووک نییە، چونکە ئەو دابەشکردنە دیسان زەمەنمان لە بەردەم دادەخات. مادام باوەڕم بە دایەلۆگ هەیە، ئەوا پێم وایە ئەوەی بەرانبەرم تەنیا لێم جیاوازە، دەنا لێم کەمتر نییە. دایەلۆگ هێزی بزواندنی تواناکانی هەیە و ناهێڵێت دوا بڕیار لەسەر هیچ کەس و هیچ تێرمێک بدەین، بەڵکوو لە ڕێگەی دەرخستنی ئەو جیاوازییەوە بەردەوام ڕێگەی ترمان لە بەردەمدا دەکاتەوە. هیوادارم تۆیش ئەم ئاستەی من تێ بپەڕێنیت و گفتوگۆیەک بکەیت، کە خۆم لە پێش هەر کەسێکی ترەوە پێی سەرسام ببم. وەک بەردەوام گوتوومە هەر قسەیەکم لەبارەی بەرهەمەکانتەوە کردبێت، پێوەندیی بە ئێستاتەوە هەیە. خۆ هەر کاتێ ئەم ئێستایەی خۆتت تێپەڕاند، ڕوانینی من دەگۆڕیت و وام لێ دەکەیت بە شێوەیەکی جیاواز لەوەی پێشوو بتبینم و بەرهەمەکانت بخوێنمەوە.

کەواتە من ئەوەی جارێکی تر دایدەمەزرێنم، گفتوگۆیە، نەوەک شەڕ، بۆیە مەبەستم نییە بیبەمەوە، چونکە ئەگەر وا بێت، خاڵێکی دیاریکراوم نیشان کردووە و هەر دەبێت پێی بگەم، کە ئەو کەلتووری بردنەوەیە بەردەوام دنیای ئێستاتیکای ئێمەی داڕووخاندووە. من هەر نامەوێ بە خاڵێکی دیاریکراو بگەم، بەڵکوو مەبەستمە لەم گفتوگۆیەدا بەر دەیان پرسیاری نوێ بکەوم و دەیان کەناڵی دیکەی نوێی ڕوانینیش بهێنمە دی.

بڕیاردان لەسەر مرۆڤ و کورتکردنەوەی لە چوارچێوەی زەمەنێکی دیاریکراودا، نابێت کاری کەسێک بێت دوور، یان نزیک پێوەندیی بە فیکری ڕەخنەییەوە هەیە. ئەمە کاری ڕێژیمە دیکتاتۆرەکانە، کە مرۆڤ بۆ ئایدیۆلۆجیا کورت دەکەنەوە، بۆیە من ناڵێم تۆ هیچ توانایەکت نییە، لە کاتێکدا توانا بە زگماک لە هەموو بوونەوەرێکدا هەیە، بەڵکوو دەڵێم لێرەدا، لەو دوو گوتارەتدا لە ئاستی میللیدا چەقیویت و بە درێژاییی ئەم نووسینەم هەوڵ دەدەم لە ڕێگەی پرسیارەوە بەدواداچوونی بۆ بکەم. ئەگەر ئەو ڕێگەیە نەگرم و نموونە لە بۆچوونەکانت نەهێنمەوە، بەو مەبەستەی لێیان بکۆڵمەوە، ئەوە دەبێتە بڕیار و ناکرێت وەک لێکۆڵینەوە لێی بڕوانرێت، کە پێشتریش لە نامەکانمدا هەر وام کردووە و دەتوانیت جارێکی تر بیانخوێنیتەوە.

بڕیاردان لەسەر تێکست بە چاک، یان بە خراپ خەسڵەتی سەرەکیی ڕەخنەگری میللییە. ئەو تەنیا یەک حەقیقەت و یەک لۆژیک دەناسێت، کە فەلسەفە بە درێژاییی مێژووی خۆی ڕووبەڕووی ئەو تێگەیشتنە ساکارە بووەتەوە و هەوڵی داوە تێکی بشکێنێت. ئەمەیش مانای وایە ئەو تێکستە هەر لە بنەڕەتەوە لای ئەو ڕەخنەگرە میللییەدا گرنگیی نییە، بگرە جاری وا هەیە دەگاتە ئەوەی هەر خودی تێکستەکەیش دەشارێتەوە و پەرەگرافێکی لێ وەرناگرێت، چونکە ئەوەی لێرەدا پێی گرنگە، بڕیارە پێشوەختەکەیە، نەوەک لێکۆڵینەوە، وەک ئەوەی تۆی ئازیز لەم دوو گوتارەتدا کردووتە. (پۆل ریکۆر) پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، هێرمۆنتیکا، واتە تیۆریی ڕاڤەکردن هەر لە بنەڕەتەوە بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی کردارەکانی تێکستە.(٦)

بە هیچ شێوەیەک بڕیار لەسەر سبەیت نادەم، کە دەشێ زۆر گۆڕانکاریی گەورە لە خۆتدا بکەیت. بە مانایەکی تر ئەوەی من لێرەدا لەبارەی بەرهەمی زمانی تۆوە دەیڵێم، تەنیا پێوەندیی بەو دوو گوتارەتەوە هەیە، دەنا لە ئێستاوە پێت دەڵێم ناکرێت لەبارەی ئاییندەتەوە هیچ وێنەیەکی لەم شێوەیە بهێنمە بەر چاو. ناکرێت لەسەر بنەمای ئەم ئاستەی ئێستات، ئاییندەت لە خەیاڵی خۆمدا بکێشم، یان سەرجەم بەرهەمەکانی ڕابوردووت

٦ Paul Ricoeur, Hermeneutics and the Human Sciences, Collected and translated by John B. Thompson, Cambridge University Press, ١٩٨١, p٤٢

بسرمەوە. یەکێکم لەوانەی پێیان وایە ئەو ڕووبەرەی لە زەمەن ماوە، گەورەترە لەوەی تێپەڕیوە. بەم شێوەیە هەر شتێک لەبارەی ئاییندەتەوە بڵێم، دەبێتە حوکم، کە ئەمە تەنیا لاوازیی فیکر و زمانی من دەردەخات. وەک گوتیشم هەوڵی یەکەمم بۆ ئەوەیە ئاستی زمانی ئەم دوو گوتارەی تۆ، بگرە ئاستی زمانی خۆیشم تێ بپەڕێنم.

(کریستۆفەر هیچنز) گوتەیەکی بەناوبانگی هەیە: (ئەوەی بەبێ بەڵگە بگوترێت، بەبێ بەڵگەیش دەدرێتە دواوە)([٧])، بەڵام من نامەوێت لە ئاستی ئەم گوتە سادەیەدا بمێنمەوە، بەڵکوو دەبێت تێی بپەڕێنم، بەوەی لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو شتانە بەبێ بەڵگە گوتراون و بە ئاسانی دەدرێنە دواوە، بەڵام بە ئاڕاستەیەکی تریاندا دەبەم و لاکەی تریان دەردەخەم، کە لایەنە سەختەکەیە، ئەو لایەنەیە، کە ئەگەر خۆتت لێ دا، ئەوا بەسەرتدا دەسەپێت لەسەر هەر چەمکێکدا بوەستیت و قووڵی بکەیتەوە، بەو مەبەستەی لەو ئاستە میللییەی دوور بخەیتەوە و بیخەیتە ئاستێکی ترەوە، کە لەوێ شوێنێک بۆ حوکم و بڕیار نەمێنێتەوە.

---

[٧] Christopher Hitchens

https://en.wikipedia.org/wiki/Christopher_Hitchens

بە بڕوای من ڕەخنە پرۆسەسی نزیکبوونەوەیە لەو ئۆبجێکتەی دەیەوێت دژایەتییەکانی ئاشکرا بکات و تێی بپەڕێنێت، بەو مانایەی شتەکان لە بار یەکتر ببات و ئەو ئێلەمێنتانە دەربخات، کە بوونەتە هۆی یەکگرتنیان، بۆیە ئاراستەیەکی فیکری و ئێستاتیکییە لە ئێستاوە بۆ ڕابوردوو، بەوەی خودی ئەو ئۆبجێکتە لە ڕابوردووە. بە مانایەکی تر کاتێ یەکێ ڕەخنە لە کارێکی من دەگرێت، ئەوە کارەکە کراوە و سیماکانی دەرکەوتوون. واتە بووەتە ڕابوردوو. هەر کاتێ ڕەخنە توانای ئەوەی نییە لە ڕابوردووەوە بە هێزێکی گەورەتر لەوەی دەستی پێ کردووە، بۆ دۆخی ئێستا بگەڕێتەوە، بگرە ئەگەر نەتوانێت ئاسۆیەکی فراوان لە بەردەم ئاییندەدا بکاتەوە، ئەوا ئەو ڕەخنەیە هەر لە بنەڕەتەوە وەک ڕەخنە دروست نەبووە. بەم شێوەیە ڕەخنە، دروستتر ڕاڤە خاوەنی ئەو هێزەیە، کە دەتوانێت وا بکات زەمەنی تێکست تەنیا هیی ڕابوردوو نەبێت، بەڵکوو لە هەموو ڕەهەندە جیاوازەکاندا دەربکەوێت. هەر ئەمەیشە دەیخاتە دۆخی بەردەوامییەوە. ئەگەر بمەوێت مێژووی ڕەخنە لە (نیتشە)وە تاکوو ئەمڕۆ بە دوو دێڕ پێناسە بکەم، ئەوە دەڵێم: (بریتییە لە کردنەوەی داخراوەکان، بەو مەبەستەی پایەکانیان تێک بشکێن و ئاراستەی تر وەربگرن). بە درێژاییی ئەم نووسینەم لەسەر ئەم داخران و کرانەوەییە دەوەستم و لای فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزاندا پێشانی دەدەم.(٨)

---

٨ وشەی (ڕەخنەدۆز) بە کار دەهێنم، چونکە پێم وایە لە وشەی (ڕەخنەگر) دروستترە، لە

ئێستا ئەمە لە بەرچاو دەگرم، بۆیە بەو ئاڕاستەیە کار دەکەم، کە بە هیچ شێوەیەک خودی تۆ نەسڕمەوە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە لە ڕێگەی ڕەخنەی توند لە بۆچوونەکانتەوە، دەمەوێت تۆ وەک کەسێکی بیرکەرەوە، کە نەک هەر هەقی قسەت هەبێت، بەڵکوو بە توانایەکی ترەوە بێیتەوە دەنگ.

ڕەخنەگری میللی دوای ئەوەی پەلاماری داهێنەرێک دەدات، لێرە و لەوێ خۆی دەنوێنێت و دەڵێت چاک دەمکوتم کرد. نەیتوانی یەک شت بڵێت. خوێنەرە ساکارەکانیشی هێندەی تر هانی دەدەن و زیاتری بۆ دەخەنە سەر، کە هەر ئەوانەن سیاسەتمەدارەکانیش بۆ پەلامار هان دەدەن، بەڵام من بە پێچەوانەوە هەمیشە ویستوومە دەمی ئەوانە زیاتر بکەمەوە، کە هەتا ئەگەر بە پێوەری (چوخ) ([9])، واتە بە پێوەری سڕینەوەیش لە خۆم و بەرهەمەکانم نزیک بووبێتنەوە، بەوەی پێم وایە ئەوەی دەیەوێت زمان لە یەکێکی تر بستێنێتەوە، ئەوا پێشتر لە خۆیی دەستێنێتەوە، چونکە وەک دواتر دەیبینین من کاتێک زمانم هەیە، کە ئەوەی بەرانبەرم هەیەتی. بەم شێوەیە

---

کاتێکدا وشەی ڕەخنەگر لە مێژووی نووسینی ئێمەدا بووەتە هاوواتای پەلاماردان و سڕینەوە. ڕستەی (ڕەخنە دەگرێت) و (گاز دەگرێت) یەک کۆنتێکستیان هەیە.

[9] (چوخ) کورتکراوەی (چاکە و خراپە)یە، کە ڕەخنەگری میللی لە خەڵکی وەرگرتووە و بۆ هەڵسەنگاندنی کاری ئەدەبی و هونەری بە کاری دەهێنێت. پێشتر لەسەریدا وەستاوم و دەرمخستووە، کە چەند پێوەرێکی هەژارە و لەم نووسینەیشدا زیاتر پێ لەسەر لاوازییەکەی دادەگرم.

ڕووبەری زمانی من بەندە بەوەی، تا چ ئەندازەیەک هەوڵی ئەوە دەدەم بەرانبەرەکەم ئازادیی لە دەربڕیندا هەبێت.

ئەوەیش دەڵێم، پێم خۆشە پرۆژەی کارەکە بەو شێوەیە بێت، کە ئەوەی گوتراوە، ڕاستە هیی تۆیە، بەڵام با وای دابنێین گوتراوێکە و دەمانەوێت تێی بپەڕێنین. واتە با لەوە دووری بخەینەوە، کە ئەمە ململانێیەکی کەسییە، بەڵکوو دەرفەتێکە بۆ کردنی قسەی تری جیاواز، هەم لای تۆ و هەم لای منیشدا. وا ڕێک کەوتووە ئێستا نۆرەی من بێت، بەڵام کاتێ نۆرەی تۆ هاتەوە، ئەوا بە خۆشحاڵییەوە هەر وشەیەکت دەخوێنمەوە و بایەخی پێ دەدەم، کە بۆمی دەنووسیت. وەک پرینسیپی خۆیشم پێش ئەوەی بڵاوی بکەمەوە، بۆ ئازیزتانی دەنێرم، بەو مەبەستەی ئەگەر پێت وایە هەر وشەیەک، هەر ڕستەیەک، هەر پەرەگرافێک بە زمانی توندوتیژ دەربڕاوە و بۆ خودی خۆت، نەوەک بۆ زمانی نووسینت ئاڕاستەیە، ئەوا ئاگادارم بکەیتەوە، تاکوو سەرەتا داوای لێبوردن بکەم، ئینجا لای ببەم، بێگومان کاتێ بزانم بە ڕاستی وایە. خۆ ئەگەر لە بۆچوونێکدا کورتم هێنابێت لەبارەی چەمکێکەوە، کە تۆ بە کارت هێناوە، ئەوا دیسان ئامادەم پێیدا بچمەوە و بە شێوەی تر دایبڕێژمەوە. پێویستە بە بیرت بهێنمەوە، کە پێشتریش هەر نووسەرێ لەبارەمەوە نووسیبێتی و ویستبێ بە پرسیار ڕووبەڕووی

ببمەوە، واتە گفتوگۆی لەگەڵ بکەم، ئەوا پێش بڵاوکردنەوە، نووسینەکەی خۆمم بۆ ناردووە.

با ئەوەی لە ئەنجامدا پێی دەگەین، وا سەیری بکەین بەرهەمی هاوبەشی هەردووکمانە، کە ڕەنگە ئەمە ئەزموونێکی نوێیش بێت. من هیوادارم لە ڕێگەی دایەلۆگەوە بگەینە ئەوەی کتێبەکە ناوی هەردووکمانی بەسەرەوە بێت. با وای دابنێین ئەوەی تۆ بازنەی یەکەمە و ئەمەی من دەبێتە بازنەی دووەم، بەو مەبەستەی ئەوەی تۆیش لەبارەی ئەمەی منەوە دەینووسیت، ببێتە بازنەی سێیەم و بەم شێوەیە درێژە بە بازنەکان دەدەین. با لە ئاستی ئەوەی گوتراوە، بێبەزەییانە ڕەخنە بگرین، بێ ئەوەی وای سەیر بکەین کارێکی کەسییە. مەگەر ئێمە نیین ناوی دەیان فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزی گەورەی دنیامان هێناون، کە هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن ژیانی نووسەر و بەرهەمەکانی، دوو شتی جیاوازن؟ واتە دەکرێت ڕەخنە لە هەر بەرهەمێک بگرین، بێ ئەوەی وشەیەک بە نووسەرەکەی بڵێین. (دەزانم ئەمە ئەلفوبێیە، بەڵام بەداخەوە هەتا ئەمڕۆیش لە دنیای کوردیدا تێ نەپەڕێنراوە، بۆیە دەبێت زووزوو بیڵێینەوە).

# مێتۆدی ئەم بەرهەمە

لەو دەروازەیەدا کەموزۆر هۆکار و ئامانجی ئەم نووسینە ئاشکرا کرا، بەڵام لێرەدا بە پێویستی دەزانم چەند خاڵێک، یان چەند تەوەرەیەک بخەمە ڕوو، کە بەشداری لە پێکهێنانیدا دەکەن:

یەکەم: دەمەوێت ئەم نووسینەم لە شێوەی بایۆگرافیادا بنووسم، بەو مانایەی تا بکرێت ئەو وردەکارییانە، هەتا ئەگەر لای خوێنەری چاوکراوە و پرسیارکەر زۆریش گرنگ نەبن؛ دەربخەم، کە پێوەندییان بەو بابەتەوە هەیە، بەوەی ئەو بابەتەیش بە ماوەیەکی دیاریکراوی ژیانی منەوە بەندە. بە مانایەکی تر هەر کاتێ لەسەر چەمکێک دەوەستم، ئەوا بوارەکانی وەک فەلسەفە، ئەدەب، زمان، مێژوو، سۆسیۆلۆجیا، سایکۆلۆجیا و ئەوانەی تری بۆ دەگەڕێم و لەوێوە قسەی لەبارەوە دەکەم، بەڵام کاتێ نووسینەکەم دەچێتە دەرەوەی

چەمکەکان و دەیەوێت ڕاستەوخۆ باس لەو شتانە بکات، کە دراونەتە پاڵم، ئەوا ئاستی زمانەکەم بە ناچاری بۆ ئاستی کۆمەڵایەتی دادەبەزێت و لە زمانی ڕۆژانە نزیک دەکەوێتەوە، چونکە دەبێت لەوێوە لێوەی بدوێم. نموونە لە ژیانی تایبەتی خۆم بۆ فاکتەکان دەهێنمەوە و گەلێجاریش پشت بە نوکتە دەبەستم. هێندە هەیە زیاتر لەسەر ئەوەی یەکەمیان دەوەستم. ڕەنگە دوایی زیاتر مەبەستەکەم ڕوون ببێتەوە.

جارێکی تر ئەوە بە بیر خوێنەر دەهێنمەوە، کە من هەر شارەزاییەکم لەو بوارانەدا هەبێت، ئەوە هیی نووسەرێکی ئەدەبی گێڕانەوەیە، دەنا ڕەخنە و لێکۆڵینەوەم هەرگیز بە کاری خۆم نەزانیوە. دەتوانم بڵێم خوێنەرێکی باش و بەردەوامی فەلسەفە و بوارەکانی ترم، بەڵام ڕەخنەم نەکردووەتە کاری خۆم، لانی کەم نەمکردووەتە کاری سەرەکیم. هەمیشە گوتوومە ئەدەبی گێڕانەوە بۆ من شوێنی هەموو شتێکی تێدا دەبێتەوە. دەتوانم لەوێ باس لە فەلسەفە، مێژوو، هونەر، جیۆگرافیا، سیۆسیۆلۆجیا و بوارەکانی تر بکەم، بۆیە ئەو ئارەزووەم نەبووە خەریکی کاری تر بم، مەگەر هەندێجار پێویستی کردبێت. هەموو ئەو جارانەیش پەنام بۆ دایەلۆگ بردووە، تەنانەت (دایەلۆگ) بووەتە ناونیشانیان. (میلان کۆندێرا) دنیای تیۆرییەکان بە هیی خۆی نازانێت، بۆیە لە دەروازەی کتێبی (هونەری ڕۆمان)دا نووسیویەتی:

(کۆبەرهەمی هەر ڕۆماننووسێک دیدگەی ناوەوەی لەبارەی مێژووی ڕۆمان و ناوەرۆکەکەی لە خۆی دەگرێت).([10])

واتە ئەو ڕۆمانانە بۆچوونی ئەو دەردەخەن لە کوێوە و چۆن لە دنیا دەڕوانێت، کە لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا بە وردی باس لەوە دەکات مێژووی ڕۆمان و مێژووی فەلسەفە چۆن یەکتر تەواو دەکەن.

دووەم: لەم نووسینەمدا چەمکی (ڕەخنەگری میللی) بە کار دەهێنم، کە پێشتریش لە چەند بەرهەمێکی ترمدا هەیە. هەروەها (ڕەخنەگری ویژدانی)یشم هەر وەک هاوواتای ئەو بە کار بردووە، کە مانای وایە ئەو ڕەخنەگرە ویژدانی دەکاتە پێوەر بۆ ئەوەی چی چاکە و چی خراپ. ئەمەیش داگرتنی فیکری ڕەخنەییە بۆ زمانی ڕۆژانە، بۆ زمانێک، کە هەر کەسێکی تری ناو کۆمەڵگە دەتوانێت پێی بنووسێت. بەهەرحاڵ من کاتێ دەڵێم ڕەخنەگری میللی، مەبەستم ئەوە نییە فیکری میللی وەک بابەت ڕەت بکەمەوە، بەڵکوو کاتێ ئەو فیکرە میللییە دەبێتە بکەر و خۆی مەبەستیەتی (ئەوەی تر) بکاتە بابەت، (بابەتێک بۆ سڕینەوە)، بەو مانایەی دەیەوێت ببێتە پێوەر بۆ چاکی و خراپیی تێکست، بگرە بۆ خودی نووسەرەکەیشی، ئەوا من بە پرسیار ڕووبەڕووی دەبمەوە و

---

[10] میلان کونديرا، فن الرواية، ترجمة: خالد بلقاسم، المركز الثقافي العربي، المغرب، ٢٠١٧، مدخل الكتاب.

هەوڵ دەدەم بۆ ئاستی خۆیی بگەڕێنمەوە. واتە دەمەوێت جەخت لەوە بکەمەوە، کە فیکری میللی ئۆبجێکتێکە بۆ قسەلێوەکردن، نەوەک سەبگێکتێک بێت، قسە لە شتەوە بکات. بە هیچ شێوەیەک مەبەستیشم دیاریکردنی سنووری ئەو چەمکە نییە و نامەوێت بڵێم خاوەنی یاسا و ڕێسای تایبەتە، بەڵکوو چەمکێکی کراوەیە و دەکرێت لە زۆر ئاستی تردا سەرنجی لێ بدرێت. پێشتریش لە ئاستی زمانەوانیدا لێوەی دواوم.([11])

لێرەدا هەر جارێ دەڵێم (ڕەخنەگری میللی) مەبەستم لەو جۆرە ڕەخنەگرەیە، کە دەستی بە کەلتووری میللییەوە گرتووە و لەوێوە هەر فیکرێک بە خراپ دەزانێت، کاتێ لەگەڵ ئەو تێگەیشتنە ساکارەیدا نایەتەوە. بەکورتی هەموو ئەو شتانەی ڕەخنەگری میللی لەبارەی بەرهەمی نووسەرانەوە دەیانڵێت، لە دەمی خەڵکەوە بیستوونی و بە هەمان زمانی ئەوانیش دەیاننووسێتەوە، بەڵام بۆ ئەوەی خوێنەری ساکار فریو بدات، گوتەی فیلۆسۆفانی دنیا لەو نووسراوانە وەردەگرێت، کە (قسەی ناوداران)یان تێدا ڕیز کراون و بە زۆر دەیانئاخنێتە ناو گوتارەکانیەوە، بۆیە کاتێ لەبارەی فیکری ئەو فیلۆسۆفانەوە پرسیاری لێ دەکەیت، خۆی لە گفتوگۆ دەدزێتەوە، یان دەچێت هەر بەو زمانە ساکارەی تۆپەڵێک

[11] http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٠/٣/karwan_bakhtyar.htm

جوێن دەدات و خۆی دەشارێتەوە. وەک سەرنجێکی بچووکیش: هەر جارێ بە گشتی باسی ڕەخنەگری میللی دەکەم، ئەوە مەرج نییە هەموو ئەو خەسڵەتانە لە تۆدا هەبن، بۆیە پێویستە بزانیت تەنیا ئەو کاتانە لەگەڵ تۆمە، کە ڕووم لێتە. مەبەستیشم لەم دوو گوتارەتە، کە بە زمانی ڕەخنەگرێکی میللی نووسراون، دەنا هەموو بەرهەمەکانت ناگرێتەوە.

بەگشتی پێ لەسەر بێئاگاییی ئەو ڕەخنەگرە دادەگرم لە بوارەکانی بیرکردنەوەدا، کە ئەمە وای کردووە هەموو چەمکێک بهێنێتە ئاستی میللییەوە، واتە بیهێنێتە ئاستی تێگەیشتنی خەڵکەوە، بەو مەبەستەی پرۆسەسی فیکر ئاسان بکاتەوە و بە زمانی ڕۆژانە، ئەو زمانەی لە نێوەندە سۆسیۆلۆجییەکانی وەک کۆڵان، بازاڕ، ماڵ و گەڕەکدا باوە، لەبارەی چەمکە فەلسەفییەکانەوە بدوێت، دروستتر بڕیاریان لەسەر بدات، کە جاری وا هەیە ئەو بڕیارە تەنیا دوو سێ وشەی سادەی تێ دەچێت.([12])

---

[12] [12] لێرە و لە هەر شوێنێکی تریشدا، کاتێ ناوی نێوەندە سۆسیۆلۆجییەکانی وەک کۆڵان، گەڕەک، بازاڕ و هیی تر دێنم، بە هیچ شێوەیەک نامەوێت نرخیان کەم بکەمەوە، کە خۆم لەناویاندا چاوم کردووەتەوە و تێیاندا گەورە بووم، بگرە لە بەرهەمەکانمدا بایەخی گەورەم پێ داون. باوەڕم بە دابەشکردنی شوێنی بەرز و شوێنی نزم نییە، بەڵکوو تەنیا مەبەستمە بڵێم لە کاتێکدا کاری نووسین تێپەڕاندنی زمانی ڕۆژانەیە، کە دواتر لێوەی دەدوێم و پێشتریش هەر لێوەی دواوم، ئەوا ئەو ڕەخنەگرە میللییە، نەک ئەو زمانە تێ ناپەڕێنێت، بەڵکوو بەوەدا ئاسانە، بەردەوام پەنای بۆ دەبات.

هەروەها لە نووسینەکانی پێشوومدا (ڕەخنەگری دیمۆتیک)یشم بە کار هێناوە، کە هەمان مانای هەیە. لە کاتی خۆیدا خەسڵەتەکانی ئەو (ڕەخنەگرە میللی)یە بە شێوەی پراکتیکەڵ ئاشکرا دەکەم، پێشتریش بە شێوەیەک لە شێوەکان وام کردووە، بەڵام هێندە دەڵێم ئەوەی ڕەخنەگری میللی بە زمانی ڕۆژانە یەکلای دەکاتەوە و بڕیاری کۆتاییی بە چاک، یان بە خراپ لەسەر دەدات، لە بواری فەلسەفەدا بە شێوەیەکی تری تەواو جیاوازە. هەر یەک لەو چەمکانە بووەتە هۆی ئەوەی هەر فیلۆسۆفێک ژیانی خۆی بۆ تەرخان بکات، بێ ئەوەی گەیشتبێتە خاڵێکی دیاریکراو. ئەوەی لەو نێوەدا دەمێنێتەوە، ئەو هەوڵەیە، کە هەر یەکەیان داویەتی. ئێمە ناتوانین هیچ شتێک لەسەر ئەو بڕیارانەی ڕەخنەگری میللی دابمەزرێنین، مادام نە ماندووبوونیان پێوە دیارە و نە گرتنی ئاڕاستەی تر لەو چەمکانە، بەڵکوو وەک گوترا هەر ئەو گوتانەن، پێشتر، بەر لەوەی بێینە ناو دنیای نووسین و ڕەخنەوە، لە دەمی خەڵکی خۆمانمان بیستوون. نەنک و باپیرانمان زۆریان لەو بارەیەوە گوتووە.[١٢]

---

[١٢] ئێستا و دواتریش هەر جارێ ناوی نەنک و باپیران دێن، مەبەست لە سڕینەوەی بۆچوونی ئەوانە نییە، کە لە بواری ئەدەبی گێڕانەوەدا بایەخی گەورەیان هەیە، بەڵکوو مەبەست لەوەیە ڕەخنەگری میللی گوتە و تێگەیشتنی ئەوان وەک خۆیان بە ناوی ڕەخنەوە بە کار دەهێنێتەوە، تەنانەت لەو کاتەی نێوی فیلۆسۆفە گەورەکان دەهێنێت و چەمکەکانیشیان فڕێ دەدات. واتە لەو داپیرە و باپیرانە تێ ناپەڕێنێت. دەکرێت ناو لەو پرۆسێسە بنێین ریسایکلینگ (Recycling)، بەڵام ریسایکلینگێکی سەیر. ڕاستییەکەی

من خۆم وەک گوتم بۆ ڕووبەڕووبوونەی ئەم جۆرە ڕەخنەیە میتۆدی (پرسیار و وردکردنەوە)م گرتووەتە بەر. واتە لەبارەی ئەو چەمکانەی فڕێ دراون، هەم پرسیارم کردووە و هەم چەند شتێکم نووسیون. بە مانایەکی تر، ویستوومە لە ڕێگەی دایەلۆگەوە ئەو تێگەیشتنە چەسپاوە ببزوێنم و بیخەمە ئاستێکی ترەوە. ئێمە بمانەوێت و نەمانەوێت ئەمڕۆ ئەو جۆرە ڕەخنەیە بووەتە واقیعێکی دیاری کەلتووری نووسینمان، بۆیە پێم وایە تەنیا بە هۆی دایەلۆگەوە دەتوانین ڕووبەڕووی ببینەوە. هەتا ئەگەر خودی ڕەخنەگرەکەیش نەیەوێت بێتە ناو دایەلۆگەکەوە، ئەوا ئەو پرۆسەسە هەر بە ڕێوە دەچێت، مادام هاوکات خوێنەرێکی گریمانی تێیدا ئامادەیە.

سێیەم: بۆچوونی هەر نووسەر و فیلۆسۆفێک وەربگرم، جگە لەوەی تێگەیشتنی خۆم لەبارەی بۆچوونەکەوە دەڵێم، سەرچاوەکەیش دەستنیشان دەکەم، تەنانەت لاپەڕەی کتێبەکە، یان هیی گۆڤار و ماڵپەڕەکەیش دەنووسم، بەو مەبەستەی بە

---

ریسایکلینگ بریتییە لە گۆڕینی ماتریالی کۆن و لەکەڵککەوتوو لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر، وەک ئەوەی سەبەتەی پلاستیک دەتوێنرێتەوە و کەلوپەلی دیکەی لێ دروست دەکرێت. ڕەنگە وشەی (بەکارهێنانەوە) تا ڕادەیەک بۆی گونجاو بێت. ئەگەر ئەو پرۆسەسە لە کیمیادا جۆرێک تراجیدیا لە خۆی بگرێت، ئەوا لە ڕەخنەی میللیدا بە هەموو مانایەک کۆمێدیایە، چونکە ئەو گوتە و تێگەیشتنانە هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا نایەت، بەڵکوو وەک خۆیان، بگرە هەندێجار لە ئاستی نزمتر لەوەی داپیرە و باپیران بە کاریان هێناون، بە کار دەهێنرێنەوە.

ئاسانی بۆی بگەڕێیتەوە و بزانیت ئاخۆ بە دروستی ئەو کارە کراوە. پێشتریش هەر وام کردووە، بەڵام ئەمجارەیان زیاتر.

من لەم نووسینەمدا بە دوای ئەم پرسیارانەدا دەگەڕێم، کە پێشتریش هەر وام کردووە، بەڵام ئەمجارەیان وەک گوترا ڕەگەزێکی گرنگیش لەم کارەدا بەشدارە، کە خوێنەرە، دروستتر خوێنەرێکی بیرکەرەوە و پرسیارکەرە، خوێنەرێکە فریو ناخوات و نایەوێت بە ئاسانی شتی بەسەردا تێ بپەڕێت.

بەوەدا هەر چەمکێک بگریت، لە فەلسەفەدا کاری زۆر و جیاوازی لەسەر کراوە، ئەوا ئەم تێگەیشتنە لە نووسینەکەی منیشدا ڕەنگ دەداتەوە. دەمەوێ بڵێم کاتێ بۆ نموونە لەسەر دەربڕینی لەم شێوەیەت دەوەستم: (پرسیار گرنگ نییە... پرسیار هێزی خۆی لە وەڵام وەردەگرێت... پرسیار هیی منداڵە، چونکە منداڵ پرسیار دەکات، تاکوو فێر ببێت)، ئەوا ناچارم بە وردی لەسەر چەمکی پرسیاردا هەڵوێستە بکەم، کە چەمکێکی زۆر سەختە و فەلسەفە هەر لە سەرەتاوە وەک پرۆبلەماتیکێکی گەورە ڕووبەڕووی بووەتەوە، بۆیە پێویستە بە پاڵپشتی ئەو ڕەخنەدۆز و فیلۆسۆفانە ئەوە دەربخەم، کە ئەوەی تۆ بە زمانی میللی دەرتبڕیوە و بە چوار پێنج وشەی ساکاری ڕۆژانە بڕیارت لەسەر داوە، لای ئەوان چ قورساییەکی هەیە. ڕەنگە بەشێکی زۆری خەڵکی دوور لە دنیای ئەدەب و فیکریش، نەوەک هەر خوێنەری بیرکەرەوە،

باوەڕ نەکەن ڕەخنەگرێک هەیە و دەڵێت پرسیار گرنگ نییە، بەڵام من باوەڕم کردووە و لام ڕوونە ئەمە گوتراوە، بەڵکوو دواتر پێشانی دەدەم شتی زۆر لەمە سەیرتریش لەو دوو گوتارەیدا، بگرە لە هەندێکی تریشیدا نووسراون، بۆیە لاکەی تری دەگرم. واتە بەو ئاڕاستەیەدا کار دەکەم، کە پرسیار گرنگە، بۆیە ئەرکی من ئاسان نییە و سەختە.

کەواتە با لە ئێستاوە ئەوە بزانین، کە مادام لایە سەختەکەم هەڵبژاردووە، ئەوا هەر یەکێ لەو چەمکانە پێویستی بە وردبوونەوەی زۆرە، بۆیە نووسینەکەم درێژ دەبێتەوە، دەنا خۆ دەمتوانی هەر بە هەمان مێتۆد بڵێم: چۆن پرسیار گرنگ نییە؟ زۆر گرنگە و چەندیش بڵێی گرنگە.

لە بیری ڕەخنەییدا ڕێگەی ئاسان نییە. تاکەڕێگە و تاکەلۆژیک لە خوێندنەوەی تێکستدا لای حزبی کوردی و ڕەخنەگری میللیدا بایەخدارن، کە هەردووکیان هەمان ڕوانینیان بۆ دنیا هەیە، دەنا لانی کەم لە (هایدیگەر)ەوە بە سەر چووە، تەنانەت ئەو نەک لەگەڵ (ڕێگە)دا نییە و (ڕێگەکان) هەڵدەبژێرێت، بگرە ئامادە نییە ناو لە بەرهەمەکانیشی بنێت (کارەکان)، ئەگەرچی ئەوەیشیان هەر کۆیە. (گادامێر) لە کتێبی (ڕێگەکانی هایدیگەر)دا ئەوە ڕوون دەکاتەوە، بۆچی ئەو فیلۆسۆفە دواجار، {کاتێ ویستوویەتی پێشەکییەک بۆ کۆبەرهەمی خۆی بنووسێت، ئەوەی کردووەتە درووشم، واتە (ڕێگەکان)، نەوەک

(کارەکان). ئەو ڕێگایانەی دەبێت ببڕێن، تاکوو مرۆڤ لە دوای خۆیاندا جێیان بهێڵێت و بەرەو پێشەوە بچێت، کە شتێکی چەسپاو نین، تێیاندا مرۆڤ ئاسوودە ببێت، یان بتوانێت لێیان پاڵ بداتەوە. زمانی (هایدیگەر) لە قۆناغە درەنگەکاندا تێکشکاندنی بەردەوامی دەستەواژە باوەکان و بارگاویکردنی وشەکانە بە هێزێکی نوێ و بنەڕەتی، کە دەبنە هۆی تەقاندنەوەی کۆمەڵێ سەرەتای تر. زمانەکەی شتێک دانامەزرێنێت، بۆیە هەموو دووبارەبوونەوەیەکی ڕەیچوەڵی (التكرار الطقوسي) لە شێوازی (هایدیگەر)دا، کە ئەو کارە زۆربەی کات لای پێڕۆییکەرانیدا هەیە، بە هیچ شێوەیەک گونجاو نییە. بەهەرحاڵ مرۆڤ ناتوانێت هەر کاتێ بیەوێت، ئەو زمانە بگۆڕێت، کە هەر لە بنەڕەتەوە وەک شیعری لیریک وایە و وەرناگێڕدرێت}.([14])

لێرەدا (گادامێر) لەگەڵ ئەو فیلۆسۆفانەیەتی دەیانەوێت ڕێچکەی (هایدگەر) بگرن، کە پێی وایە سەختە و گونجاو نییە، تەنانەت وەرگێڕانی بۆچوونەکانی بۆ زمانی تر دژوارە. ئاخۆ ئێمە چی بە ڕەخنەگرە میللییەکانی خۆمان بڵێین، کە تەنیا هەندێک گوتەیان لە دەستی حەوتەمەوە وەرگرتووە و وا دەزانن ئەو فیلۆسۆفەیان ناسیوە، بگرە ڕێگە بە خۆیان دەدەن

---

[14] هانز جورج غادامير، طرق هيدغر، ترجمة: د. حسن ناظم وعلي حاكم صالح، دار الكتاب الجديد المتحدة، الطبعة الاولى، ٢٠٠٧، ص٢٨٧

لەوێوە پەلاماری هەر تێکستێک، بگرە پەلاماری هەر نووسەرێک بدەن؟

دەمەوێت جارێکی تر جەخت لەوە بکەمەوە، کە ناسینی منیش بۆ ئەو فیلۆسۆفە و هەموو ئەوانەی تر، تەنیا لە ڕوانگەی نووسەرێکی ئەدەبی گێڕانەوەوەیە، کە هێشتا تێگەیشتنم بۆیان لە سنوورێکی دیاریکراودایە. هێندە هەیە هەوڵی گەورەم داوە و دەیدەم ئەو کۆنتاکتەی لەگەڵیاندا هەمە، بە هیچ شێوەیەک لە دەستی نەدەم، کە ئەم کارەی بەردەستیشم، ئەم دایەلۆگەم لەگەڵ تۆدا، بەشێکە لە جەختکردنەوەم لەو پێوەندییە بەردەوامەدا.

چوارەم: جگە لە ناوی تۆی ئازیز، ناوی هیچ نووسەرێکی تری کوردم نەهێناوە، کە ئەمەیش تەنیا پێوەندیی بەوەوە هەیە وازم هێناوە و دەمەوێت بڵێم تەنیا بە مەبەستی ئەم دایەلۆگە لەگەڵ تۆدا گەڕاومەتەوە، دەنا باری دەروونیم وا دەخوازێت لە دنیای بڵاوکردنەوەی کوردی دوور بم. لەو ڕۆژەوە وازم هێناوە، بەرهەمی یەک نووسەری کوردم نەخوێندووەتەوە، بگرە هەر سایتێکی کوردییشم نەکردووەتەوە. بێگومان لەبەر ئەوە نا، نووسەری کورد توانای داهێنانی نییە، بەڵکوو هەر لەبەر ئەوەی ناوەوەم وای ویستووە. نووسینەکەی تۆیش لەبارەی ئەو شاعیرەوە، هاوڕێیەک، کە پێشتر ئاماژەم پێ کرد، لە تەلەفۆن بۆی خوێندوومەتەوە. هیوادارم ئەو نووسەرە خۆی

لەم بارەیەوە بێتە دەنگ، کە تەنیا بە مەبەستی دایەلۆگ ئەو کارەی کردووە. دەبێت ئەوەیش بڵێم، کاتێ ویستوومە ئاماژە بە بەرهەمێکی خۆم بکەم، کە لەو ماڵپەڕانەدا بڵاو کراونەتەوە، زۆر بە زەحمەت توانیومە ئەوە بکەم.

پێنجەم: وا ڕاهاتووم هەمیشە بەرهەمەکانم پێش بڵاوکردنەوە بۆ چەند هاوڕێیەکم بنێرم، کە تاکوو ئەم ساتەیش بۆچوونیانم لا گرنگە، بەڵام ئەمجارە نەک هەر بۆ کەسم نەناردووە، بەڵکوو کەسیان نازانن کارێکی وام بە دەستەوەیە. ڕاستییەکەیشی لەوەتەی ئەو ڕاگەیاندنەم بڵاو کردووەتەوە، ئاگام لە زۆربەی هاوڕێ نزیکەکانیشم نییە، بێ ئەوەی ناخۆشیم لەگەڵ هیچ یەکێکیاندا هەبێت.

شەشەم: نامەوێ ئەم نووسینە وا لێک بدرێتەوە، کە گەڕاومەتەوە، بەڵکوو وەک گوتم هێشتا لەسەر وازهێنانەکەم بەردەوامم، بۆیە ناونیشانی (گەڕانەوەیەکی کاتی بۆ دایەلۆگێکی بەردەوام)ی هەیە. هەر کاتێکیش ناوەوەم داوام لێ بکات بە یەکجاری بگەڕێمەوە، ئەوە دەگەڕێمەوە، چونکە من سەر بەو کەلتوورە نیم، کە پێی وایە بڕیار دەستکاری ناکرێت، بەڵام ئێستا هیچ ئارەزوویەکی وام نییە. مادام وازهێنان و گەڕانەوەم تەنیا پێوەندییان بە ئازادیی خۆمەوە هەیە، نەوەک بە هیی کەسێکی تری دەرەوەی خۆم، ئەوا هەر کاتێ بمەوێت، واز دەهێنم و هەر کاتێکیش بمەوێت، دەگەڕێمەوە. جەنگاوەر

نیم، تا دوا گولله بجەنگم. شەڕی من جیاوازە. ئەو جەنگاوەرە باوەڕێکی ستوونیی هەیە و تاقە ئامانجێکی دیاری کردووە، کە یان پێی دەگات، یان ئاواتەکەی دەباتە ژێر گڵ، بۆیە لەپێناوی گەیشتن بەو خاڵە دیاریکراوەدا هەموو هەوڵێک دەدات، بەڵام من هەر لە بنەڕەتەوە باوەڕم بە کۆتایی نییە. لانی کەم باوەڕم بە بوونی یەک کۆتایی نییە، بەڵکوو بێژمار ئاڕاستە دەبینم. مەگەر لە بەرهەمەکانیشمدا هەر وام نەکردووە، کە ئەمە هۆکاری سەرەکییە لەوەی ڕەخنەگری میللی لێیان تێناگات.

لە گوتاری یەکەمیشتدا بە کاڵی وات دەرخستووە، کە ڕووخاوم. ڕاستییەکەی ئەوە لای من گرنگ نییە. تێگەیشتنێکی جیاوازم بۆ ئەو چەمکە مۆراڵییانە هەیە، کە جەماوەر بە کاریان دەهێنێت و حەزیان لێ دەکات. لەو کاتەی ئایینی کریستیەن دەیەوێت مرۆڤ نکوولّی لە خودی خۆی بکات و بە گرنگی نەزانێت، (نیتشە) ئەمە وەک بەهایەکی پووچ دەبینێت، بگرە ئەوەی پێی دەگوترێت، خۆپەرستی، لای ئەو چاکەیە. (بەزەیی) ناوەرۆکی کریستیەنە، بەڵام لای ئەو فیلۆسۆفەدا بەهایەکی زۆر بێکەڵکە. پێی وایە {(ئالتریسم: الغيرانية) و (خودنکوولّی: نكران الذات) نیشانەی زەقی داڕمانن}.(١٥)

---

[١٥] فريدريش نيتشه، هذا هو الإنسان، عن الألمانية: علي مصباح، منشورات الجمل، المانيا، ٢٠٠٣، ص١٦٤

ئەوە هەر بڕوادارانی ئایدیۆلۆجیای ئایین و سیاسەتن خەون بەوەوە دەبینن لە ڕێگەی چەمکە زەقەکانی مۆرالیتییەوە بگەنە جەماوەرێکی زۆر، بەوەی ئاسانن و لێیان تێدەگەن، گوایە دەیانەوێت لەو ڕێگەیەوە بیانگۆڕن. ئەمە خەونی زۆر نووسەری میللییشە، بەڵام هیی من نییە و نامەوێت ببمە خاوەنی جەماوەر و گۆڕینی کەسیش بە ئامانجی خۆم نازانم، چونکە تەنیا بیرکردنەوە لە گۆڕینی ئەوانەی تر، بە ئاسانی دەتباتەوە ناو ئایدیۆلۆجیا. دەتباتەوە ناو دنیای ڕەهای چاکە و خراپە. کاتێ مەبەستتە کەسێک، یان جەماوەرێک بگۆڕیت، ئەوە سێ شتت دیاری کردووە و ناتەوێت بە هیچ شێوەیەک لێیان دەربچیت:

یەکەم، ئەوەی دەیگۆڕیت. دووەم، ئەوەی پێی دەگۆڕیت و سێیەم، ئەوەی دەیکەیتە سەرچاوەی ئەو گۆڕینەت. یەکەمیان جەماوەرە، دووەمیان ئەو پەیامەیە هەڵتگرتووە و سێیەم ئەو ئایدیۆلۆجییەیە باوەڕت پێیەتی. مانای وایە قاڵبێکی دیاریکراوت هەیە و ئەرکەکەت تەنیا بەکارهێنانی ئەو قاڵبەیە. (نیتشە) دەڵێت: (گۆڕینی مرۆڤایەتی، دوایین شتە، بە خەیاڵمدا دێت. وەک چۆن من بتی نوێ دروست ناکەم).([١٦])

---

[١٦] هەمان سەرچاوە، ل٨

ئەوەی ئێستا دەتوانم بیڵێم، هەر ئەوەیە، کە ئامادەم بە خۆشحاڵییەوە درێژە بەو دایەلۆگە بدەم لەگەڵ تۆدا، ئینجا گرنگ نییە ماوەی چەند دەخایەنێت.

حەوتەم: بۆیە لە شێوەی نامەدا نووسیومە، چونکە باوەڕم وایە دایەلۆگی ڕاستەقینە کاتێ پێک دێت، کە ڕاستەوخۆ ڕووت لەو کەسەیە، وا گفتوگۆی لەگەڵ دەکەیت. ئەمە مانای وایە ئەگەر ئەو بەهایەی بۆت داناوە، لە هیی خۆت بەرزتر نەبێت، کەمتر نییە. دەیڵێمەوە، تۆ هەمان ئەو بەهایەی منت لەم دایەلۆگەدا هەیە. دواتریش ئەمە بەتایبەت لای (گادامێر)ی فیلۆسۆفدا دەبینین، کە بەوەدا باسەکە پێوەندیی بە کرانەوە، دایەلۆگ، فرەدەنگی و فرەلۆژیکییەوە هەیە، ئەوا ئەو فیلۆسۆفەی لەپاڵ (هایدیگەر) و زۆری تردا ژیانی خۆیی بۆ ئەمانە تەرخان کردووە، ئامادەیی بەردەوامی لەم نووسینەدا دەبێت. نووسین لە شێوەی نامەدا ئازادیم زیاتر دەداتێ، بەوەی ناهێڵێت زۆر پێبەندی ئەکادیمییەت بم، بەڵکوو تا ڕادەیەک ڕووارییانە (ڕاندەملی: عەفەوییانە) دەینووسم وەک ئەوەی ڕووم لە هاوڕێیەکم بێت، کە بێگومان تۆم وەک هاوڕێ لا پەسەندە. هیچ کاتێ ڕەخنە و پرسیاری دڵڕەق ناتوانن ئەو هاوڕێیەتییەم لە بیر ببەنەوە. وەک گوتیشم ئەمانە تەنیا پێوەندییان بەو دوو گوتارەتەوە هەن و ڕێگە بە خۆم نادەم سەرجەمی بەرهەمەکانت بەم شێوەیە ببینم.

هەشتەم: سروشتی بابەتەکە وای کردووە هەندێک ڕستە، پرسیار، زاراوە و شتی دیکە زیاتر لە جارێک بگوترێنەوە، بەڵام بەپێی کۆنتێکستەکانیان مانایان دەگۆڕێت. واتە لە کات و شوێنی جیاوازدا دەردەکەونەوە و لە ڕوانگەی جیاوازیشەوە سەرنجیان لێ دەدرێت. بۆ نموونە سێ تاکوو چوار جار پێ لەسەر ئەوە داگیراوە، کە گرنگە لە ڕێگەی دایەلۆگەوە ئەم باسە تێ بپەڕێنین. ڕەنگە وا بێنە بەرچاو پێویست نین، بەڵام بایەخی شتەکە سەپاندوونی و نەکراوە ڕێگەیان لێ بگرم.

# هەستی من لە ئاستی

# ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا

پێویستە لە دڵەوە سوپاست بکەم، کە بەم دوو گوتارەت منت بۆ ئەم دایەلۆگە ڕاکێشا. لەو ڕێگەیەوە زۆر سەرچاوەی نوێی مەعریفەم ناسی، تەنانەت بە شێوەیەکی دیکە بۆ ئەوانەیش گەڕامەوە، کە پێشتر دەمناسین. بە مانایەکی تر بۆ ئەوەی ئەم زمانە میللییە و ئەو تێگەیشتنە ساکارەی ئەم دوو گوتارەت تێ بپەڕێنم، هەوڵم دا لە ئاستێکی تردا بنووسم، بۆیە لەو گەڕانەمدا بەر زۆر چەمک و کۆنسێپتی نوێ کەوتم. بەکورتی وەرزشێکی گەورەی هەم فیکری و هەم دەروونی بوو. ئەمە یەکێکە لە لایەنە گەشەکانی ئەم بەریەککەوتنەم لەگەڵ تۆدا. کاتێکیش دەڵێم سوپاس، بە ڕاستمە. هەموو ئەوانەی دەمناسن، ئەوە دەزانن لە گفتوگۆی ڕۆژانەمدا باوەڕم بە ئیرۆنیک نییە. واتە هەستی خۆم بێ پێچوپەنا دەردەبڕم. پلارهاویشتن بە کاری کەسێک دەزانم، توانای ڕووبەڕووبوونەوەی نەبێت. لێت ناشارمەوە ماوەی نووسینی ئەم چەند لاپەڕەیەم بە خاڵێکی

زۆر گرنگی ژیانم دەزانم، چونکە وا نەبووایە ئەو هەستەی خۆمم نەدەناسی، کە لەو ڕێگەیەوە ناسیم. هەمیشە گوتوویشمە ئەوە (ئەوەی تر)ـە، بە مانایەکی تر بوونی ئەوەی ترە لە تۆدا، دەتوانێت ئەو بەشە گەورەیەی ژیانت ئاشکرا بکات، کە بە تەواوی لە خۆت شاراوەیە. (هیگڵ) پێچەوانەی (دێکارت)، کە بوونی (ئەوەی تر)ی دەدایە دواوە، ئەوا پێی وایە ئەم (ئەوەی تر)ـە بۆ خود پێویستە، مادام دەبێتە هۆی پەیدابوونی زانینی ئەو خودە لەبارەی خۆیەوە. پێی وایە بوونی (ئەوەی تر) بۆ خود گرنگە، چونکە لەو ڕێگەیەوە، واتە لە ڕێی ئەو (ئەوەی تر)ـەوە خود هەست بە خۆی دەکات. بە مانایەکی تر خود لە ڕێی (ئەوەی تر)ـەوە پێوەندی بە خۆیەوە دادەمەزرێنێت. لێرەیشدا ئەو جیاوازییە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ململانێ.([17])

بە ڕوونی پێت دەڵێم ئەم بەرهەمەم وێنەیەکی جوانی تۆم دەهێنێتەوە بەر چاو. بە مانایەکی تر تۆ بە بەشێک لەم کارەم دەزانم. ئەمە مانای ئەوە نییە بۆچوونی خۆم لەبارەی گوتەکانتەوە دەشارمەوە، یان خاترت دەگرم. لە ڕۆژگاری زانکۆدا، کاتێ لەگەڵ یەکێ گفتوگۆمان بکردایە و بمانویستایە بە جوانی ڕەخنەی لێ بگرین، ئاماژەمان بەو گوتەیەی (بێرتراند راسێل) دەکرد، کە لە کتێبی سێیەمی (مێژووی

[17] لە گفتوگۆیەکم وەرگیراوە، کە نووسەرێک ماوەیەکی کەم پێش وازهێنانم لە تەوەرەی (من و ئەوەی تردا) لەگەڵی کردووم.

فەلسەفەی خۆرئاوا)دا بە (ژۆن دیوی)ی گوتووە. ڕاستییەکەی سەرەتا باسی مەزنیی ئەو فیلۆسۆف و پەروەردەکەرە دەکات و دەڵێت لەگەڵ زۆربەی بۆچوونەکانی هاوڕایە. ئینجا ئەمەی دەخاتە سەر: (چەند پێم خۆش بوو لەگەڵ سەرجەم بۆچوونەکانی هاوڕا بم، بەڵام بەداخەوە ناچارم لەبارەی سەختترین تیۆرییە فەلسەفییەکانی لەگەڵی ڕێک نەکەوم).(١٨)

خۆزگە گفتوگۆکەمان لەبارەی ئەوەوە بووایە، کە هەر یەکەمان تێڕوانین و تێگەیشتنی جیاوازمان بۆ چەند تێرمێکی ئەدەبی، هونەری و فەلسەفی هەیە، کە ئەودەم زمانەکەمان ئاستێکی دیکە و بەرهەمەکەیشی چاکتر دەبوو، بەڵام من لای خۆمەوە زۆر داخ بۆ ئەوە هەڵدەکێشم، کە لەبارەی ئەوەوەیە پرسیار گرنگ نییە، ئیفلاسم کردووە و شتی لەم بابەتە. ئەمە مانای ئەوە نییە دەمەوێت بیسڕمەوە، کە باوەڕم بەوەیە هەر شتێک هاتە دنیاوە، مافی ئەوەی هەیە بژی، مەگەر نووسەرەکەی بە ئازادیی خۆی بیسڕێتەوە، بەڵام هاوکات ئەو مافەیش لە خۆمان ناستێنینەوە، کە تێی بپەڕێنین. من هیوام دەخواست تۆ ئەو دوو گوتارەت نەنووسیایە، چونکە وەک دواتر پێشانی دەدەم، هیی کەسێک نین، ڕۆژێک لە ڕۆژان چوار دێڕی گرنگی

---

[١٨] برتراند راسل، تاريخ الفلسفة الغربية، الكتاب الثالث، الفلسفة الحديثة، ترجمة: د. محمد فتحي الشنيطي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٧٧، ص٤٧٦و٤٧٧

خوێندبێتەوە، بەڵام مادام هەن، ڕووبەڕوویان دەبمەوە و لە ڕێگەی پرسیارەوە تێیان دەپەڕێنم.

دووبارەیشی دەکەمەوە یەک دەنک بەوە پەست نیم پێم گوتراوە موفلیس. لە پۆلی سێیەمی سەرەتاییدا یەکەمجار وشەی (موفلیس)م لە دەمی ژنێکی ناسیاومانەوە بیست، ئەودەمەی لە هەیوان وانەی (نوري، نوري، رازي، نوري زاراني)م دەنووسییەوە، کە (مامۆستا عەزیز) پێی دەگوتینەوە. ئەو لە باخەکەماندا بۆ دوو کچی گەورەی کۆڵانمانی دەگێڕایەوە، کە لە سەرەتای شەستەکاندا لە مووسڵ پیاوێکی خزمیان بە فێڵی بازرگانی هەموو سامانەکەی لە ژێر دەست دەرهێناون و موفلیس بوون. کاتێ گەڕاونەتەوە هەولێر، شوێنیان نەبووە تێیدا بژین، بۆیە (ن. م)، کە پیاوێکی دەوڵەمەندی بیرکراوەی لە بابەتی (عەلی بۆسکانی) بوو لە گەڕەکمان، چەند مانگ کرێی خانووی بۆ داون.

لێرەدا دوو شتی سەیر هەن: یەکەمیان، ئەو ژنە دەیگوت لەمەوە لە ژیان گەیشتن. دووەم، من لەو کاتەوە هەر جارێ گوێم لە وشەی (موفلیس) بووبێت، ئەو تایە، یاخود ئەو ویلە گەورەیەم هاتووەتەوە بەر چاو، کە (نووری) لە وێنەکەدا دەیخولێنێتەوە. بە مانایەکی تر وشەی (موفلیس) لای من بازنەییە. ئەگەرچی باوەڕ دەکەم لەمەودوایش کاتێ ئەو وشەیە دەبیستم، هەر ئەو وێنەیەم بێتەوە بەر چاو، بەڵام خۆیشم

دەبمە بەشێک لێی، بەوەی دەرکەوت موفلیسی تەواو منم. بەوەدا ئەو بازنەیەم لەگەڵدایە و دەیخولێنمەوە، پێی خۆشحاڵم. ڕوانین لە خودەوە بۆ بابەت ئاڕاستەیە، نەوەک بەپێچەوانە، بەوەی (خود ئەو کردارەیە، کە لە ڕێگەی زمان و لەسەر زماندا پراکتیزە دەکرێت).([19])

کەواتە هەر خودێک لە ڕێگەی زمانەوە خۆی بە خودەکانی تر دەناسێنێت. ئەو زمانە پێمان دەڵێت ئەو خودە چیی پێیە و چیی هەڵگرتووە. مادام من نیم ئەو زمانەم بە کار هێناوە، ئەوا پێویست ناکات هەڵبچم و تووڕە ببم، بەڵام هێندە هەیە ئەو کەسە بە شێوەیەک لە شێوەکان هاوڕێ و هاوپیشەمە و ڕۆژگارێک نامەمان گۆڕیوەتەوە. ئەمە ناخۆشە! بەو مانایە ناخۆشە، کە من بمەوێت و نەمەوێت پێوەندیم بەو کەسەوە هەیە. ئەوەتا وا جارێکی تریش لێرەدا، لەم نووسینەدا پێی دەگەمەوە. چەند جیاواز بوو، ئەگەر لە ئاستێکی تری زماندا بینووسیبووایە، کە وەک گوترا ئێستا گفتوگۆکەمان مانایەکی لەوە گەورەتری بە خۆیەوە دەگرت! ناشمەوێت بڵێم ئەمە زمانی هەمیشەی تۆیە، بگرە بە پێچەوانەوە، ئارامییەک لە زمانی هەندێک بەرهەمی تۆدا هەیە، کە وەک ئارامیی نووسەرێکم دیوە، ویستوویەتی جیاواز بنووسێت.

---

[19] جنات بلخن، السرد التاريخي عند بول ريكور، مسائل فلسفية، دار الامان، الجزائر، الطبعة الاولى. ٢٠١٤، ص٣٧

له پۆلی شه‌شه‌می سه‌ره‌تاییدا مامۆستا (ڕه‌مزی وه‌لی عه‌لی)ی ئه‌ده‌بدۆست و وه‌رزشدۆست گوتی: حه‌کیمێک، (که‌ دوایی زانیم سۆکراته‌)، کاتێ ده‌بینێت که‌سێک وا به‌ له‌شولار و جلوبه‌رگیه‌وه‌ ده‌نازێت، پێی ده‌ڵێت: (قسه‌ بکه‌، با بتبینم!). واته‌ کاتێ ده‌دوێیت، ده‌رده‌که‌وێت تۆ چیت پێیه‌ و ته‌عبیر له‌ چی ده‌که‌یت. له‌ هه‌شتاکاندا ئێمه‌ هه‌میشه‌ ئه‌و گوته‌یه‌ی (سۆکرات)مان ده‌گوته‌وه‌، که‌ له‌ زمانی ئینگلیزییشدا بووه‌ته‌ شتێکی باو: (**Speak, so that I can see you**).

دواتریش لای ئه‌و فیلۆسۆفانه‌ی له‌ به‌رهه‌مه‌کانتدا ناوت هێناون، پێشانت ده‌ده‌م مرۆڤی یاخی، ئه‌و مرۆڤه‌ی نابێته‌ به‌شێک له‌ مێگه‌ل، ده‌بێت ئیفلاس بکات، که‌ من به‌ گشتی وشه‌ی (مایه‌پووچ) به‌ کار ده‌هێنم، چونکه‌ وه‌ک گوترا زمانی نووسین و زمانی ڕۆژانه‌ جیاوازن. مه‌گه‌ر ئه‌وه‌ ئێمه‌ نیین خۆمان وا به‌ خوێنه‌ر ناساندووه‌، که‌ نووسه‌رین، بگره‌ ڕه‌خنه‌گرین؟ مرۆڤی یاخی شه‌ڕ له‌پێناو ئیفلاسبووندا ده‌کات، بۆ ئه‌وه‌ی نه‌بێته‌وه‌ به‌شێک له‌ جه‌ماوه‌ر. تاکه‌ شتێک، که‌ مرۆڤی یاخی له‌ ده‌ستی نادات، زمانه‌، ده‌نا هه‌موو سه‌رمایه‌ کۆمه‌ڵایه‌تی و سۆمبۆڵییه‌کان بۆ ئه‌وه‌ن له‌ ده‌ست بدرێن. نووسین فۆرمێکه‌ له‌ فۆرمه‌کانی زمان، نه‌وه‌ک به‌ پێچه‌وانه‌وه‌. (بوون به‌ هۆی زمانه‌وه‌ له‌ ڕێگه‌ی مرۆڤه‌وه‌ ده‌دوێت. مرۆڤ به‌

زمان نادوێت، بەڵکوو ئەوە زمانە دەیدوێنێت)([20])، یان بۆی دەدوێت. دواتر هەر لای (هایدیگەر) و ئەوانەی تریشدا بە ڕوونی دەیبینین زمان چییە. بەڵێ، ئەمەیش وەک زۆری تر بۆ کاتی خۆی هەڵدەگرین.

لەگەڵ ئەوەیشدا دەڵێم هیوادارم گفتوگۆی داهاتوومان ئاستێکی بەرزتری هەبێت، کە من لە ئێستاوە هەوڵ بۆ ئەوە دەدەم. بە دووری نازانم تۆیش شتێکی وات بوێت.

---

[20] مارتن هایدغر، اصل العمل الفني، ترجمة: د. ابو العيد دودو، المانيا، منشورات الجمل، الطبعة الاولى، ٢٠٠٣، ص٢٢

# ڕەخنەگری میللی و
# زمانی ڕۆژانەی خەڵك

گوتارەکەتت بەم پەرەگرافە دەست پێ کردووە: (چەند ساڵێک لەمەوبەر بەهۆی ئەوەی ڕەخنەم لە ئەزموونی چیرۆکنووسی یەکێک لە چیرۆکنووسەکان گرت و لە کۆڕێکدا ڕاشکاوانە ڕای خۆمم پێوت، ئیدی ئەو چیرۆکنووسە نیگەران و بێتاقەت بوو و دواتریش نەیتوانی ئەو ڕەخنەیە هەزم بکات و بۆ ئەوەشی پارسەنگی ئەو ڕەخنەیە بداتەوە کەوتە جۆرێک لە یاریکردن بە ئومێدی ئەوەی من سەرقاڵی شتی بێبەها بکات و لە پرۆژەی خوێندنەوە و نووسینم بکات. دەیویست جۆرێک سەرقاڵیم بۆ دروست بکات، کە نە سوودی بۆ من هەبوو نە بۆ ئەو، بەڵکو ئامانجی ئەوە بوو، ئەو وزەیەی لە مندایە بۆ خوێندنەوە و نووسین کپی بکاتەوە و بە شتی لاوەکییەوە سەرقاڵم بکات).

من ئەگەر تۆ نەناسم، بەڵکوو یەکێ ئەم گوتارەتم بخاتە بەر چاو، بۆ ئەوەی بیخوێنمەوە، ئەوە هەر لەم پەرەگرافەوە دەگەمە ئەو باوەڕەی نووسەرەکەی ڕۆژێک لە ڕۆژان کتێبێکی

به دەستەوە نەگرتووە. سبەی خوێنەرێک لە کۆمەڵگەوە ڕاستەوخۆ دێت و یەکەم تێکست لە دنیای نووسیندا دەکەوێتە بەر چاوی، ئەمەی تۆیە، چ شتێکی نوێی لێ وەردەگرێت، کە پێشتر لە نەنک و باپیری نەیبیستووە؟ باشە، ئەمە هەر ئەو زمانە نییە، کە خەڵک ڕۆژانە لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا بە کاری دەهێنن؟

نووسەرێک، تەنانەت نەیتوانیوە بیرۆکەیەکی زۆر سادە بە زمانەکەی خۆی دابڕێژێت. سەرنج لەمە بدە: (چیرۆکنووسی یەکێک لە چیرۆکنووسەکان)! ئەمە مانای چییە؟ چیرۆکنووسێک چیرۆکنووسێکی هەیە و تۆ ڕەخنەت لە ئەزموونی ئەوەیان گرتووە، نەوەک لە چیرۆکنووسەکە خۆی.

دە ساڵ لەمەوبەر لە نامەدا زۆر سەرنجم لەبارەی دەربڕینەوە بۆ نووسیت، بەڵام دیارە هیچ سوودت لێ نەبینیون، دەنا چۆن ئەمەت دەنووسی!

نەدەکرا بنووسیت: (ئەزموونی چیرۆکنووسینی یەکێک لە چیرۆکنووسەکان)؟ هێشتا بتنووسیایە: (ئەزموونی چیرۆکنووسیی یەکێک لە چیرۆکنووسەکان)، هەر چاکتر بوو، کە (ی)یەک مانای وشەیەک، بگرە هیی ڕستەیەک تەواو دەگۆڕێت. هەر لەم گوتارەتدا جیاوازیت لەنێوان (ڕۆشنبیر) و (ڕۆشنبیری)دا نەکردووە. من ئەگەر چیرۆکنووسێکم هەیە،

بۆچی پێم دەگوترێت موفلیس؟ مرۆڤی موفلیس، (موفلیس بەو مانایەی خۆت لێی تێگەیشتوویت)، کوا ئەزموونی؟ ئەو ئەزموونەت لە کوێ هێناوە؟ دەکرێت پێناسەی ئەزموون بکەیت، کە یەکێکە لەو چەمکە ئاڵۆزانەی دنیای فیکر؟

لە نامەی یەکەمتدا، کە دە ساڵ لەمەوبەر بۆت ناردووم، ڕەخنەت ئەوەیە لە من، کە کاتێ گوتوومە: (ڕۆماننووس هەیە دەڵێت: ڕۆمانی باش وەک شووتیی باش وایە...) جورئەتم نەبووە ناوی نووسەرەکەی بهێنم، لە کاتێکدا وەک گوتووتە بەشێکی زۆری خوێنەری ڕۆمان دەزانن ئەو نووسەرە کێیە. پرسیاری من ئێستا ئەوەیە: تۆ بۆچی ناوی منت نەهێناوە؟ ئەگەرچی بە لامەوە ئاساییە، بەڵام هەر قسەکەی خۆتت وە بیر دەهێنمەوە. لە نامیلکەیەکدا گوتەی تۆم وەک نموونەی نووسینی ڕەخنەگری میللی هێناوەتەوە، کەچی نەهاتوویت لێم بپرسیت بۆ جورئەتم نەبووە ناوت بهێنم.([21]) وایە؟

مەبەستم نییە زۆر خۆم بەم شتانەوە خەریک بکەم، کە ڕەنگە دواتر بە شێوەی تر بۆیان بگەڕێمەوە. بۆ ئەوەیش دەگەڕێمەوە ئاخۆ ڕاستە تۆ ڕەخنەت لە من گرتووە؟ ڕەخنەکانت چین؟ ئایا وایە من هەڵچووم؟ کاردانەوەکەم چۆن لا دەرکەوت؟

---

[21] http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٥/٣/karwanKakaswr_ardalan.pdf

لێرەدا کەسێکمان هەیە نارەزایی دەردەبڕێ، کە ویستوویانە بە پرسیار لە پرۆژەی خوێندنەوە و نووسینی بکەن. بە چی ویستوویانە لە پرۆژەی خوێندنەوە و نووسینی بکەن؟ بە پرسیار؟ پرسیارەکان چین؟ دواتر دوو سێ نموونەیان لێ وەردەگیرێت. ئایا ئەو کەسە دەبێت لە گوتارێکی وادا باسی ڕەخنە بکات؟ ئەلفوبێی ڕەخنە لەم دوو دێڕەدا کورت دەبێتەوە (لەسەر پرسیار دامەزراوە و دایەلۆگییە)، واتە لە ڕێگەی پرسیارەوە لە بابەت دەکۆڵێتەوە و دایەلۆگی لەگەڵ دادەمەزرێنێت. ئەگەر تۆ هەردووکیان نەک هەر بدەیتەوە دواوە، بەڵکوو پێت وایە لە خوێندنەوە و نووسینت دوور دەخەنەوە، ڕەخنەگری چییت؟ دواتر بە وردی لێکیان دەدەمەوە و لەبارەیانەوە دەپرسم. گوتووتە ڕەخنەی تۆم هەزم نەکردووە. باشە، کاردانەوەکەم چی بووە؟ نامەم بۆ ناردوویت. لەبارەی ئەو چەمکانەوە، کە فرێت داون، بۆم نووسیویت و ناوی کۆمەڵێک سەرچاوەم پێ گوتوویت. ئەو ئەزموونەی خۆمم خستووەتە بەر دەستت، کە بە زەحمەت و دوای ساڵانێکی زۆر پێی گەیشتووم. ئایا ئەمە بە خراپ دەزانیت؟ دەتوانیت لە سەرجەمی هەموو نامەکاندا وشەیەک بدۆزیتەوە، ئەوە بگەیەنێت لێت تووڕە بووم؟ لەو نامانەدا جگە لە خۆشەویستی، شتێکی تر هەیە، ئاڕاستەت کرا بێت؟

# جۆرەکانی ئەدەب... چەمك و تیۆری

ئەوەی لێرەدا لەسەری دەوەستم، چەمکی (چیرۆکنووس)ـە، کە تۆی ڕەخنەگر بۆ کەمکردنەوەی بەهای منت بە کار هێناوە. واتە پێت وایە پلەی چیرۆکنووس لە هیی ڕۆماننووس نزمترە، کە ئەمە هەمان ئەو تێڕوانینە میللییەیە، پێی وایە پلەی ئەفسەر لە هیی سەرباز بەرزترە. خۆت چاک دەزانیت من بە شیعر دەستم پێ کردووە، ئینجا چیرۆکی کورتم نووسیوە. گەیشتوومەتە چیرۆکی درێژ. هەندێک لە چیرۆکەکانم لە زۆرێک لەو تێکستانە درێژترن، کە ناویان لێ نراوە ڕۆمان و تۆ بە داهێنانت زانیون. کۆمەڵێک ڕۆمانم نووسیون، کە خۆت لانی کەم لەبارەی یەکێکیانەوە دواویت. هەروەها نووسەری ژیاننامەم. جاروباریش گوتارم لەبارەی هەندێک چەمکی فیکری، ئەدەبی و هونەرییەوە بڵاو کردووەتەوە، بەڵام هەمیشە گوتوومە خۆم بە نووسەری ئەدەبی گێڕانەوە دەزانم، بەو مانایەی لای من ئەدەبی گێڕانەوە بوارێکە، هەموویان دەگرێتەوە، کە پێشتریش لە دەروازەکەدا ئاماژەم پێ دا.

ئەگەر وەک پێویست لە کێشەی تیۆریی جۆرەکانی ئەدەب ئاگادار بوویتایە، کە لە (پلاتۆن) و (ئەریستۆ)وە دەست پێ دەکات و دەگاتە ڕەخنەدۆز و فیلۆسۆفانی ئەمڕۆ، بەم شێوە میللییە ئەو چەمکەت فڕێ نەدەدا. من وەک بەڵێنم پێ داویت لەسەر هەر چەمکێک لەو چەمکانەی لێرە فڕێت داون، بوەستم و لاکەی تری پێشان بدەم، کە لایە سەختەکەیە، ئەوا لە خوارەوەدا هەوڵ دەدەم کارەکەم بەم چەمکە دەست پێ بکەم:

وەک گوترا جۆرەکانی ئەدەب (**Literary Genres**) بابەتێکە لە فەلسەفەی یۆنانییەوە، بەتایبەتی لای (پلاتۆن) و (ئەریستۆ)دا بایەخی پێ دراوە. دواتر بەشێکی زۆری ڕەخنەدۆز و فیلۆسۆفەکان ڕووبەڕووی بوونەتەوە، کە ناکرێت ئێمە لەم شوێنەدا بە هەموویاندا بچینەوە، بەڵام مەبەستمانە وێنەیەکی گشتیی ئەو بابەتە بخەینە ڕوو، کە لەم شەست حەفتا ساڵەی ڕابردوودا بووەتە باسێکی گرنگ بۆ لێکۆڵینەوە.

من لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا لە ڕێگەی کتێبەکانی (د. محەمەد غەنیمی هیلال)ـەوە، بەتایبەتی کتێبی (ڕەخنەی ئەدەبیی نوێ) و (ئەدەبی بەراوردکاری)دا بۆ یەکەمجار بەری کەوتم، کە لەو سەردەمەدا لای ئەدەبدۆستاندا ناسرا بوون. لەمەوە هەم بایەخی ئەو چەمکەم زانی و هەم ئەوەیشم بۆ دەرکەوت تا چ ئەندازەیەک بووەتە کێشەیەکی گەورەی فیکری و ئێستاتیکی.

ڕاستییەکەیشی ئەو چەمکە لە بنەڕەتەوە هیی بایۆلۆجییە، کە بوونەوەر بۆ ڕەگەز، جۆر و شێوەکان پۆلێن دەکات.(٢٢)

پێویستە بگوترێت وشەی جۆر (ژانرە: genre) لە فرانسییەوە هاتووە و لە بنەڕەتیشدا لاتینییە. وشەکە بە شێوەی فراوان لە بواری ڕەوانبێژی (rhetoric)، تیۆریی ئەدەبی، تیۆریی میدیایی، دواجاریش لە زمانەوانی (linguistics)دا بە کار دەهێنرێت، کە ئاماژەیە بە جۆرێکی تایبەتی تێکست.(٢٣)

چەمکی (تیۆریی جۆرەکان) لەسەر پرۆبلەماتیکی هێندە گەورە دامەزراوە، تەنانەت پێناسەکردنی زۆر سەختە، چونکە بە دەست کۆمەڵێک گومانی لەمێژینە (perennial doubts)ەوە دەناڵێنێت: ئایا جۆرەکان هەر بە ڕاستی هەن، یان تەنیا دروستکراوی ڕاڤەکارانن؟ ئایا لە ڕووی پرینسیپەوە جۆرەکان دیاریکراون، یان بێسنوور؟ ئایا جۆرە پلاتۆنییەکان نەمرن، یان لە ڕووی زەمەنەوە پووکاونەتەوە؟ ئایا جۆرەکان تاککەلتوور

---

٢٢ د. عبد المنعم تليمة، مقدمة في نظرية الادب، دار العودة، بيروت، التبعة الثالثة، ١٩٨٣، ص١٢٦

٢٣ Daniel Chandler, An Introduction to Genre Theory.

لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکەکەیەتی:

https://faculty.washington.edu/farkas/HCDE٥١٠-Fall٢٠١٢/Chandler_genre_theoryDFAnn.pdf

(culturebound)ن، یان فرەکەلتوور (transcultura)؟[٢٤](*)

ئەگەر ڕاڤەکاران ڕوانینی جیاوازیان بۆ لێکدانەوەی چەمکەکە هەبێت، ئەوا زۆربەیان لەسەر ئەوە کۆکن ڕیشەی بۆ کارەکانی (پلاتۆ) و (ئەریستۆ) دەگەڕێتەوە. دەکرێت بگوترێت ڕوانینی دووەمیان بۆ چەمکەکە هەم قووڵتر و هەم پێگەیشتووترە، کە بە چەمکی (لەچاوکردنەوە)وە پێوەستە.

لەچاوکردنەوە، کە بە عەرەبی (المحاكاة)، بە ئینگلیزی ئیمتەیشن (Imitation)ە و لە بنەڕەتیشەوە لە میمیسیس (Mimesis)ی لاتینییەوە هاتووە، لای (پلاتۆ) مانایەکی زۆر دیاریکراوی هەیە و لای (ئەریستۆ)دا گۆڕانی بەسەردا دێت، کە لە کتێبی (هونەری شیعر)دا بەم شێوەیە پۆلێنی جۆرەکانی ئەدەب دەکات: شیعری داستانی، شیعری تراجیدی، شیعری کۆمێدی، شیعری دیترامبی (Dithyrambos)، کە ئەمەی دواییان پارچەی شیعری گۆرانیی ئایینیی دەگرێتەوە. هەر یەک

---

[٢٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

* سەرنج: تاککەلتوور (culturebound) و فرەکەلتوور (transcultura)م بۆ داناون، کە دەشێ زۆر گونجاو نەبن، بۆیە بە پێویستی دەزانم پێناسەیەکی کورتیان بکەم، کە یەکەمیان مانای وایە پێوەندیی بە کەلتوورێکی دیارکراو و مێژوویەکی دیاریکراوەوە هەیە، بەڵام دووەمیان هەم لە ئاستی کەلتوورەکانی تر و هەم لە ئاستی مێژوودا کراوەیە، بۆیە ناکرێت لە کات و شوێنی دیاریکراودا قەتیس بکرێت.

لەو جۆرە لەچاوکردنەوەیە لە سێ ڕووەوە لە یەکتر جیاوازن، کە ئەمانەن: مادده، بابەت و ڕێگە.[٢٥]

(جیرار جینێت)، کە یەکێکە لەو ڕاڤەکارانەی خۆی لەم بابەتە داوە و لێی کۆڵیوەتەوە، جۆری پارۆدی (شیعری هەجوو)یش دەخاتە پاڵ ئەوانەی (ئەریستۆ) دیاریی کردوون.[٢٦]

(جینێت) پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە دابەشکردنی جۆرەکانی ئەدەب کێشەیەکی چەند بڵێی سەختە، بە ڕادەیەک دەڵێت: {لەبارەی پۆلێنکردنی جۆرەکانی ئەدەبەوە هەڵویستێک نابینین لە جەوهەردا لە هیی یەکێکی تر سروشتیتر، یان ئایدیالیتر بێت، ئەو هەڵویستەیش نایەتە دی، مەگەر خودی پێوەرە ئەدەبییەکان بە لاوە بنێین، وەک چۆن ئەوانەی کۆن (واتە ڕاڤەکارانی کلاسیک) بە شێوەی ئیمپلیسیتلی (ضمني) لەبارەی شێوازەوە دەیانکرد. ئاستێکی (ڕەگەزی: جنسي) نییە لە ڕووی تیۆرییەوە وا پشتی پێ ببەستیت، کە لەوەی دیکەیان بالاتر بێت، یان بکرێت بە ڕێگەی سینتیسیس (استنباطي) پێی بگەیت، کە لەوەی تریان بەرزتر بێت. هەموو جۆر و ڕەگەزەکان، چ بچووکەکان و چ گەورەکان لەوە تێناپەڕن چینی

---

[٢٥] ارسطو، كتاب فن الشعر، ترجمة وتقديم وتعليق: دكتور ابراهيم حماده، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٨٩، ص٥٥

[٢٦] جيرار جينيت، مدخل لجامع النص، ترجمة: عبد الرحمن ايوب، مشروع النشر المشترك، دار الشؤون الثقافية العامة (افاق عربية)، بغداد، دار توبقال للنشر، ١٩٨٥، ص٢٦

ئێکسپێرمەنتەڵ (طبقات تجريبية)ن، بەپێی بواری فاکتی مێژوو دانراون.}[27]

مەبەستی ئەوەیە کێشەکە پێوەندیی بە سروشتی چەمکەکەوە هەیە، کە خۆی بە دەست تێگەیشتنەوە نادات، تاکوو بتوانین جۆرەکانی بە ئاسانی لە یەک جودا بکەینەوە. بەپێی کۆنتێکستە مێژووییەکان گۆڕانی بەسەردا دێت، بەوەی هەم گەشە دەکات و هەم بەر تێڕوانینی تر دەکەوێت، بۆیە بوونێکی چەسپاوی نییە. کەوتووەتە ژێر کاریگەریی ئەزموونی ئەوانەی کاریان لەناودا کردووە.

ئەو پۆلێنکردنەی (ئەریستۆ) لە کتێبی (هونەری شیعر)دا کردوویەتی، دواتر گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە، وەک چۆن ئەوەی (ئەریستۆ) خۆی بە شۆڕشێک دادەنرێت لەسەر تێڕوانینی (پلاتۆ)دا لەوەی پێوەندیی بە (لەچاوکردنەوە)وە هەیە، بەوەی (پلاتۆ) باوەڕی وا بوو هونەر تەنیا کۆپیی واقیعە و هەرگیز ناتوانێت نوێنەرایەتیی ژیان و واقیع بکات. پێی وایە واقیعی ڕاستی تەنیا ئەو دنیایەیە، کە لە ڕووی فۆرمەوە چەسپاوە و ناگۆڕێت. ئەو واقیعەیش دەستکردی خواوەندە. بۆ

[27] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل76

نموونه فۆرمی تەواوی پشیلە، سەگ، مێز، کورسی فۆرمی ڕاستین. تەنیا یەک ڤێرشنی ئەوانە هەیە.(٢٨)

کەواتە هەر فۆرمێکی تری ئەوانە کۆپییە، ناتەواوە و لە ناو دەچێت. ئەمەیش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە سەر بە فەلسەفەی ئایدیالیزمە، بەوەی باوەڕی وایە هۆشیاری دەکەوێتە پێش ماددەوە، بەو مانایەی تێکڕای بوون لە دنیای ئایدیالدایە.

دیارە (تۆدۆرۆڤ) نرخی ئەو کتێبەی (ئەریستۆ) دەزانێت، کە یەکەم کتێبە هەمووی بۆ تیۆریی ئەدەب تەرخان کرابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا پێی وایە کتێبێکی تیۆریی ئەدەبی نییە، بەڵکوو کتێبێکە لەبارەی لەچاوکردنەوەوە، کە تێیدا جۆرەکانی ئەدەب بۆ داستان و دراما دابەش دەکات. تەنیا خۆی لە قەرەی یەک جۆری دڕامایش دەدات، ئەویش تراجیدیایە، بەڵام بەشەکەی تر، کە کۆمێدیایە، ونە، یان سووک و ئاسان بوونی نییە. لە بەرانبەریشدا لەو کتێبەدا شوێنێک بۆ شیعر تەرخان نەکراوە، لە کاتێکدا لەم سەردەمەی ئەمڕۆماندا شیعر بایەخی گەورەی لە ئەدەبدا هەیە.(٢٩)

---

[٢٨] Janet Cameron, Plato's Argument: Art is an Imitation of an Imitation.
لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکەکەیەتی:
http://decodedpast.com/platos-argument-art-imitation-imitation/٢٩٩٠

[٢٩] تزفيطان طودوروف، الشعرية، ترجمة شكري المبخوت ورجاء بن سلامة، دار توبقال للنشر، دار البيضاء، المغرب، الطبعة الثانية، ١٩٩٠، ص١٢

ئەوەی ئەو لۆژیکەی (ئەریستۆ) دەخاتە ژێر پرسیارەوە، دەرکەوتنی ژانری دیکەی وان، کە خۆیان بە دەست پۆلێنکردنەوە نادەن، بەوەی پێبەندی ژانرە کۆنەکان نین. یەکێ لەو ژانرانە، ڕۆمانە.[30]

ئێمە مەبەستمان نییە لێرەدا بە درێژی باس لە چەمکی (لەچاوکردنەوە) لای (پلاتۆن) و (ئەریستۆ)ی شاگردیدا بکەین، بەڵکوو دەمانەوێت ئەوە دەربخەین، کە پۆلێنکردنی جۆرەکانی ئەدەب کەی دەستی پێ کردووە و چۆن گۆڕانی بەسەردا هاتوە، بەتایبەتی دواتر لای ڕەخنەدۆز و فیلۆسۆفانی پۆستمۆدێرنیزمدا.

(بێنیدێتۆ کرۆچە)ی فیلۆسۆفی ئیتاڵی لەگەڵ ئەوەدایە جیاوازیی نێوان جۆرەکانی ئەدەب بسڕێتەوە، کە نووسەرانی کلاسیک زۆر بایەخیان پێ داوە.[31] هەروەها بە بڕوای ئەو نابێت جیاوازی لەنێوان شیعر و پەخشاندا بکرێت، لەسەر ئەو بنەمایەی گوایە یەکەمیان ریتمی هەیە و دووەمیان نییەتی. مەبەستی ئەوەیە، کە شیعر لەسەر بنەمای کێش و سەروا دامەزراوە و پەخشان نا، لە کاتێکدا دەکرێت شیعر پەخشان بێت وەک بۆ نموونە لە ڕۆمان و دراමادا دەیبینین. ئەوەیش

---

[30] د. صبحه احمد علقم، تداخل الاجناس الادبية في الروايه العربية، الرواية الدرامية انموذجا، المؤسسة العربية لـلدراسات والنشر، الاردن، الطبعة الاولى، ٢٠٠٦، ص٧

[31] الدكتور محمد غنيمي هلال، الادب المقارن، نهضة مصر لـلطباعة والنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعة التاسعة، ٢٠٠٨، ص١١٧

هەیە، کە پەخشان بە ریتم پێک بێت وەک لە پەروەردەیی و فەلسەفییەکاندا هەیە. کەواتە پێویستە جیاکارییەکەمان لەسەر بنەمایەکی قووڵ بێت. دەکرێت شیعر تەعبیر لە وێنە بکات، بەڵام پەخشان لە حیکمەت و تێگەیشتن. ڕاستییەکەیشی هەردوو دەربڕینەکە یەک سروشتیان هەیە.([٣٢])

(ڕۆلان بارت) لە (ڕاڤەی بونیادگەرانەی گێڕانەوە)دا دەنووسێت: (جۆرەکانی گێڕانەوە لە دنیادا بێژمارن، کە ئەمە بەر لە هەرچی هەمەجۆرییەکی گەورەی ژانرەکانە).([٣٣])

پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە گێڕانەوە دەشێ بە زمان بێت و دەشێ نووسراو بێت. ئەوەیش دەڵێت، کە گێڕانەوە گوێ ناداتە چاکی و خراپیی ئەدەب، بەڵکوو گەردوونییە و وەک ژیان لە هەموو شوێنێکدا هەیە. دوای ئەوە پرسیارێکی گرنگ دەورووژێنێت، کە لە کوێ ئێمە ڕەوایەتیی جیاکردنەوەیان لە یەکتر وەردەگرین و دەیان ناسێنین؟ چۆن بەیەکگەیشتنی نێوان ڕۆمان و چیرۆکی کورت، ئەفسانە و داستان، دراما و تراجیدیا هەڵبسەنگێنین؟ (خەڵک هەزار جار ئەمەیان کردووە). بەم شێوەیە لە بەرانبەر بێسنووری و بێکۆتاییی گێڕانەوەکان و بوونی فرەدیدگەیی، کە دەشێ لێیانەوە بدوێین (مێژوویی،

---

[٣٢] ب. کروتشه، المجمل في فلسفة الفن، ترجمة وتقديم: سامي الدروبي، الطبعة الاولى، المركز الثقافي العربي، بيروت، الدار البيضاء، ٢٠٠٩، ص٨٩و٩٠

[٣٣] رولان بارت واخرون، طرائق تحليل السرد الادبي، ترجمة حسن بحراوی واخرون، منشورات دار اتحاد كتاب المغرب، الرباط، الطبعة الاولى، ١٩٩٢، ص٩و١٠

سایکۆلۆجی، ئیتنۆلۆجی، ئیستاتیکی، هتد) ڕاڤەکار خۆی لە دۆخێکی نزیک دۆخەکەی (سۆسێر)دا دەبینێتەوە، کاتێ خۆی لە ئاستی (بیرەگەزی: heterogeneity)ی زماندا دۆزییەوە.([٣٤])

مەبەستی (بارت) ئەوەیە ئاسان نییە لەناو ئەو هەموو ئاراستە جیاوازانەدا ئەدەب پۆلێن بکەیت وەک چۆن لای (سۆسێر)دا ئەو پۆلێنکردنەی زمان ئاسان نەبوو. هەر (بارت) پێی وایە ئەوە دامودەستگەیە بە شێوەی ڕاستەوخۆ سروشتی زانستە مرۆییەکان دیاری دەکات و ڕێگەکانی دابەشکردن و پۆلێنکردنیشیان دەسەپێنێت. ئەمەیش مانای وایە مرۆڤ ناچار دەکرێت بە ڕێگەیەک بیر بکاتەوە، نەوەک بە ڕێگەکانی تر. لەوێدا ئاماژە بە زانکۆکانی فرانسا دەدات، کە لیستی فەرمییان هەیە، زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان لە خۆ دەگرێت. واتە تەنیا ئەمانە ددانیان پێدا نراوە. تۆ دەتوانیت نامەی دۆکتۆرا لەبارەی ئیستاتیکا، سایکۆلۆجیا، سۆسیۆلۆجیا و هیی ترەوە بنووسیت، بەڵام بۆ نموونە لەبارەی سیمانتیکەوە نا.([٣٥])

(تۆدۆرۆڤ) لە زۆربەی بەرهەمە ڕەخنەییەکانیدا ڕووبەڕووی ئەو چەمکە دەبێتەوە، بە ڕادەیەک ڕاڤەکارانی ئەمڕۆ ناتوانن خۆیانی لێ بدەن، ئەگەر بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆ

---

[٣٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩و١٠

[٣٥] رولان بارت، من العلم الى الادب، ترجمة: د. منذر عياشي، مجلة الاداب الاجنبية، سوريه، عدد٩٣، سنة١٩٩٧، ص٤٨

لێکۆڵینەوەکانی ئەو نەگەڕێنەوە. بە بڕوای ئەو پێویستە لە ڕوانگەی خەسڵەتە بونیادییەکانەوە، نەوەک لە ڕوانگەی ناوەکانەوە لە ڕەگەز، بێگومان مەبەستی ڕەگەزی ئەدەبییە، بکۆڵرێتەوە، چونکە ئەگەر هەندێک ڕەگەز هەمیشە ناوبانگی گەورەیان هەیە وەک تراجیدیا، کۆمێدیا، شیوەن و هتد، بەڵام هەندێکیان هەرگیز ناویان بە نەسیب نەبووە، بەڵکوو لەگەڵ هیی تردا تێکەڵ کراون، ئەگەرچی خەسڵەتی جیاوازیشیان هەیە.([36])

پێی وایە بیرکردنەوەی ئەدەبی لە سەردەمی کلاسیکدا زیاتر بە ژانرەکانەوە پێوەست بوو، نەوەک بە کاری ئەدەبییەوە، هەروەها وەک مەیلێکی سزادەرانەیش خۆی پیشان دەدا، بەوەی کارەکە بە خراپ دادەنرا ئەگەر بە شێوەیەکی تەواو ڕەچاوی ژانرە ئەدەبییەکانی نەکردایە. کەواتە ئەو ڕەخنەیە هەر تەنیا بۆ ئەوە هەوڵی نەدەدا وەسفی ژانرە ئەدەبییەکان بکات، بەڵکوو دەیشیسەپاند. بەم شێوەیە خشتەی ژانرە

---

[36] تزفيطان تودورف، الاجناس الادبية، ترجمة: جواد الرامي. لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکەکەیەتی:

http://www.aljabriabed.net/n١٨_١٢jawarami.htm

ئەدەبییەکان دەکەوتە پێش داهێنانی ئەدەبییەوە، نەوەک دوای بکەوێت.[37]

وەک دەبینین (تۆدۆرۆڤ) بەردەوام ڕەخنە لەو تێگەیشتنە کۆنە دەگرێت، کە پێ لەسەر سەربەخۆیی ژانرەکان دادەگرێت، وەک ئەوەی قاڵب بن و سنووری دیاریکراویان هەبێت. دەڵێت کاری داهێنەرانە بە ڕێگەیەک ژانری نوێ دروست دەکات، هاوکات بنەما باوەکان تێ دەپەڕێنێت. بەم شێوەیە هەموو کارێکی داهێنەرانە دوو ژانر و واقیعی دوو پێوەر دادەهێنێت، واقیعێک، کە تێی دەپەڕێنێت، ئەوەی پێشتر دەستی بەسەر ئەدەبدا گرتبوو، واقیعێکیش، کە دایدەهێنێت.[38]

(دکتۆر خەیری دومە)ی وەرگێڕی کتێبی (چیرۆک، ڕۆمان، نووسەر، لێکۆڵینەوە لە تیۆریی ژانرەکانی ئەدەبی هاوچەرخ)ی (تۆدۆرۆڤ)، لە پێشەکییەکەدا دەنووسێت: (لە پلاتۆن و ئەریستۆ و تیۆرییەکانیان لەبارەی لەچاوکردنەوە و جۆرەکانیەوە، بە تێپەڕین بە تێکڕای مێژووی تیۆریی ئەدەبی و تیۆریی جۆرەکان، لە هۆراسەوە بۆ هیگڵ بۆ لۆکاچ و بۆ باختین، تاکوو دەگاتە ڕەخنەدۆزانی پۆستمۆدێرنیزم و شۆڕش و گاڵتەپێکردنیان بە یاسای جۆر، چەمکی جۆر هەمیشە بابەتی

---

[37] تزفیتان تودوروف، شعرية النثر (مختارات)، تليها ابحاث جديدة حول المسرود، ترجمة عدنان محمود محمد، مراجعة الدكتور جمال شحيد، منشورات الهيئة العامة السورية للكتاب، دمشق، ٢٠١١، ص٧

[38] هەمان سەرچاوە، ل٨

دایەلۆگ و مشتومڕ بووە، چ بە پەسەندکردن و چ بە ڕەتکردنەوە).([39])

لەم کتێبەدا لەپاڵ (تۆدۆرۆڤ)دا ئەم ڕەخنەدۆزانەیش بەشدارن: (تۆنی بینێت)، (جۆناتان کویلەر)، (تۆماس کێنت)، (چارلز مای)، (رالف کۆهین)، (رۆبێرت لۆچەر)، (رۆبێرت شۆلز)، (لوسیان گۆڵدمان)، (مێشێل فۆکۆ) و (والتەر رید).

قووڵیی هیچ تێکستێک پێوەندیی بەوەوە نییە لەژێر چ ناوێکدا پۆلێن دەکرت، بەڵکوو ئەو پێکهاتەیەی لە ڕێگەی ئازارەوە پێکی هێناوە، ئەو قووڵییەی لەسەر سەری ڕاگرتووە. (بۆرخیس) تەنیا چیرۆکی نووسیوە، بەڵام قووڵاییی بەرهەمەکانی بووەتە جێگەی سەرنجی فیلۆسۆفێکی وەک (فۆکۆ)، تا لە پێشەکیی کتێبی (وشەکان و شتەکان)دا بڵێت ئەو کتێبەی لە چیرۆکێکی ئەو، دروستتر لە بەشێکی چیرۆکێکی ئەو چیرۆکنووسە بەرهەم هێناوە. وەک دەڵێت ئەو پێکەنینەی لەگەڵ خوێندنەوەیدا هەموو سیما باوەکان تێک دەشکێن، فیکری ئێمە، ئەو فیکرەی تەمەن و جیۆگرافیامانە.([40])

[39] هەمان سەرچاوە، ل٧

[40] Michel Foucault, The Order of Things, An archaeology of the human sciences.

پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کتێبەکە پێشتر لە زمانی ئینگلیزیدا بە ناونیشانی (Words and Things) چاپ کراوە. ئەمە لینکەکەیەتی:

وەک بلێی بیەوێت بڵێت ئەدەب، کە گاڵتەپێکردن یەکێکە لە ڕەگەزەکانی، هاوشانی فەلسەفە توانای تێپەڕاندنی هەیە. (فۆکۆ) بە وردی لەسەر ئەو چیرۆکەی (بۆرخیس)دا دەوەستێت، کە مەبەستم نییە بچمە ناو وردەکارییەکانیەوە، بەوەی لێرەدا تەنیا ئامانج ئەوەیە ئاماژە بەوە بدرێت گرنگیی لە پۆلێنکردنی ژانرەکاندا نییە، بەڵکوو داهێنان داهێنانە و تێکستەکان بە ژمارەی وشە ناپێورێن.

ڕەخنەگری میللی لە ڕێگەی پۆلێنکردنی ئەدەب و دانانی چەند پێوەرێک بۆ چاکی و خراپی، ئازادی لە داهێنەر دەستێنێتەوە و دەیەوێت سنوور بۆ بیرکردنەوەی دابنێت، کە ئەمە ئەو شتەیە فەلسەفە لە دژی وەستاوەتەوە. ئەمە زۆرجار لە نیازی خراپی ئەو ڕەخنەگرەوە نییە، بەڵکوو لە بێئاگاییەتی لە فەلسەفە و لەو هەوڵانەی لە بواری ڕاڤەکردنی تێکستدا دراون. ئەو کەلتوورە بە ڕاستی لە سەرەتای حەفتاکاندا لەگەڵ دەرچوونی یەکەم ژمارەی (هاوکاری)دا دەستی پێ کرد. زۆربەی ڕەخنەگرەکان نیازیان پاک بوو، بەو مانایەی دەیانویست لە دژی ئەدەبێکدا بوەستن، کە خزمەت بە ئایدیۆلۆجیی ئەوان ناکات. هەرگیز ئەوە نیازی پاک نییە دەتوانێت ئاڕاستەی نوێ لە فیکر و

---

https://is.muni.cz/el/١٤٢٣/jaro٢٠١٣/SOC٩١١/um/Michel_Foucault_The_Order_of_Things.pdf

ئەدەبدا بدۆزێتەوە، بەڵکوو هەر نیازی شەڕانگێزە (بە مانا نیتشەییەکەی) ئەو توانایەی هەیە. ئەو ڕەخنەگرە نیازپاکانە (بە مانا هایدیگەرییەکەی) لە سەرچاوەی کاری هونەری بێئاگا بوون، بۆیە هەر هێندەیان لە تێکست دەبینی، کە لە ڕووی فیزیکییەوە لێیان دیار بوو، دەنا ئەو ڕووبەرە شاراوەیەی، کە کاری ڕاڤەیە بیدۆزێتەوە، بە تەواوی لەوان ون بوو و بە دوایدا نەدەگەڕان.([٤١])

بەم شێوەیە هەر کارێکی هونەرییان دەسڕییەوە، کە لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەیاندا ڕێک نەدەکەوت. یەک دووانێکیان کاتێ ئەو ئاستەیان بە شێوەیەک لە شێوەکان تێپەڕاند، گۆڕانکارییان بەسەر مێتۆدی خۆیاندا هێنا، هەتا ئەگەر کەمیش بێت. لەمەوە هێندە بەرهەمی نووسەرانیان نەدەسڕییەوە.

ئەوانەی لەگەڵ ئەوەدا نین ئەدەب پۆلێن بکرێت، یان لانی کەم لەگەڵ ئەوەدا نین بەو شێوە ڕەهاییە پۆلێن بکرێت، لەبەر ئەوەیە باوەڕیان بە قاڵب و شێوەی دیاریکراو نییە، بەوەی هەر قاڵب و شێوەیەک بەربەستە لە بەردەم ئازادیی نووسەردا، لە کاتێکدا ئەو ئازادییە لە بیرکردنەوە و دەربڕیندا ڕێگە بۆ

[٤١] مەبەست لە کتێبی (سەرچاوەی کاری هونەری: The Origin of the Work of Art)ی (هایدیگەر)ـە. بە ئاگاییەوە وشەی (سەرچاوە)م لە جیاتیی وشەی (ئۆریگن) داناوە، بەو مەبەستەی لەگەڵ سترەکچەری زمانی کوردیدا ڕێک بکەوێت. دواتر بە وردی لەسەر ئەم کتێبە و ئەو چەمکەدا دەوەستین.

داهێنانی شتی نوێ خۆش دەکات. شتی هاوبەش لەنێوان ئەو جۆرانەدا هەیە، کە هەتا دێت زیاتر لە یەکتر وەردەگرن، بۆیە دانانی سنوور لەنێوانیاندا ڕووبەری ئەو ئازادییە تەسک دەکاتەوە. ئەوانەی ڕەخنە لەم پۆلێنکردن و دابەشکردنە دەگرن، هەر ئەوانەیشن بە گشتی ڕەخنەیان لە واقیعی مۆدێرنیتی هەیە، کە تێیدا (زانست/ عەقلانیەت) دەستی بەسەر بیرکردنەوە داگرتووە و شوێنی بۆ گومان و پرسیار نەهێشتووەتەوە. بەم شێوەیە پێی وایە ئەو بوارانە بۆ کەسانی پسپۆڕن. لێرەدایە سپێشەلایزەیشن دەخاتە سەرووی هەموو شتێکەوە. واتە ئەو بوارانە تەنیا بۆ ئەوانەن، کە لە زانستی ئەو بوارەدا شارەزاییان هەیە. ئەمەیش بە سروشت کاتێ خۆی لە بابەتێک دەدات، هێندەی مەبەستیەتی دەستی بەسەردا بگرێت، هێندە لەگەڵ ئەوەدا نییە ئازادی بکات و لە ڕێگەی پرسیارەوە ئاراستەی نوێ و جیاوازی لێ بگرێت.

بە بڕوای من ناکرێت هیچ ژانرێک لە ژانرێکی تر بە گەورەتر، یان بە بچووکتر بزانین. تێکستی کورت و درێژ ئەگەر لە ڕووی فیزیکییەوە هەبن، ئەوە لە ڕووی مێتافیزیکییەوە ڕووبەری بێسنووری شاراوەن، کە ئەو ڕووبەرە بۆ ڕاڤە جێ ماوە، نەوەک بۆ بڕیار. تێکستەکان لە دەرەوە چەند بچووک دیار بن، ئەوا لە ناوەوە ئاراستەکانیان گەورە و بێسنوورن، کە تخووب (سنوور)ی مێژوو و جیۆگرافیا دەبڕن و لە هەر

سەردەم و لە هەر شوێنێکدا بە توانای گەورەترەوە دەردەکەونەوە. (هونەر لە ژانرێکدا هەیە و لە ژانرێکی تردا نییە)، یان (لەمیان زیاترە و لەویان کەمتر)، دەستەواژەی سواون و هێشتا لای ئێمە بەر هێزی ڕەخنەیی نەکەوتوون، دەنا بنەمای پتەویان نییە. ڕەخنەگری میللی بەوەدا ئاستی تێگەیشتنی خەڵکی نەبەزاندووە، ئەوا لەناویدا ماوەتەوە و لەوێوە بەو زمانە ساکارە، بەو ڕستە سواوانە لێیانەوە دەدوێت.

ئەگەر پێویست بکات، بۆ ئەم باسە، (باسی جۆرەکانی ئەدەب) دەگەڕێمەوە و بە شێوەی وردتر لەبارەیەوە دەنووسم، بەڵام وەک گوترا تەنیا بۆ ئەوەیە پێشانی بدەم تا چ ئەندازەیەک ڕەخنەدۆزانی بە خۆیەوە خەریک کردووە و چۆن بووەتە یەکێک لە کێشەکانی فیکر و ئێستاتیکا.

دەمەوێت لێت بپرسم ئەگەر ئەم باسە هێندە گرنگە دەبێت چی وای لێ کردبێتی بەم زمانە میللییە قسەی لێوە بکەیت، بگرە قسەی لێوە نەکەیت، بەڵکوو بێنرخ پێشانی بدەیت؟ بێئاگاییت لە تیۆرییەکانی ئەدەب بووەتە هۆی ئەوەی بەم زمانە بنووسیت. من خۆم پێوەندییەکی دیالێکتیکەڵ لەنێوان هۆشیاری و زماندا دەبینم. هەر گۆڕانکارییەک بەسەر هۆشیاریدا بێت، لە زماندا ڕەنگ دەداتەوە و زمان هەر جووڵەیەکی تێ بکەوێت، هۆشیاری دەباتە ئاستێکی باڵاترەوە، کە گومان و پرسیار دوو

ڕەگەزی سەرەکیی ئەم گۆڕانکارییەن. بەم شێوەیە شێوازی نووسەر مەودایەکی گەورەتر لەنێوان خۆی و ئەو فۆرمە دروست دەکات، کە ئێستا باوە.

(نیتشە) هەمیشە پێی لەسەر بوونی پێوەندیی نێوان بیرکردنەوە و دەربڕین داگرتووە. بە مانایەکی تر پێی وایە ئەوە شێوازی بیرکردنەوەیە شێوازی دەربڕین دیاری دەکات. پارچەی (١١٠)ی کتێبی (مرۆڤێکی قاڵبوو لە مرۆڤایەتییەکەیدا)ی ناو ناوە (شێوازی قسە و شێوازی نووسین)، کە لە ژێریدا دەنووسێت: {هونەری نووسین بەر لە هەرچی وا دەکات ڕێگەی قەرەبووکردنەوەی شێوازەکانی دەربڕین بێت، کە تێیدا تەنیا خودی قسەکەر ئامادە دەبێت: جووڵە، تۆن، زەنگ، ڕوانین، وەک چۆن شێوازی نووسین زۆر لە هیی قسە جیاوازە. زۆر لەو سەختترە، کە دەیەوێت: بە ڕێگەی کەمتر ڕێک وەک ئەو دەنگی ببیسرێت. دیمۆستین ( Demosthenes) خوتبەکانی بە شێوەیەک دەدا، جیاواز لەوەی دەخوێنرانەوە. بەر لەوەی بهێڵێت خەڵک بیانخوێننەوە، دایدەڕشتنەوە}.([42])

هەروەها لە پارچەی (١٣١)دا، کە (ڕاستکردنەوەی فیکر) ناونیشانیەتی، دەنووسێت: (ڕاستکردنەوەی فیکر واتە

---

[42] فريدريك نيتشه، انسان مفرط في انسانيته، ج٢، ترجمة: محمد الناجي، افريقيا الشرق، المغرب، ٢٠٠١، ص١٥٣

ڕاستکردنەوەی شێواز و هیچی تر نا. ئەوەی خێرا ڕاستی نەکاتەوە، ئێمە هەرگیز قەناعەتی پێ ناهێنین وا بکات).([٤٣])

لە پارچەی (١٣٥)دا، کە ناوی (ئایدیای هەڵبژاردە)یە، دەنووسێت: (شێوازی هەڵبژێرراو لە سەردەمێکی بووژاوەدا تەنیا وشەکانی هەڵنابژێرێت، بەڵکوو ئایدیاکانیشی هەڵدەبژێرێت).([٤٤])

بەم شێوەیە فیکری گەورە شێوازی گەورە دادەهێنێت، کە پێش هەموو شتێ لە زماندا ڕەنگ دەداتەوە، بەڵام فیکری سادە پەنا بۆ هەمان ئەو شێوازە ئاسانە دەباتەوە، کە لای خەڵکی ئاساییدا هەیە.

نازانم چۆن ڕەخنەگرێک دوای چاپکردنی باوەشێک کتێب، ڕێگەی بە خۆی داوە بەم شێوازە بنووسێت! دیارە کە بەردەوام دەیڵێمەوە، مانای وا نییە، دەمەوێت بیسڕمەوە، بەڵکوو مەبەستمە قسەی لێوە بکەم. مادام بەری کەوتووم، نابێ هۆشیاریم فریو بدرێت و بەسەریدا تێ بپەڕێت. ئەگەر سبەی جارێکی تر بۆ ئەوە گەڕایەوە بڵێی فلان نووسەر شێوازێکی باش و فیسار نووسەر شێوازێکی خراپی هەیە، بێ ئەوەی دوو دێڕ لەبارەی شێوازەوە بنووسیت، بەڵکوو هەر بەم زمانە میللییەت حوکمیان لەسەر بدەیت، منی خوێنەر چۆن

[٤٣] هەمان سەرچاوە، ل١٥٩

[٤٤] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

باوەڕت پێ بکەم؟ ئەوانە بۆیە دەڵێم، تاکوو خێرا ڕاستیان بکەیتەوە، دەنا بە دەربڕینی (نیتشە)، کە باوەڕم وایە لە نووسیندا ناویت هێنابێت، دەڵێم: (ئەگەر خێرا ڕاستی نەکەیتەوە، من هەرگیز قەناعەتت پێ ناهێنم وا بکەیت).

# ڕەخنەگری میللی چۆن

# لە چەمکی ڕەخنە دەڕوانێت؟

ئێستا دەگەینە ئەو خاڵەی، کە گوتووتە تۆ ڕەخنەت لە من گرتووە. جارێ با ئەو پێناسەیەت بخەینە بەر چاو، کە بۆ ئەو چەمکەت کردووە: (ڕەخنە بریتییە لە بڕیاردان لەسەر دەق بە چاک یان بە خراپ)، کە ئەمە دەقی گوتەکەتە: (لە نووسینی رەخنەییدا بڕیار لەسەر دەقێک دەدرێت، کە پێشتر لەلایەن خالقێکەوە ئەفرێنراوە. ئیتر بە باش یان بە خراپ).

لە دایەلۆگێکم لەگەڵ نووسەرێکدا گوتوومە ئەمە بە هەموو مانایەک کارەساتە و ئێستایش دەیڵێمەوە([٤٥]) یەکێک ئەمە تێگەیشتنی بێت بۆ ڕەخنە، بێگومان لە جیاتیی ڕاڤە، پەنا بۆ بڕیار و حوکمدان دەبات. ناڵێم لە هەموو بەرهەمەکانتدا پێڕۆییی ئەم بۆچوونەی خۆتت کردووە، بەڵام لەم دوو

[٤٥] http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٥/٣/karwanKakaswr_ardalan.pdf

گوتارەتدا لێیت لا نەداوە. پێی لەسەر دادەگرمەوە، کە ئەم دوو گوتارەت، تەنانەت لە بەرهەمەکانی پێشووت ناچن.

بە گشتی کاری ڕەخنەگری میللی لەو یارییە دەچێت، کە بە منداڵی دەمانکرد. لە یەکێکم دەپرسی: (دەتەوێ لە ڕێگەی ژمارەوە ناوی دایکت بزانیت؟) پەرۆشانە وەڵامی دەدایەوە: (بەڵێ). دەمگوت: (ژمارەیەک بڵێ!) بۆ نموونە دەیگوت: (هەشت). هەر لە خۆمەوە دەمگوت: (چواری بخەرە سەر، شەشی لێ دەر بهێنە، دابەشی سێی بکە، دوانزدەی بخەرە سەر، حەوتی لێ دەر بکە، جارانی پێنجی بکە و بەم شێوەیە). هەموو ئەوانەی خێرا و بە خۆشحاڵییەوە دەکرد، بەو هیوایەی هەرچی زووە ناوی دایکی بزانێت، کەچی دواجار پێیم دەگوت: (ڕێگەیەکی ئاسانتر هەیە. بڕۆ لە خۆی بپرسە!).

ئەمە ئەو پرینسیپەیە، کە ڕەخنەگری میللی لە خوێندنەوەدا کاری پێ دەکات. کۆمەڵێک شت دەڵێت، نە پێوەندییان بە تێکستەکەوە هەیە و نە ڕاڤەکردنی چەمکەکانیشن، بەڵکوو یارییەکی بێتامە و هیچی دیکە نا. ڕاستییەکەی من لە منداڵییەوە ناوی دایکی خۆم دەزانم و پێویستم بەوە نییە لە هیچ ڕێگەیەکی ترەوە پێی بگەم.

چەند ساڵ لەمەوبەر لەبارەی ڕەخنەگری میللییەوە ئەمەی خوارەوەم لە نامیلکەیەکدا نووسیوە، کە تاکوو ئەمڕۆیش دۆخەکە هەمان شتە:

{ڕەخنەگرم بینیوە لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی تەمەنی نووسینیدا هێندەی کتێب چاپ کردووە، کە ژمارەیان زیاترە لەو کتێبانەی ڕەخنەگرێکی وەک (رۆلان بارت) بە درێژاییی ژیانی نووسیونی، بەڵام هەر ئەو ڕەخنەگرە لەبارەی هەندێک چەمکی ئەدەبی و فیکرییەوە بۆچوونی وای دەربڕیوە، مرۆڤ هەم دەخاتە پێکەنین و هەم دەیگریەنێت. ڕەخنەگری دیمۆتیک ساڵی ٢٠١٣ دوای چاپکردنی چەند کتێبێکی ڕەخنەیی، دوای ئەوەی بە زمانی ڕۆژانە کۆمەڵێک تێکستی شکاندووە، چونکە لێیان تێنەگەیشتووە و بە کۆمەڵێکیدا هەڵداوە، چونکە بە ئاسانی سەری لێیان دەرچووە؛ دەڵێت: (ڕەخنە بریتییە لە بڕیاردان لەسەر دەق بە چاک یان بە خراپ). ئەمە بە هەموو مانایەک کارەساتە! کاتێکیش بیانەوێت بزانن چ تێکستێک چاکە و چ تێکستێک خراپ، ئەوا پێوەر ئەوەیە ئەو تێکستە چەندی لە کۆی ڕەخنەی میللی بەر کەوتووە.

بە بڕوای من دەرکەوتنی ڕەخنە و گەشەکردنی هەمیشە هاوکاتی تێپەڕاندنی زمانی ڕۆژانە و دامەزراندنی زمانی نووسینن. تاکوو ئەم ساتەیش تێکستی ئێمە لە دەرەوەی پرۆسەسی نووسین و بە شێوەی زارەکی هەڵدەسەنگێنرێت.

چاکە یان خراپە؟ ئەمە ئەو پرسیارە سواوەیە بەردەوام گیانی فیکر و ئێستاتیکامان دەکوژێت، لە کاتێکدا بۆ ئەوەی تۆ هەر تێکستێکی ئەدەبی، بەتایبەتی ڕۆمان ڕاڤە بکەیت، پێویستت بە نووسینە، چونکە تەنیا لە (نووسین)دا دەتوانیت زۆرترین لایەکانی تێکست ببینیت.

کەم نین ئەو تێکستە گەورانەی لە کازینۆ، لەناو پاس، لە سەیرانگە و شوێنی دیکەدا بە شێوەی زارەکی و بە چەند وشەیەکی ساکار بڕیاریان لەسەر دراوە. ئەلف تەکنیکی لاوازە. بێ زمانی خراپە. جیم ڕووداوەکانی ئاڵۆزن. دال دایەلۆگەکانی زەقن. میم خاوەنی فانتاسیایەکی داخراوە، بێ ئەوەی ئەوانە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا چوار دێڕیان لەبارەی چەمکی زمان، ڕووداو، دایەلۆگ، فانتاسیا و شتی دیکەوە نووسیبێت. ئەگەر نووسیبێتیشیان بە هەمان زمانی ڕۆژانە باسیان لە کۆمەڵێک مەسەلەی سەختی ئەدەبی و هونەری کردووە، بەو مەبەستەی تا ئەو ئاستە سادەیان بکەنەوە، کە سەریان لێیان دەربچێت و ئەنجام بڕیاری چاکە و خراپەیان بۆ دەربکەن}.([٤٦])

وەک پێشتریش گوترا تۆیەک ئەم دوو گوتارەت نووسیبن و بڵێیت ویستوویانە بە پرسیار لە پرۆژەی خوێندنەوە و نووسینم بکەن، تۆیەک بڵێی پرسیار گرنگ نییە و هیی منداڵە، تۆیەک ئەمانە و زۆری تری هاوشێوەی ئەمانەت گوتبن، چۆن

[٤٦] http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٥/٣/karwanKakaswr_ardalan.pdf

ڕەخنەت گرتووە، کە یەکێکە لە کارە سەختەکانی فیکر و ئێستاتیکا؟

ڕەخنە لە سادەترین پێناسەیدا بریتییە لە دروستکردنی پرسیار لەناو ئەو تێکستەی دەتەوێت لێی بکۆڵیتەوە. هەر شتێک بکەوێتە دەرەوەی ئەو تێکستەوە، حوکمە و دوور و نزیک پێوەندیی بە ڕەخنەوە نییە. ئەوەی تۆ کردووتە، حوکمە و لە دەرەوە هاتووە. ڕەخنە، کە شێوازێکە لە شێوازەکانی ڕاڤەی فیکری و ئێستاتیکی، مانای وایە هونەری خوڵقاندنی دنیایەکی ترە لە ڕێگەی پرسیارەوە. تا ئەو کاتەی زمانی ئێمە هەمان زمانی خەڵکە، ئەوە هێشتا ئەو دنیایەمان نەخوڵقاندووە.

(دۆلۆز) و (گاتەری) لە بەشی دووەمی کتێبی (دایەلۆگەکان)دا پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، کە نووسەر دنیا دەخوڵقێنێت، بەوەی خود (Subject)ێکە بۆ گوتن (Enunciation)، بەر لە هەرچی ڕۆحە، کە جارێک لەگەڵ کارەکتەرەکانی یەک دەگرێت، یان با بڵێین وا لە ئێمە دەکات لەگەڵیان یەک بگرین، یاخود لەگەڵ ئەو بیرۆکانەی کارەکتەرەکان هەڵیانگرتووە، یەک بگرین، جارێکیش پێچەوانەی ئەوە. گرێدان (Assembling)ەکە بەم شێوەیەیە: ئێمە دەکەوینە ناوەڕاست،

لەسەر هێڵی ڕووبەڕووبوونەوە (Encounter) لەنێوان دنیای ناوەوە و دنیای دەرەوەدا.(٤٧)

ڕەنگە خوێنەری بیرکەرەوە هەر لەم نووسینەی مندا کاتێ بۆچوونی ئەو ڕەخنەدۆزانە دەخوێنێتەوە، بۆی دەربکەوێت زمانی ئەم دوو گوتارەی تۆ چەند دوورە لەوەی ڕەخنەی پێ بنووسرێت، کە هەمیشە مەبەستم لە ڕەخنە، ڕاڤەکردنە. بێگومان زمانی منیش، بەڵام من ترسێکم لەوە نییە ئەوە بڵێم و خۆیشمم وەک ڕەخنەگر نەناساندووە، کە کارێکی زۆر سەختە. لەگەڵ ئەوەیشدا من داوات لێ دەکەم هەر چیت لەبارەی منەوە نووسیوە، بۆم بخەیتە سەر فایلێک و بە جیاواز بڵاوی بکەیتەوە، تاکوو من بەم مێتۆدەی خۆم، مێتۆدی پرسیار و وردکردنەوە، بیخوێنمەوە و لەبارەیەوە گفتوگۆت لەگەڵ بکەم. ئایا ئەگەر تۆ شتێک لەبارەی منەوە بڵێیت، بۆم نییە لێت بپرسم مەبەستت چییە؟ ئامادەیت وا بکەیت؟ لانی کەم ئامادەیت یەکێکیانم بە ئیمەیڵ بۆ بنێریت، تاکوو من بە خۆشحاڵییەوە خۆم بۆ ئەو گفتوگۆیە ئامادە بکەم؟

---

٤٧ Gilles Deleuze and Claire Parnet, Dialogues, translated by Hugh Tomlinson and Barbara Habberjam, New York Columbia University Press, ١٩٨٧, pp.٥٢

له‌ ئێستاوه‌ ده‌ڵێم هه‌ر ته‌نیا کردنی ئه‌م کاره‌ت لای من مانایه‌کی گه‌وره‌ی هه‌یه‌ و ده‌ڵێم تۆ ئه‌و خاڵه‌ت تێپه‌ڕاند، که‌ پێت وا بوو پرسیار شتی بێبه‌هایه‌ و له‌ پڕۆژه‌ی خوێندنه‌وه‌ و نووسینت ده‌کات. ڕه‌نگه‌ بڵێیت پێشتر بڵاو کراونه‌ته‌وه‌ و خۆیشت بینیوتن. به‌ڵێ، ڕاستییه‌که‌ی یه‌ک دووانێکیانم دیون، به‌ڵام یه‌که‌م، ئه‌وه‌ جیاوازه‌ خۆت به‌و مه‌به‌سته‌ بۆم بنێریت، که‌ ده‌ته‌وێت گفتوگۆیان لێوه‌ بکه‌ین له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی خۆم بۆیان بگه‌ڕێمه‌وه‌. دووه‌م، من وه‌ک پێشتریش گوتم ئێستا باری ده‌روونیم ڕێگه‌م نادات به‌رهه‌می هیچ نووسه‌رێکی کورد بخوێنمه‌وه‌، بۆیه‌ له‌ دنیای کوردی دوورم. هیوادارم بتوانین گفتوگۆیه‌کی ورد له‌م باره‌یه‌وه‌ بکه‌ین. ئه‌گه‌ر ده‌رکه‌وت ئه‌وانه‌ی تۆ له‌باره‌ی منه‌وه‌ گوتووتن: ڕاڤه‌ن، شتی نوێن، دۆزینه‌وه‌ی نهێنین، پراکتیزه‌ی چه‌مکی فیکری و ئه‌ده‌بین، دایه‌لۆگن له‌گه‌ڵ بیرۆکه‌کانی ناو تێکسته‌که‌دا، ئه‌وا تۆ ڕه‌خنه‌ت گرتووه‌، به‌ڵام ئه‌گه‌ر بڕیار بوون، ئه‌وه‌ هه‌ر ئه‌و شته‌یه‌، که‌ خۆت به‌ ڕوونی له‌ پێناسه‌که‌دا گوتووته‌ و هه‌مان ئه‌و دوو گوتاره‌تن، که‌ وا بوونه‌ته‌ بابه‌تی ئه‌م نووسینه‌ی من. ئه‌م باسه‌ بۆ ئه‌و کاته‌ هه‌ڵده‌گرم، به‌ڵام ئێستا دێم به‌ کورتی ئه‌و تۆمه‌ته‌ له‌سه‌ر خۆم لا ده‌به‌م، گوایه‌ من به‌ ڕه‌خنه‌ هه‌ڵده‌چم، ئه‌گه‌رچی ده‌زانم هه‌ر له‌ بنه‌ڕه‌ته‌وه‌ پێمه‌وه‌ نالکێت. ئینجا من له‌باره‌ی قه‌بووڵکردنی ڕه‌خنه‌وه‌ بۆچوونێکی ترم هه‌یه‌. به‌کورتی له‌گه‌ڵ قه‌بووڵکردنی دایه‌لۆگدام، نه‌وه‌ک له‌گه‌ڵ قه‌بووڵکردنی ڕه‌خنه‌.

نووسەرێک ڕەخنەی لە ڕۆمانی (ئای لەڤیلیا لەڤیلیا!) گرت، لە کاتێکدا لەگەڵ زۆر لە بۆچوونەکانیدا نەبووم، کە ئەمەیش ئاساییە، چونکە ئەو جیاوازییەیە پێم دەڵێت بەرهەمەکەم خوێنراوەتەوە، بەڵام من نامەیەکم بۆ نووسی و سوپاسیم کرد. ئەو نووسەرە نەک هەر نامەکەمی لە بەرگی دواوەی کتێبێکیدا بڵاو کردەوە، بەڵکوو خودی کتێبەکەیشی پێشکەش کردم، چونکە پێی وا بوو ئەمە نموونەیەکی دەگمەنی دنیای کەلتووری کوردییە. شاعیرێکی لاو هەشت خاڵی دەستنیشان کرد، گوایە من لەبەر ئەم هەشت خاڵە نووسەر نیم. لەبارەی هەر شتێکەوە گوتبووی، پرسیارم کرد و بووە نامیلکەیەکی ڕەخنەیی. پێش بڵاوکردنەوە بۆیم نارد، تاکوو بیخوێنێتەوە، ئەگەر هەر سەرنجێکی هەیە، لە بەرچاوی بگرم. یەک وشەی زبرم تێدا بە کار نەهێناوە. لە کۆڕێکمدا ئەو نووسەرە لاوە لەگەڵ یەکێکی تر هات، بۆ ئەوەی بە فیکە و قسە کۆڕەکە بشێوێنێت. ئەوەی بەرگریی لە خۆی و هاوڕێکەی کرد، من بووم، کە گوتم ڕێگەیان بدەن با قسەی خۆیان بکەن. ئەوە هەموو ئامادەبووانی کۆڕەکە ماون. ئێستایش دەڵێم هەردووکیان شیعری جوانیان نووسیوە، بەڵام کێشەیان ئەوەیە شیعر وای لێ نەکردوون، زمانی ڕۆژانەیان بچێتە ئاستێکی ترەوە. نووسەرێکی تر لەبارەی ڕۆمانی (کازینۆی منداڵان)ـەوە نووسیبووی، کە من وەک مافی خۆم لەو بارەیەوە قسەی ترم هەبوو و کردم. پێش بڵاوکردنەوە بۆیم نارد، تاکوو

بیخوێنێتەوە. دواجار، کە لە نێت وەک کتێبی ئێلیکترۆنی بڵاو کرایەوە، وێنەی دووقۆڵیی ئەو نووسەرە و منی لە بەرگی درا. لەگەڵ ئەو نووسەرەدا پێوەندییەکی زۆر خۆشم هەبووە.

لەو کۆڕەی لەبارەی چیرۆکی (ئەلفوبێی باڵدار)ی منەوە بوو و تۆی ئازیزیش قسەت تێدا کرد، بە شایەتیی هەموویان تووڕە نەبووم. زیاتریش ئاماژەت بە لایەنی باشیی چیرۆکەکە دا. دواتریش، کاتێ ڕیپۆرتاجێک لەو بارەیەوە بڵاو کرایەوە، کە بۆچوونی نووسەرانی لە خۆی دەگرت، تۆ دیسان بە باشی لەبارەیەوە دوایت، بەڵام وەک ئەوەی پێی ڕاهاتوویت، خاڵێکی لاوازیشت تێدا دەستنیشان کرد. لە بیرمە دوای کۆڕەکە نووسەرێکی هاوڕێمان ئاماژەی بە تۆ دا و لە منی پرسی: توو سەری خۆت چەند جوانە؟ بە درۆم بخەرەوە، ئەگەر لە دڵەوە نەمگوتبێت: زۆر! ئێستایش دەیڵێمەوە تۆ وایت. ئەوە هاوڕێکانم دەزانن گوتوومە ڕەخنەی من لە تۆ تەنیا ئەوەیە لەو ئاستە میللییەدا چەقیویت، دەنا توندوتیژیش نییت، هەر ئەمەیشە وای کردووە ئەم دوو گوتارەت وا لێک نەدەمەوە زمانی هەمیشەی تۆن. نووسەر هەیە ئەگەر تەنیا سێ دێڕت لەبارەیەوە بنووسێت، دەزانیت چەند قینلەدڵ (حاقد)ە و تا چ ئەندازەیەک ڕقی لێتە، بەڵام تاکوو ئێستا لە بەرهەمی تۆدا ئەمەم نەدیوە. ڕاشکاوانە بۆچوونی خۆت دەنووسیت، بەڵام ئەو تێگەیشتنەی ئێستات، ڕێگرە لەوەی ئەو جوانییەی هەتە، هەموو کاتێ

دەربکەویت. ئەمە خاڵێکی زۆر بەهێزە و دەکرێت دەستی پێوە بگریت.

دووبارەی دەکەمەوە من ناڵێم تۆ تێناگەیت و توانات نییە، کە ئەمە بە هیچ کەسێکی تریش ناڵێم، بەڵکوو دەڵێم تۆ هەوڵت نەداوە ئەو توانایەی هەتە، وەک پێویست بە کاری بهێنیت. هەر ئەو هاوڕێیەی ئەم دوو گوتارەتی بۆ ناردووم، پێی گوتووم، کە لە فەیسبووک شەڕیان پێ فرۆشتوویت، بەڵام بە جوانی وەڵامت داونەتەوە، کە من لەسەر ئەوە دەستت بە گەرمی دەگوشم. مەگەر نووسەرە گەورەکانی دنیایش هەر وایان نەکردووە؟

ئەگەر ئێمە لەسەر ئەوەی ڕەخنە لە بەرهەممان گیراوە، هەڵبچین و پەنا بۆ شکاندنی کەسایەتیی یەکتر ببەین، مانای وایە ئەوەی نووسیومانە، بە حەقیقەتی دەزانین، بگرە بە حەقیقەتی ڕەهای دەزانین، لە کاتێکدا مرۆڤی یاخی ئەوەیە نەک هەر بەرگری لە حەقیقەت ناکات، بەڵکوو تێکیشی دەشکێنێت. فیکری فەلسەفیی ئەم سەدوپەنجا ساڵەی ڕابوردوو بە هەموو ئاڕاستەکانیەوە کاری بۆ تێکشکاندنی سێنترالیزم کردووە، کە لەم نووسینەی مندا بەشێکی بۆچوونەکانیان دەردەکەوێت. با یەکێ لەو هاوڕێ نزیکانەم بێت و بڵێ من ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ڕەخنەیەکی دڵگران بووم، کاتێ بە مەبەستی دایەلۆگ کراوە. با یەکێکیان بێت و بڵێ هەر لە سەرەتای یەکترناسینمانەوە پێم

نەگوتووە وشەی (کاک)، (مامۆستا) و شتی وام بۆ بە کار مەهێنە، ناوی خۆم و هیچی دیکە نا! نایشارمەوە پێم ناخۆشە، زۆرم پێ ناخۆشە، کاتێ دەبینم نووسەرێک لە خۆی زیاتر کەس بە داهێنەر نازانێت، کەچی بە دوو سێ قسەی ساکاری ڕۆژانە باس لە کۆمەڵێک چەمکی گەورەی فەلسەفی و ئەدەبی دەکات، هاوکات پەلامارم دەدات، بەڵام تووڕەبوون و بەرپەرچدانەوە لە من دوورن، بەڵکوو تەنیا دەپرسم و دایەلۆگ دەکەم. نووسەری لاو هەیە، پێشتر ناویم نەبیستووە و بەرهەمی خۆیی بۆ ناردووم، تاکوو بۆی بخوێنمەوە و سەرنجی بۆ بنووسم. یەک دوو ڕۆژم بۆ تەرخان کردووە و لە نامەدا کۆمەڵێک سەرنجم بۆ نووسیوە. ئایا لەگەڵ تۆیشدا ئەزموونی وام نییە؟ ڕۆژێکیان لە سلێمانی لەگەڵ هاوڕێیەکی ئازیزمدا بە لای دوو کەسدا تێپەڕیم، کە یەکێکیان تۆ و ئەوەی تریان شاعیر و هونەرمەندێک بوو. ئەو هاوڕێیەم دەزانێت لە ناسینەوەی خەڵکدا خراپم، بۆیە پێی گوتم ئەوە ئێوە بوون. هەر خێرا گەڕامەوە و لە باوەشم گرتن. وایە؟ ئەودەم یەک دووانێک لەو نامانەم بۆ ناردبوویت، کە پرسیار و بەدواداچوون لە خۆیان دەگرن. ڕاستە؟ دوای وازهێنانم نووسەر هەبووە، تەلەفۆنی بۆ کردووم، بەو مەبەستەی لەبارەی بابەتێکی ئەدەبی، یان هیی ترەوە قسە بکەین. نەمگوتووە نا. دە ساڵ لەمەوبەر گۆڤارێک هەندێک پرسیاریان بۆ ناردبووم، کە لە پرسیارەکاندا منیان وەک داهێنەر و شتی

وا ناو بردبوو. دوای ئەوەی سوپاسم کردن، ئەو وشانەم پێ لا بردن. ئێستایش نامەکەم ماوە، کە بۆم ناردوون. (خۆزگە ئەم شتانە لە گفتوگۆکەماندا نەبوونایە، بەڵام مادام هەن، ئەوا ناچارم بەم شێوەیە قسەیان لێوە بکەم).

پێ لەسەر ئەوە دادەگرمەوە، کە من دایەلۆگم قەبووڵە، نەوەک ڕەخنە. قەبووڵکردنی ڕەخنە مانای دەستهەڵگرتنە لە پرسیار، لە دەربڕینی بۆچوون، دەستهەڵگرتنە لە تێپەڕاندن و جیاوازی، کە من خۆمی تێدا نابینمەوە. ڕەخنە قەبووڵ ناکەم، بەڵام لە دژی ئەو زمان و تێگەیشتنە دەوەستمەوە، کە هەن. واتە لە ڕێگەی پرسیارەوە ڕووبەڕووی دەبمەوە و ئاستێکی تری زمان پێشان دەدەم. ئەوە خۆی ڕێگرە لەوەی خودی تۆ بسڕمەوە، یان پەلامارت بدەم، مادام دنیا لای من لە کەسێک، یان لە شتێک کورت نابێتەوە. ئەمەیە ڕێی لێ گرتووم من بەم زمانە بنووسم، کە تۆ تاکوو ئێستا پێی دەنووسیت.

کادیرانی حزب ڕەخنەیان لە یەکتر دەگرت و دەیانگوت تۆ دەبێت ڕەخنە قەبووڵ بکەیت! واتە ملکەچی ڕینوێنییەکانی ئایدیۆلۆجیا و پرۆگرامی حزب بیت. ئەمە لە بواری ڕەخنەی ئەدەبی و فیکریدا هەیە؟ قەبووڵکردنی ڕەخنە واتە دەمت دابخە و هیچ مەپرسە، کە ئەمە شتێکی هەرەمییە؟ واتە لە سەرەوە بۆ خوارەوەیە. باوک بۆی هەیە ڕەخنە لە دایک، برا لە خوشک، مامۆستا لە قوتابی، گەورە لە بچووک بگرێت، بەڵام بە

پێچەوانەوە نا. هەر ئەو باوکە، مامۆستایە، برایە، گەورەیە، لە شوێنێکی تری ئەو هەرەمەدا ڕەخنەی لێ دەگیرێت و دەمی دادەخات.  من خۆم بە دایەلۆگ ڕووبەڕووت بوومەتەوە. لە دایەلۆگدا ئەو هەرەمیەتە تێک دەشکێت و دەنگەکان هەم ئازاد دەکرێن و هەم هێندەی یەکتر توانای دەربڕینیان هەیە. هەر لە دەروازەکەدا گوتم لەم دایەلۆگەدا بەهای تۆ یەکسانە بە بەهای من.

# ڕەخنەگری میللی و

# بێبایەخکردنی پرسیار

ئەوەی لەم پەرەگرافەتدا ماوەتەوە قسەی لێوە بکرێت، ئەوەیە، کە ویستوومە بە پرسیار لە پڕۆژەی خوێندنەوە و نووسینت بکەم، ئەو وزەیەی لە تۆ دایە بۆ خوێندنەوە و نووسین، کپی بکەمەوە و بە شتی لاوەکییەوە سەرقاڵت بکەم... بەڵام پێویستە پەرەگرافێکی تر هەر لەم گوتارەت وەربگرم، کە هەر پێوەندیی بە پرسیارەوە هەیە. نووسیوتە: (ئێستا دێینە سەر ئەوەی پرسیار تا چەند گرنگە؟ بێگومان مرۆڤ تا پرسیاری نەبێت کەڵکەڵەی گەڕانی نابێت بەدوای وەڵامدا). ڕەخنەگرێک دوای چاپکردنی چەند کتێبێک تازەبەتازە ئەوەی نووسیوە! ئەرێ ئەوە چ خوێنەرێکە، پێش ئەوەی یەک کتێب بە دەستەوە بگرێت، لە کۆڵانەکەی خۆیدا ئەم گوتە سواوانەی نەبیستووە؟ با بزانین چیی تریشی بۆ زیاد دەکەیت: (واتە سەرەتا پرسیار

هەیە. بەڵام ئایا پرسیار بەبێ بوونی وەڵام هیچ سوودێکی هەیە؟).

هیوادارم ئەو هاوڕێیەی ئەم گوتارەتی بۆ ناردووم، هەڵەیەکی کردبێت. واتە ئەمە گوتەی هیچ کەسێ نەبێت، چونکە خەریکە باوەڕ نەکەم نووسەرێک هەیە لەم دنیایەدا شتی وا دەنووسێت. ئەو گوتانە بۆ چ خوێنەرێک شتی زۆر کۆن نین؟ کێ هەیە کاتێ ئەم وشانە دەخوێنێتەوە، دەتوانێت بەسەر خۆیدا زاڵ ببێت و قاقا لێ نەدات؟ ڕەخنەگرێک ناوی (هایدیگەر) و دەیان فیلۆسۆفی تری هێناوە و باس لە سوودی پرسیار دەکات، وەک ئەوەی شوانێک باسی سوودی خوریی مەڕ، یان باخەوانێک باسی سوودی بەری درەخت بکات. پرسیار و سوود؟ ئەدی زمانی ڕەخنەی میللی مانای چییە، ئەگەر ئەمانەی پێ نەنووسرێت؟

بەوەندە واز ناهێنیت و دەنووسیت: (بێگومان هیچ پرسیارێک نییە بەبێ بوونی وەڵام بایەخێکی ئەوتۆی هەبێت، چونکە ئەوەی هێز دەبەخشێتە پرسیار وەڵامە نەک گرنگی و بەهێزی پرسیار).

چەند خۆشحاڵم، کە وازم هێناوە! ئەوە ئێمە لە چ سەردەمێکداین؟ یان وەک لە ڕۆمانی (کاتژمێر بیستوپێنج)ی (کۆنستانتین ڤیرجیل گۆرگیۆ)دا هاتووە: (کاتژمێر چەندە؟

بیستوپێنج). بیستوپێنجی ڕێک؟ وەڵام هێز بە پرسیار دەبەخشێت؟ ئەمەیان زۆر لە خوار زمانی میللییەوەیە. چەند زوو لە قسەکەی خۆت پەشیوان بوویتەوە! خۆ ئەگەر پەشیمانیش نەبیتەوە، هەر هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. بەپێی ئەم قسەیە پرسیار چەندیش بەهێز و گرنگ بێت، لاوازە، ئەگەر وەڵام نەدرایەوە. بۆ نموونە پرسیارەکانی (هایدیگەر) و (دۆلۆز) بێبایەخن، ئەگەر خەڵکی گەڕەکەکانی خۆمان وەڵامیان نەدانەوە. ناکرێت یەک جار لەبەر دڵی من بیخوێنیتەوە، بۆ ئەوەی بزانیت چیت گوتووە؟ ئێستا یەک دوو پرسیار لە ئاستی گوتەکانتدا دەکەم، بەڵام دوایی بە وردی لەسەر ئەو چەمکە دەوەستم و پێشانت دەدەم لە چ ئاستێکدا نووسیوتە. چۆن پرسیار هێزی خۆی لە شتێک وەردەگرێت، کە هێشتا نەهاتووەتە دی؟ تۆ خۆت نەتگوت سەرەتا پرسیار هەیە، ئینجا وەڵام؟

ئەگەر دوای ئەوە دەستت هەڵبگرتایە، هێشتا باشتر بوو، بەڵام هاتوویت ئەمەیشت خستووەتە سەر: (پرسیار هێز و گرنگی و بایەخی خۆی لە وەڵامەوە وەردەگرێت).

باشە، ئەمە هەمان گوتەکەی پێشووت نییە؟ تەنیا ئەوەی زیادە دوو وشەی (گرنگ) و (بایەخ)ی خراوەتە سەر، کە هەتا ئەو کاتەی منیش وازم لە بڵاوکردنەوە هێنا، ئەو دووانە یەک مانایان هەبوو. لەوە دەچێت ئەمڕۆ دنیا گۆڕا بێت. گۆرانیبێژێک

لە سەرەتای شەڕی عێراق و ئێراندا ئەم گۆرانییەی دەگوت: (میللەت بە تۆ سەربەرزە، لەم خاک و خۆڵ و ئەرزە). هەرسێکیان یەک مانایان هەیە. ئەوەی تۆ لە ئاستی زمانی ئەم گۆرانیبێژە میللییەت تێ پەڕاندووە، چییە؟ خاڵێکی هاوبەشی تری نێوان تۆ و ئەو گۆرانیبێژە ئەوەیە، کە ئەویش جارێک دەیگوت: (ماڵم بۆت، ماڵم بۆت، ماڵم بۆت فیدا دەکەم) و جارێکی تر: (ماڵت بۆم، ماڵت بۆم، ماڵت بۆم.....). دەشێ ئەمە سروشتی زمانی میللی بێت، کە هەر کەسێک تێی نەپەڕێنێت، بەم شێوەیە بێتە دەنگ. شتێکی نوێ نییە لە تۆدا ئاوا دوو وشەی هاوواتا پێکەوە بە کار ببەیت. لە گوتارێکتدا (ئیقاع) و (ریتم)ت لە تەنیشت یەکتر ڕیز کردبوو. من لە نامەدا پێم گوتیت ئەمانە هەردووکیان یەکن، بەڵام هێندە هەیە یەکەمیان عەرەب بە کاری دەهێنێت و ئەوەی تریان لە زمانەکانی خۆرئاوادا باوە. لەو بارەیەوە گوتارێکم بۆ نووسیت و لەم ڕووەوە ناوی چەند سەرچاوەیەکم تێدا هێنا، کەچی تۆ نەک هەر ددانت بەوەدا نەنا هەڵەیە، بەڵکوو پاساوت هێنایەوە و شتێکت گوت، کە بە هەموو مانایەک پێکەنیناوییە. نامەکەی تۆ و ئەوانەی خۆیشمم لا ماون. دەتوانی گوتارێک لەو بارەیەوە بنووسیت و بە خوێنەر بڵێیت ئەمانە چۆن لە یەکتر جیاوازن؟ هیوادارم ئەوەی بۆ منت نووسیوە، دووبارەی نەکەیتەوە، چونکە نووسەرێک گۆڤارێک بە ناوی (شیعر) دەربکات و ئەو وشانەی لە دەم بێنە دەرێ، ئەوا خوێنەری زۆر ساکاریش

دەتەزێنێت. من لێرەدا دەپرسم: ئایا ڕەخنەگرێک هێشتا نەیزانیبێت (ئیقاع) و (ریتم) هاوواتان، دەبێت ڕێگە بە خۆی بدات بڵێ کێ شاعیری داهێنەرە و کێ شاعیری قۆڕنووسە؟ (قۆڕنووس، ئەو وشەیەیە، تۆ بۆ شاعیرێکت بە کار هێناوە. مرۆڤ ڕۆژانە لە کۆڵان و بازاڕدا هەمان وشەی گوێ لێ دەبێت).

بۆ ئەوەی وای لێک نەدەیتەوە من دژی بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانەم، ئەوا دەڵێم و پێشتریش گوتوومە لە ئەدەبدا، بەتایبەتی لە ئەدەبی گێڕانەوەدا نووسەر دەتوانێت ئەم وشەیە و سەدانی تری وا بە کار بهێنێت. (باختین) پێی لەسەر دادەگرێت ڕۆمان وەک پارلەمان وایە و پێویستە دەنگی هەموو کۆمەڵگە لە خۆی بگرێت. یەکێک لەو خاڵانەی وای لێ کردووە (دۆیستۆیڤسکی)ی بە لاوە گرنگ بێت و بە داهێنەری شێوازی ڕۆمانی فرەدەنگی (پۆلیفۆنیPolyphony)ی دابنێت، ئەوەیە، توانیویەتی زمانی ڕۆژانە و دیالێکتە پەراوێزخراوەکان لە ڕۆماندا بە کار بهێنێت. هەروەها لەبەر هەمان مەبەست بایەخ بە (فرانسوا ڕابلێ)ی ڕۆماننووسی فرانسییش دەدات، تەنانەت (ڕابلێ) بە کلیلێک دەچوێنێت بۆ کردنەوەی دەرگەی خەزێنەی ئەدەبی گاڵتەجاڕیی میللی.([٤٨]) بەڵام ئەمە لە ڕەخنەدا تەنیا نیشانەی بێئاگاییە و بە مەبەستی سڕینەوە کراوە. ئەم

---

[٤٨] http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٠/٣/karwan_bakhtyar.htm

شێوازەی تۆ، کە لە هەندێک گوتاردا، ناڵێم لە هەمووی، گرتووتتە بەر، گەڕانەوەیە بۆ پێش سالانی حەفتا، چونکە لەو ساڵەوە لانی کەم هەندێک نووسەری داهێنەر ئەمەیان تێپەڕاند و وەک شێوازێکی لەکەڵککەوتووی بەسەرچوو لێیان ڕوانی، کە ئەدەبی ڕوانگە و ئەدەبی گرووپە ئەدەبییەکانی تر بەرهەمی ئەو تێگەیشتنە نوێیەن. کۆمەڵێک دەنگی داهێنەر هەر لەو تێگەیشتنەوە سەریان دەرهێنا و گۆڕانکارییان لە کەلتوورماندا کرد. لە سەرەتای نەوەدەکان و دواتریشدا چەند داهێنەرێکی تر دەرکەوتن و ئەوانیش بە شێوازی خۆیان بیرکردنەوە و نووسینیان بە قۆناغێکی دیکە گەیاند، کە ئەو پرۆسەسە تاکوو ئەمڕۆیش لەلایەن هەندێک لاوی داهێنەرەوە دەچێتە پێشەوە.

تۆ جارێکی دیکە لەو گوتارانەتدا بۆ قۆناغی پێش حەفتا گەڕایتەوە و توند دەستت بەو شێوازە کۆنە گرتەوە، چونکە زۆر ئاسانە و بە هەموو کەس دەکرێت، تەنانەت شێوازی ئەوانەیش، کە لە سەرەتای حەفتاکاندا ڕەخنەیان لە ڕوانگە دەگرت، لەم شێوازەی تۆ جیاوازە. ئەوەی تۆ هێشتا زۆری ماوە بێتەوە ئاستی ڕەخنەی حەفتاکان، بگرە ماویەتی بگاتەوە ئەوەی چەند ساڵێک لەمەوبەری خۆت، کە بەردەوام گوتوومە بەرهەمی تری جیاوازت هەن. وەک بەردەوامیش گوترا تەنیا هێندە هەیە گوتەی فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزانت تێ ئاخنیوە، کە

لەم نووسینەدا دەردەکەوێت ئەو گوتانەت چین و چۆن بە کار هاتوون. دەتەوێت لەم ڕووەوە گفتوگۆیەکی تایبەت بکەین؟

لە وەسفی پرسیار بەردەوامیت و دەنووسیت: (هیچ پرسیارێکی گرنگ نییە، وەڵامێکی گرنگی نەبێت). ئەرێ تۆ نەبوویت گوتت: (پرسیار هێز و گرنگی و بایەخی خۆی لە وەڵامەوە وەردەگرێت)؟ دەتوانیت ئەو دوو شتە بۆ من نا، بەڵکوو بۆ خۆت ڕوون بکەیتەوە؟ ئەرێ با هەر لە ئاستی میللیدا بپرسین ئاخۆ ڕاستە هەر پرسیارێکی گرنگ وەڵامێکی گرنگی هەیە؟ وەڵامەکەیش بە (ئا) بێت، یان بە (نا)، هەر یەکە و شتێکی نوێی لێ بەرهەم نایەت.

بزانین ئەمجارە چیی تری لەم بابەتە دەنووسیت: (بەڵام زۆر پرسیاری سادە و ناتەواو هەیە، کە دەشێت دەیان وەڵامیان هەبێت). وەک سەرنجێک: من وشەکانت وەک خۆیان دەنووسمەوە، کە پڕن لە هەڵەی دەربڕین. واتە هەڵەی گراماتیکەڵ، بەڵام نامەوێت ڕاستیان بکەمەوە، مەگەر خۆت داوام لێ بکەیت. بێگومان خوێنەری هۆشیار هەستیان پێ دەکات، چونکە زۆر زەقن. ئایا ئەو ڕستەیە هیچ شتێکی گرنگ بە خوێنەر دەڵێت؟ ئەگەر پرسیارێک، دەیان وەڵامی هەبن، بۆ سادەیە؟ ئەوە چ خوێنەرێکە دایکوباوکی ڕێگەیان داوە بچێتە دەرێ، بێ ئەوەی فێری ئەوەیان کردبێت لە دەقەیەکدا حەوت دێڕی وا هەر بۆ خۆشی بنووسێت؟

باسەکە لەبارەی پرسیارەوە درێژ دەکەیتەوە و دەڵێیت: (بۆیە دیسان پێداگیری دەکەمەوە ئەوەی گرنگە پرسیار نییە، چونکە دەشێت زۆر جار پرسیاری ناتەواو و ناکامڵ وەڵامی گرنگیان هەبێت و کەسێک بتوانێت وەڵامی گرنگی بداتەوە).

(ناتەواو) و (ناکامڵ) هاوواتان، بەڵام بۆ ئەوەی داڕشتن (ئینشا)کە درێژ بکرێتەوە و نمرەی بەرز بهێنێت، هەردووکیان بە کار هاتوون. با بڵێین ئەو قسەیە لە ئاستی میللیدا دروستە و خەڵکی تریش وایان گوتووە، بەڵام چییە؟ لەسەر ئاستی فەلسەفیدا چ ئاڕاستەیەکی هەیە؟ ئایا کێ هەیە لە گەڕەک دەیان جار ئەمەی گوێ لێ نەبووبێت؟ ئەوەی گرنگە پرسیار نییە، بەڵکوو وەڵامە؟ پرسیاری ناتەواو و ناکامڵ چۆن وەڵامی گرنگیان هەیە؟ دەبێت وەڵامەکان هیی ئەو پرسیارە ناتەواو و ناکامڵانە نەبن، دەنا چۆن وەڵامی گرنگ دەسەپێنن؟ ئەگەر وەڵامی گرنگیان هەیە، بۆچی ناتەواو و ناکامڵن؟

لەم گوتارەدا پرسیار جارێک گرنگە و جارێک گرنگ نییە. وەڵام جارێک گرنگە و جارێک گرنگ نییە. تۆ خۆت سەرت لەوە دەردەچێت؟

هەموو ئەمانە لەپێناوی چیدا نووسراون و ویستووتە بە کوێ بگەیت؟ ئێستا دەستی دەخەمە سەر. نووسیوتە: (بۆیە هەموو ئەو نووسەر و چیرۆکنووسانە لافی ئەوە لێدەدەن کە دەتوانن

بێشوومار پرسیار بکەن ئەوە جگە لە ئیفلاسێکی فیکری بوون هیچ تەفسیرێکی تر چاوەڕوانیان ناکات).

کاتێ دەڵێین (نووسەر)، ئەوە مەبەستمان (چیرۆکنووس)یشە، بۆیە دووەمیان پێویست نییە، بەڵام لە داڕشتندا ئاساییە، ئەگەر بەردەوام وشەی هاوواتا بە کار ببەیت. گرنگ ئەوەیە گوتارەکە درێژ ببێتەوە. ئەگەر لێم بپرسن لە پرۆگرامی قوتابخانەدا چ وانەیەک لا ببررێت، ئەوا کۆمەڵێک هەڵدەبژێرم، کە یەکێکیان داڕشتنە، بەوەی مرۆڤ ناچار دەکرێت دوور لە ویستی خۆی شت بڵێت، لە کاتێکدا هیچی لەو بارەیەوە پێ نییە. ئەمەیش بە هەموو مانایەک چەوسانەوەیە. بەڵام ئەگەر نووسەرێک خۆی ئەوە بەسەر خۆیدا بسەپێنێت، وەک ئەوەی تۆ کردووتە، ڕەنگە نەزانم بڵێم چی.

لەبارەی پرسیارەوە کۆمەڵێک وشەی ترت بەدوای یەکدا ڕیز کردوون، کە پێویست نییە لەوە زیاتر بیاننووسمەوە، بەڵام ئەگەر خۆت جارێکی تر ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگریتەوە و گوتارەکەت بڵاو بکەیتەوە، سوپاست دەکەم.

یەک شت ماوە هەر لێرەدا ئاماژەی پێ بدەم، ئەویش ئەم دوو دێڕەیە: (منداڵ ڕۆژانە بە دەیان پرسیار دەکات، بەڵام زۆر بەکەمی پرسیاری منداڵ بنەمایەکی وشیاربوونی هەیە، بەڵکوو عەفەویانە، یان لە خۆوە دەیانکات و بەنیازی فێربوونە). دیارە

عەفەویانە مانای وایە (لە خۆوە دەیانکات)، بەڵام لە دارشتی قوتابخانەدا ئاساییە، چونکە ئامانجەکە هێنانی نمرەی بەرز و دەرچوونە لەو پۆلەی تێیدایت. ئایا ئەوەی لەبارەی منداڵەوە گوتووتە، هەر بە مانا شەعبییەکەیشی دروستە؟

بەر لەوەی بچمە ناو باسەکە و چەمکی پرسیار ورد بکەمەوە، دەپرسم بۆچی پشتت بە ڕای یەکێ لە فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزەکان نەبەستووە، لە کاتێکدا وا ڕاهاتوویت لە گوتارەکانی تردا ناویان دەهێنیت؟ ئایا ئەوان لەو بارەیەوە هیچیان نەگوتووە؟

دەتوانی ناوی یەک نووسەری خۆمانم پێ بڵێیت، کە ئەم گوتارەتی بەسەردا تێپەڕی و ئافەرینی لێ کردیت؟ یان هیوادارم ئەگەر نووسەرێکی وا هەیە، بێت و بە ئاشکرا بڵێ ئەوانەی تۆ لەبارەی پرسیارەوە گوتووتن، لە چەند وشەیەکی ساکار زیاترن. ئەو نووسەرە لەو بارەیەوە هەر بۆچوونێکی هەیە، بە خۆشحاڵییەوە گوێی لێ دەگرم. دیارە لێرەدا مەبەستم ژمارەی ئەوانە نییە، کە ئەم گوتارەت بە چاک، یان بە خراپ دەزانن، بەڵکوو مەبەستمە بپرسم چ خوێنەرێک هەیە، ئەمانەی بەسەردا تێ دەپەڕێت؟

بە بڕوای من چاکترین تاقیکردنەوە بۆ هەر ڕەخنەگرێکی میللی، ئەوەیە، کەسێکی موفلیس بهێنێت (موفلیس بەو مانایەی

خۆی بۆی هەیە) و پێی بڵێت گوتارێک بنووسە! ئەگەر ئەو موفلیسە توانی وەک ئەو بنووسێت، ئەوە مانای وایە هێشتا خاوەنی هیچ داهێنانێک نییە. خۆ ئەگەر گوتارەکەی ئەو موفلیسە هەر کەمێکی لە هیی ئەو تێپەڕاند، ئەوا کرێدیتەکەی بە ماینەس دەردەکەوێت. واتە قەرزار دەبێتەوە و پێویستە پڕی بکاتەوە. هەر کاتێ بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە پێویستت بە موفلیس بوو، بە فیکەیەک لاتم، جگە لە ئێوارانی چوارشەممە، کە لە یانەی موفلیسان کاتم بە سەر دەبەم. پرینسیپی یانەکەیشمان وایە ڕێگە نادرێت لەو چەند سەعاتەدا، یەک پرسیار بکەین، چونکە دەڵێن کاتی پشووە و نابێت ژیانی ئێش و ژیانی سەرگەرمی تێکەڵ بکرێن.(LOL) (پێم خۆشە بەو مەبەستەی جاروبار لەو دۆخە گرژییە دوور بکەوینەوە و تۆنەکە بگۆڕیت، هەندێک قسەی لەم بابەتەی بهێنمە ناو).

هەروەها دەمەوێت خوێندنەوەیەکی سەرەتاییی خۆمت لەبارەی ئەم گوتانەوە پێ بڵێم. دوای ئەوەی ئەو شاعیرە ئاماژەی بەوە داوە، کە پێشتر من پرسیارم کردووە و بە پرسیار ڕووبەڕووی نووسەران بوومەتەوە، ئەوە تۆ ویستووتە بە هەر شێوەیەک بێت پرسیار بێنرخ بکەیت، بۆیە خۆیشت نەتزانیوە چی بڵێیت. ئایا پرسیار باشە، یان خراپ؟ وەڵامەکەیت لا ڕوون نییە. هەردووکیانت لێ تێکەڵ بوون. ئەمەیش بۆیە دەڵێم، چونکە دەزانم ڕوانینی تۆ هەمیشە بەم

شێوەیە نەبووە. ئەم دوو گوتارەت لە سەرجەم بەرهەمەکانت جودا دەکەمەوە.

لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا (ڕزگار عەبدوللا)، (سەفین سابیر)، (کەمال عوسمان) و من بووین دەچووینە زەماوەندێک. بە کوڕێک گەیشتین، کە بەرخێکی جوانی لەگەڵ بوو. (سەفین) گوتی:

بەرخەکەم نەرمونۆڵە
پەروەردەی هەرد و چۆڵە
لە یاری توندوتۆڵە
گوێی قوتە و پشتی بۆرە
وریایە و فێڵی زۆرە
بە دانی تیژ گاز دەگرێ
ئەتوانێ ئێسقان ببڕێ

هێشتا نەیزانیبوو بەرخ و سمۆرەی تێکەڵ کردووە، بەڵام لەناکاو گوتی: (ئەی سمۆ....) و وەستا.

ئێمە لە قاقای پێکەنینمان دا. دوایی من گوتم:

سمۆرەکەم وەک بەرخە
چاوە تیژەکەی چەرخە

(سەفین)ی هاوڕێی منداڵیم هەتا ئەو کاتەی شاری جێ هێشت و چووە شاخ، بە منی دەگوت ئەو میکسەی بۆ بڵێمەوە. (کەمال) تاکوو ئەمڕۆیش بەوە پێدەکەنێت. جیاوازییەکە ئەوەیە تۆ هێشتا نەتزانیوە هەردووکیانت لێ تێکەڵ بوون. خۆ تێکەڵیش نەبوونایە، هەمان شت بوو. ئایا ئەگەر بە بەرهەمەکانی پێشووتدا بچیتەوە، چەند جار ئەوەت بەر چاو دەکەوێت، کە گوتووتە پرسیار گرنگە؟ ئەوە چ خوێنەرێکە دەستی لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی خۆی هەڵگرتووە و بە نووسەرێک باوەڕ دەکات، کە لە یەک گوتاردا جارێک دەڵێ پرسیار گرنگە، بێ ئەوەی بڵێ بۆچی و جارێکی تر دەڵێ پرسیار نرخی نییە، بێ ئەوەی بڵێ بۆچی؟ کەڕەتێکیش تێکەڵیان دەکات، دیسان بێ ئەوەی بڵێ بۆچی؟ ئەوە چ دەستگەیەکی چاپەمەنییە ماوەیەکی تر ئەم گوتارە لەگەڵ کۆمەڵێکی هاوشێوەی لە توێی کتێبێکدا چاپ دەکات و وەک ڕەخنە بە خوێنەری دەفرۆشێت؟

(ئەدۆرنۆ) لە یەکێ لە لێکچەکانیدا ئەوە بە قوتابییان دەڵێت: پێویستە بە وردی لەسەر ئەو چەمکانە بوەستن، کە دەیانخوێننەوە، دەنا ناتوانن لێیان تێبگەن. دەڵێ با وای دابنێین قوتابی دەیەوێت لە فەلسەفەی (سپینۆزا) بکۆڵێتەوە، بێ ئەوەی لەبارەی مەبەستی فیلۆسۆفانی سەدەی حەڤدەمەوە تێگەیشتنی پێشینەی هەبێت، یان لەبارەی بیرۆکەی گونجانی هەردوو

دنیای زەینی و فیزیایی خۆی ئامادە کردبێت، بۆ ئەوەی لەبارەی بیرۆکەی سیستەمی گەردوونیی سەدەکانی ناوەڕاستەوە ئاگاییی هەبێ، ئەوا ناتوانێت لە بیرۆکەی یەکێتیی بوون بگات، کە (سپینۆزا) گوتوویەتی.(٤٩)

ئایا ڕەخنەگری میللی، کە لە سەرچاوەی حەوتەم و هەشتەمەوە گوتەی فیلۆسۆفێکی دەکەوێتە بەر چاو و تێکهەڵکێشی نووسینە سادەکەی خۆی دەکات، لە هەموو ئەوانە گەیشتووە؟ ئایا بە ڕاستی لە نزیکەوە گوتاری یەکێکیانی دیوە؟

---

[٤٩] تیودور فون ادرنو، محاضرات في علم الاجتماع، ترجمة جورج كتوره، مركز الانماء القومي، بيروت، بلا سنة الطبع، ص٨٢

# ڕەخنەگری میللی و
# فرێدانی چەمك و وشە

هەر بەگشتی ڕەخنەگرە میللییەکان بەم شێوازە دەنووسن، بەڵام وەک گوترا بۆ ئەوەی خوێنەر فریو بدەن، هەندێک چەمک و گوتەی نووسەرانی تر دەئاخننە نێوان گوتە بێگیانەکانی خۆیانەوە، کە من یەکێکم لەو خوێنەرانەی گومانیان لە نووسینیان هەیە، بەڵام نایشارمەوە ڕۆژگارێک منیش وام دەزانی ئەوانە لە ئاستێکی تردان. هەندێک نووسەر وشەکە چەند سادە بێت، گەورەی دەکەن. لە سەرەتای هەشتاکاندا، کە تازە شەڕ دەستی پێ کردبوو. ناسیاوێکمان کوردستانی جێ هێشت و چووە بۆلگاریا، تاکوو لەوێوە خۆی بگەیەنێتە سوێد. لە نامەیەکیدا نووسیبووی (گێڤریکێکم کڕیوە)، کە جۆرە نانێکی، یان کەیکێکی هەرزانە و منداڵە هەژارەکان دەیفرۆشن، کەچی دایکی دەگەیشتە هەر شوێنێ دەیگوت

کوڕەکەی گیڤریکێکی نوێی کڕیوە. ڕۆژێکیان پیاوێکی ناسیاومان، کە ئەویش بە هەمان شێوەی ئەم شتی زۆر بچووکی گەورە پێشان دەدا، گوتی: هێندەی من بزانم گیڤریک زۆر گرانە، تەنانەت لە ئەورووپایش هەر دەوڵەمەندە گەورەکان دەوێرن خۆیانی لێ بدەن، ئەوە کوڕەکەت ئەو پارەیەی لە کوێ هێناوە؟ ژنە بە فیزێکەوە گوتی: خۆی هەندێکی هەبوو و هاوڕێکانیشی لە ئەورووپاوە هەندێکیان بۆ نارد. کەس نەیدەوێرا لێی بپرسێت گیڤریک چییە، هەتا ڕۆژێک منداڵێک پرسیی. ژنە دەمی تێک ئاڵا و دەیویست بە دەست و بە قاچ ئاماژەی پێ بدات، بەڵام بۆی نەدەکرا.

ئەگەر لە یەکێ لەو ڕەخنەدۆزانە بپرسیت (ئۆنتۆلۆجیا) چییە، ئاخۆ وەڵامەکەیان چی بێت، لە کاتێکدا لای ئەو فیلۆسۆفانەی خۆیان بۆ تەرخان کردووە و لەو بارەیانەوە نووسیوە، قورسە؟ هەروەها لەو نووسینەتدا، کە لەبارەی ئەو شاعیرەوەیە، ئەو چەمکەت فڕێ داوە. دەتوانی بە خوێنەری بڵێیت ئەمە مانای چییە؟

گوتەیەکی (هایدیگەر)یشت هەر بۆ ناو نووسینەکەت گوێزاوەتەوە. دەکرێت من وەک خوێنەرێک بزانم: یەکەم، مەبەستت لەو گوتەیە چییە؟ دووەم، چ پێوەندییەکی بەم گوتانەی خۆتەوە هەیە؟ سێیەم، (هایدیگەر) ئەمەی لە چ کۆنتێکستێکدا بە کار هێناوە؟

ئایا دەبێت تۆ دەیان وشەی وەک (قۆڕنووس)، (تورەهاتنووس) و شتی لەم بابەتە بنووسیت و لەناکاو گوتەیەکی (هایدیگەر)یشی تێ بئاخنیت؟ (هەر ئەو هاوڕێیەم لە تەلەفۆن بەشێکی گوتارەکەتی بۆ خوێندوومەتەوە، کە دەڵێم بە هەموو مانایەک کارەساتە).

من ئەو گوتەیەی (هایدیگەر)م لە بیر نەماوە چییە، کە تۆ لەوێت فڕێ داوە، بەڵام لام ڕوونە ناتوانیت وەڵامی ئەو سێ پرسیارەم بدەیتەوە، چونکە دەزانم (هایدیگەر) لەو نووسەرانە نییە، گوتەی لێرە و لەوێ وەربگیرێت، بەڵکوو بەسەرتدا دەسەپێت خۆی بخوێنیتەوە و ئەوانەیش لەگەڵی، کە لەبارەیەوە نووسیویانە، وەک (گادمێر) بە نموونە. ئەمە کەمکردنەوەی توانای تۆ نییە، بەڵکوو بەئاگاهێنانەوەی ئەو توانایەتە. بۆ ناچیت وەک سەرەتایەک (سەرچاوەی کاری هونەری: The Origin of the Work of Art)ی ئەو فیلۆسۆفە بخوێنیتەوە، تاکوو بزانیت لەبارەی شیعرەوە چیی گوتووە؟ ئامادەم بە خۆشحاڵییەوە ئەو ئەزموونەی خۆم، کە لە خوێندنەوەی ئەو کتێبەدا بە دەستم هێناوە، بخەمە بەر دەستت، بەو مەبەستەی سوودی لێ ببینیت. دەتەوێت؟

تۆیەک هێشتا پێت وا بێت ڕەخنە بریتییە لە هەڵسەنگاندنی بابەت بە چاک، یان بە خراپ، کە من ناوم ناوە پێوەری (چوخ)، زۆر لەوە دووریت باسی فەلسەفەی (هایدیگەر) بکەیت. تۆی

نووسەری ئەم دوو گوتارە، تۆی نووسەری ئەم ڕستە سەیرانە (هایدیگەر) دەناسیت؟ کتێبەکانیت بە وردی خوێندوونەتەوە، کە لای فیلۆسۆفان قورسن؟ ئەو فیلۆسۆفە لەبارەی دێڕێک شیعری (تراکل)ـەوە دەڵێت: ئازار نە باشە و نە خراپ، بەڵکوو دیاریی قووڵاییە، کە هەموو ئامادەییەک دادەپۆشێت. ئازار سەرچاوەی ئەو شیعرەیە، کە (تراکل) دەیڵێت. شیعر یەکێتیی سروود (انشاد)ی نێوان تراجیدیا و داستانە، چونکە ئازار کاتێ ئازارە، ئەگەر بڵێسەی ڕۆح

ئایا دەبێت ڕەخنەگرێکی وەکوو تۆ گوتەی فیلۆسۆفێک لە کونجی کتێبێکی بازرگانییەوە هەڵبگرێت و بیئاخنێتە ناو گوتە میللییەکانی خۆیەوە، بێ ئەوەی بزانێت مانای چییە؟ لات وایە ئەمە بەسەر خوێنەری پرسیارکەردا تێدەپەڕێت؟

(ئیسماعیل ئەلمسەدەق) هەردوو بەشی کتێبی (مارتن هایدجر، کتابات اساسية)ی لە ئەڵمانییەوە کردووەتە عەرەبی و لە پێشەکییەکەدا باس لە سەختیی تێگەیشتنی بەرهەمەکانی ئەو فیلۆسۆفە دەکات، بەوەی هەم پەنا بۆ وشەی یۆنانی و لاتینی دەبات، هەم وشە ئەڵمانییەکانیش لە کۆنتێکستی تر و بە مانای تری جیاواز لەوەی ناسراون، بە کار دەهێنێت. باسی ئەوە دەکات چەند پرۆفیسۆری ئەڵمان یارمەتییان داوە، تاکوو لێیان

---

[٥٠]مارتن هيدجر، انشاد المنادي، (قراءة في شعر هولدرلن وتراكل)، تلخيص وترجمة بسام حجار، المركز الثقافي العربي، بيروت، الطبعة الاولى،١٩٩٤، ص٣٠

تێبگات. پرسیار ئەوەیە ڕەخنەگری ئێمە چۆن، کەی و لە کوێ لە (هایدیگەر) گەیشت، تاکوو ئاوا بە ئاسانی تێهەڵکێشی زمانی میللیی بکات؟ چۆن ئاوا تێرمێکی قورسی وەک (ئۆنتۆلۆجیا) وێنەی پەشمەک لەسەر زاریدا دەتوێتەوە؟ خوێنەری هۆشیار هەست دەکات ئەو وەرگێڕە لەو فیلۆسۆفە گەیشتووە، نەک لەبەر ئەوەی ئەو دوو بەشەی وەرگێڕاوە و ئەو پەراوێزانەی بۆ نووسیون، بەڵکوو لەبەر ئەوەیش لە زمانەکەیدا ڕەنگی داوەتەوە، لە زمانی پێشەکییەکەیدا. لە بەرهەمەکانی خۆیشیدا، کە زۆریانم خوێندووەتەوە.

ئەگەر ڕەخنەگری ئێمە لە (هایدیگەر) گەیشتووە، بۆچی بە زمانی میللی دەنووسێت؟ نووسەرە داهێنەرەکانی ئێمە، ئەوانەی تەنانەت زمانی ئەڵمانییش دەزانن، کەم خۆیان لە (هایدیگەر) داوە، چونکە دەزانن ئاسان نییە، کە ئەمە لە زمانی عەرەبی، بگرە لە زمانی دانمارکی و ئینگلیزییشدا تا ڕادەیەکی زۆر وایە. ئێمە لە ئامادەیی و لە زانکۆدا کتێبەکانی (سارتەر) و (کامیۆ)مان دەخوێندەوە و بەشی خۆمان لێیان تێدەگەیشتین، بەڵام کەسمان جورئەتمان نەدەکرد بە لای (هایدیگەر)دا بچین، چونکە دەمانزانی سەختە. لەبەر ئەوەیش بوو کەم خوێنەر دەیزانی (هایدیگەر) هەر فیلۆسۆفە، بەڵکوو لە ڕێگەی ڕەخنەگری میللییەوە وا تێگەیشتبوون سەربازێک بووە لە سەربازەکانی (هیتلەر)، کە ڕەخنەدۆز و مێژوونووسانی فیکر

به ڕوونی دەریان خستووە هیچ پێوەندییەک لەنێوان ئەو دووانەدا نییە. بۆچی ڕەخنەگری میللی ناوی (هایدیگەر) زیاتر لە ناوی فیلۆسۆفەکانی دیکە دەهێنێت؟ پرسیارەکە بە کراوەیی جێ دەهێڵم.

پێم وایە ئەگەر نووسەرێ لە کۆلانێکدا بانگەشەی ئەوە بکات (هایدیگەر)، یان هەر یەکێ لەو فیلۆسۆفانەی تر دەناسێت و دووکاندارەکەی بەرانبەری، کە هەمیشە دووکانی کراوەیە، لە حەفتەیەکدا چوار جاری لە دەرەوە ببینێت، ئەوە من لای خۆمەوە لە ڕاستگۆیی ئەو نووسەرە دەکەومە گومانەوە. ئینجا وەرە ئەو نووسەرە دوو سێ دەوامی لە دامودەستگەکاندا هەبێت و بەشێکی کاتی لە تۆڕە کۆمەلایەتیەکانی وەک فەیسبووک و ئەوانەی تردا بە سەر ببات! ئینجا وەرە ئەو نووسەرە حەفتەی چەند گوتارێک بنووسێت! ئەوە هەر ناچێتە عەقڵمەوە یەک کتێبی ئەو فیلۆسۆفانەی لە دووریشەوە دیبێت. (دیارە دەزانم بەشێکی نووسەران لە کوردستان بۆ پەیداکردنی بژێویی خۆیان، ناچار دەبن زیاد لە توانای خۆیان کار بکەن، کە ئەمەیان بۆ بە خەوش ناگرم، وەک چۆن هیچ کێشەیەکم لەگەڵیاندا نییە، ئەگەر بەشێکی ڕۆژەکەیان لە تۆڕە کۆمەلایەتییەکاندا بە سەر ببەن، بەلام نووسەرێک کاتی نەبێت بخوێنێتەوە، مەرجە وا خۆی پێشان بدات بووەتە ڕووناکبیری گەورە؟) پێویستمان بە

شایەتیی دووکانداری وریا و چاوکراوە نابێت، ئەگەر خۆمان ویستمان سەرنج لە زمانی ئەو نووسەرە بدەین، ئاخۆ هەمان ئەو زمانەیە، کە سەرجەم دانیشتووانی گەڕەک پێی دەدوێن، یان جیاوازە و لە ئاستێکی بەرزتردایە.

ئەگەر فیکری هەر نووسەرێکی گەورەی دنیا شتێک لە ئاستی ئەو زمانەمان بەرز نەکاتەوە، کە پێی لە دایک بووین، مانای وایە نەمانخوێندووەتەوە، با لە هەر گوتارێکماندا حەوت جار ناویمان هێنابێت. من تاکوو درافتی ئەم بابەتەم نووسی، لانی کەم یەک مانگ نەمتوانی تەلەفۆن بۆ کەسە نزیکەکانم بکەم.

# ئایا من ویستوومە لە نووسین و خوێندنەوەت دوور بخەمەوە؟

ڕاستییەکەی ددانی پێدا دەنێم ویستوومە لە نووسینت دوور بخمەوە، بەڵام لە خوێندنەوە نا، بەڵکوو هەوڵم داوە وات لێ بکەم زیاتر بخوێنیتەوە. بە درۆم بخەرەوە ئەگەر لە نامەدا مژدەت پێ نەداوم، کە دوای ئەوەی چەند نامەیەکم بۆ نووسیویت، کەمتر لە جاران دەنووسیت! دیسان بە درۆم بخەرەوە، ئەگەر خۆشحاڵیی خۆمم دەرنەبڕیبێت و ئافەرینم لێ نەکردبێتی! ئێستایش پێم خۆشە مژدەیەکی تری وام پێ بدەیتەوە و بیبەیتە سەر، چونکە ئامانجی ئەم دایەلۆگە، ئەوەیە. ئایا ئەگەر تۆیەک چەمکی (مەرگی نووسەر) بە مانا میللیەکەی بە کار بهێنیت و من بێم لەپاڵ ئەوەی لەبارەیەوە پرسیارت لێ بکەم، کۆمەڵێک زانیاریی گرنگیشت هەر لەو بوارەدا بۆ بنووسم و ناوی چەند سەرچاوەیەکت پێ بڵێم، لە خوێندنەوەت

دوور دەخەمەوە؟ لە خوارەوەدا کاتێ خوێنەر بەشێک لەو نامەیەم دەخوێنێتەوە، چاکتر لە هەردووکمان تێدەگات. تۆ لە گوتارێکتدا بۆ ئەوەی بیسەلمێنیت سەگ گلاوە و سووکایەتییە نووسەر مرۆڤ بە سەگ بچوێنێت، پەنات بۆ ئەو چەمکە بردووە، کە لە ڕاپەڕینەوە زۆر نووسەری تری ئێمە بە کاریان هێناوە، بێ ئەوەی هەندێکیان هەر ئاگایان لە وردەکارییەکانی بێت. واتە تۆ ئەو گوتە ساکارەت کۆپی کردووە. منیش لێم پرسیویت ئەمە مانای چییە و لە کوێت هێناوە. دیارە نووسەرەکە من نیم، کە باسی سەگی کردووە، بەڵکوو یەکێکی ترە. ئەمە دەبووایە پێت بڵێت من تەنیا مەبەستم گفتوگۆیە. بێگومان ویستوویشمە بزانم ئەو نووسەرەی من بەو ڕەهاییە ڕەت دەکاتەوە، تێگەیشتنی چۆنە. ئایا توانیت لەو چەند وشەیە زیاتری لەبارەیەوە بڵێیت؟ من ئەمەم بۆ نووسیویت:

{با هەر لە سەرەتایشەوە پێت بڵێم تێگەیشتن لە (بارت) وەک تێگەیشتن لە هەر یەکێ لەو ڕەخنەگر و ڕووناکبیرانەی تری وەک (شتراوس)، (فۆکۆ)، (لاکان) و (دێریدا)، کە (جۆن سترۆک) لە کتێبی سترەکچەرالیزم و پۆستسترەکچەرالیزم لە لیڤی ستراوسەوە تاکو دێریدا)دا پێی لەسەر دادەگرێت، قورسە. من یەکێک نیم لەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن لێیان تێگەیشتوون، بەڵام خۆشبەختانە ئەو ڕاستییە دەزانم و نایشارمەوە. بەهەرحاڵ هەوڵ دەدەم لە سنووری تێگەیشتنی

خۆمدا وێنەیەک لەبارەی مەرگی نووسەرەوە بخەمە ڕوو، بەو مەبەستەی پێت بڵێم تۆ نەک هەر ئەو گوتەیەت بە دروستی بە کار نەهێناوە، بەڵکوو خۆت تووشی دژایەتییەکی سەیریش کردووە، کە ئەمە تەنیا ئەوە دەگەیەنێت وەک زۆربەی ئەو نووسەرانەی لە خۆیانەوە دەست بۆ چەمکەکان دەبەن و شتی سەیروسەمەرەمان بۆ دەنووسن، ئاوا شتێکت پێ گوتووین نەک سادەیە و لە ڕەخنەگرێک ناوەشێتەوە، بەڵکوو هەر نابێت بیرکردنەوەی مرۆڤێکی ئازادیش بێت. ڕەخنەگرێکی وەک (جۆن سترۆک) لەو کتێبەی ئاماژەمان پێ دا، دەڵێت بیرۆکەی تێکستی بێنووسەر بیرۆکەیەکە بۆ هەموومان ئەستەمە قەبووڵی بکەین، کەچی نووسەری ئێمە وەک چۆن پەندی شەعبی لە گوتاردا بە کار دەهێنێت، ئاوا باس لە (بارت) و هەر فیلۆسۆفێکی تر دەکات! لەولایشەوە کەلتووری باوی کۆمەڵگا بە پیرۆز دەزانێت!

تێکست لای (بارت) لە ڕایەڵی دەنگی جۆراوجۆر پێک دێت، کە لە ڕێی ئێنتەرتێکستوالیتییەوە یەک دەگرن. مادام تێکست لە وشە و ڕستە دروست نابێت و مانای جۆراوجۆری هەن، نەوەک مانایەکی دیاریکراو، کەواتە بوونی نووسەر ونە، یان وەک مردوو وایە، کە بۆ کەسێکی گریمانی دەگۆڕێت، بەو مانایەی ئەو گوتاری خۆی لەسەر بۆچوون و لێکدانەوەکانی پێشوو دادەمەزرێنێت. ئەگەر دەستەڵاتێکی هەبێت، هەر ئەوەیە

پشت بە دانەیەک نابەستێت، بەڵکوو هەموویان دەخاتە کار. ئەگەر تێکست لە نووسەردا کورت بکرێتەوە، ئەوا سنوورەکانی ئەو تێکستە دەستنیشان دەکرێن و ناتوانین بە دوای مانا شاراوەکانیدا بگەڕێین. دواجار بوونی دەستەڵاتی نووسەر واتە نەبوونی چێژی تێکست. مەرگی نووسەر ڕزگاربوونی نووسینی لێ دەکەوێتەوە. بەم شێوەیە نووسین دەستەڵاتی دەنگ ناهێڵێت و خاڵێک ناهێڵێتەوە پێی بگوترێت سەرەتا، بەڵام نووسین هەرگیز فۆرمی کۆتایی نییە، بەڵکوو پرۆسێسێکی ئینفینیتییە. پێی وایە نووسین زانستی چێژی قسەیە. کاتێ نووسەر دەمرێت، ڕێگە بۆ خوێنەر تەخت دەبێت و هەر ئەویش گرنگە، چونکە ئەگەر ئەو نەبووایە، تێکست چاوی هەڵنەدەهێنا، بەڵام بوونی خوێنەر واتە خوێندنەوەی جیاواز بۆ تێکست. (بارت) نووسەر و دانەر لە یەکتر جیا دەکاتەوە، کە پێی وایە دانەر لە ڕووی زەمەنییەوە دەکەوێتە پێش نووسەرەوە، بەوەی ئەوە دانەرە ئەرکی بەخێوکردنی نووسەر دەگرێتە ئەستۆ، مادام لەپێش ئەوەوە هەیە. بیر دەکاتەوە، ئازار دەچێژێت و لەپێناویدا دەژی، وەک پێوەندیی باوک بە منداڵەوە. مەبەستی (بارت) ئەوەیە مادام تێکست لە بۆچوون و لێکدانەوەکانی پێشووەوە لە دایک دەبێت، ئەوا دانەر لەناو ئەوانە لە دایک دەبێت و نووسەر ئەوانە لەو وەردەگرێت. ئیتر (بارت) ئەو پێوەندییە سایکۆلۆجییەی نێوان

باوک و منداڵیش دەپچڕێنێت، بۆ ئەوەی خوێنەر ئەو گوتارەی لە منداڵەکەیان وەردەگرێت لە دەستەڵاتی باوک خاڵی بێت.

ئەمە بە کورتی کۆنسێپتی مەرگی نووسەرە، کە دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین فیکری (بارت)یش وەک هیی هەر فیلۆسۆف و ڕووناکبیرێکی تر کورت ناکرێتەوە. هێشتا زۆر لایەنی دیکەی ئەو کۆنسێپتە دەمێنێت قسەی لێوە بکەین، مەگەر (بارت) هەر خۆی ناڵێت خوێندنەوە تاکڕەهەند نییە، جۆراوجۆرە، وەستاو نییە و لە جووڵەدایە...؟! هەموو ئەو شتانە مانایەکیان نییە، ئەگەر من بیانزانم، بەڵام باوەڕم وا بێت سەگ گلاوە. ئێمە بۆ ئەوە دەخوێنینەوە، تاکوو ئازادیی بیرکردنەوەمان گەورە بکەین، هەر بەو مەبەستەیش دەنووسین.

ئێستا دەبێت بزانین کۆنتێکستەکانی ئەو کۆنسێپتە لە کوێن. سەرەتا پێویستە بزانین ئەو بیرۆکەیە لە بارتەوە دەست پێ ناکات، بەڵکوو بەردەوام لەناو فیکری خۆرئاوادا هەبووە. بۆ نموونە (مالارمێ)ی شاعیر پێی وایە زمان شوێنی خاوەنی دەگرێتەوە. (ئیلیۆت) دەرکەوتنی نووسەر و هونەرمەندی بەوەوە بەستووەتەوە نکووڵی لە خودی خۆی بکات. سورياليييەكان دژی ئەوە وەستانەوە نووسەر پیرۆز بکرێت و پایەی گەورەی هەبێت. دوای (بارت)یش هەر درێژەی هەیە. (دێریدا) پێی وایە تێکست ڕزگاربوونە لە دەست نووسەر، کە ئەگەر لای بمابووایەوە دەمرد.

ئەگەر (بارت) لە ساڵی ١٩٦٨ کتێبی (مەرگی نووسەر)ی نووسیوە، ئەوا (فۆکۆ) ساڵی ١٩٦٩ لە یەکێ لە لێکچەکانیدا دەپرسێت: نووسەر چییە؟، نەوەک نووسەر کێیە؟ کە ئەمە هەر خۆی مانای بەلاوەنانی بوونی نووسەرە. بە بڕوای (فۆکۆ) نووسەر بەرهەمی کەلتووری سەدەی نۆزدەهەمە، واتە لەو سەردەمەی مێژووی مۆدێرنتە بە ڕاستی دەست پێ دەکات. بیرۆکەی مەرگ بە شێوەیەکی دیار لە (نیتشە)وە سەرچاوە دەگرێت، کە ئەو فیلۆسۆفە شەڕانگێزە بە دامەزرێنەری پۆستمۆدێرنتە دادەنرێت. بیرۆکەی مەرگی خودا لای (نیتشە) هەر خۆی مانای لەدایکبوونی کەلتوورێکی نوێیە. لە (زەردەشت ئاوای گوت)دا ئەو پەیامە دەگەیەنێت، کە پێی وایە مەرگی خودا واتە مەرگی دوالیزم. لە کتێبی (لە پشت چاکە و خراپەدا)دا زیاتر هەوڵی تێکشکاندنی ئەو دوالیزمە دەدات. ئیتر پێی وایە ژیان لە بەرانبەر مەرگدا نییە. کاتێ خوداوەند بوونی نییە، واتە دنیا و قیامەت لە بەرانبەر یەکتردا نین. هەر ئەمە خۆی مەرگی ئەخلاقیشە، کە لە کەلتووری خۆرئاوا لە مەسیحیەتدا جێگیر بووە. ئەو بیرۆکەیە لای هەر یەکێ لە (هایدیگەر)، کە دەڵێت زەمەنێک لە دایک نابێت، تاکوو زەمەنێک نەمرێت، لای (فۆکۆ)، کە بانگەشەی مەرگی مرۆڤ دەکات، لای (بارت)، وەک دەبینین بانگەشەی مەرگی نووسەر دەکات، لای (دێریدا) جاڕی مەرگی قسە و لەدایکبوونی نووسین دەدات، هەیە و هەموویان تێکڕا لەوەدا خۆیان دەنوێنن، کە ئەو

کەلتوورەی ئێستا هەیە، کەلتوورێکی زاڵە و دەبێت بمرێت، بەو مەبەستەی هیی نویّ لە دایک ببێت. لەو گوتارەی لە ژێر ناونیشانی (هەولێر و هەولێری لە کۆنکرێتبەندییەوە بۆ هەڵوەشاندنەوە)دا نووسیومە بە درێژی لەوە دواوم و هەموو سەرچاوەکانیشم دەستنیشان کردوون، بۆیە تکام وایە بۆی بگەڕێیتەوە. ئەو باسە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت، بەڵام بەوەندە واز دەهێنم. ئەگەر پێویستی کرد، ئەوا بۆی دەگەڕێمەوە.

بۆچی ئەگەر مرۆڤ لە ئاوێنە لە خۆی بڕوانێت و سەگ ببینێت، مانای وایە سووکایەتیی پێ کراوە؟ چونکە زمانی ڕۆژانە ئاوا دەڵێت. بەڵێ، چونکە کەلتووری شەعبی وای گوتووە. (دێریدا) هەمیشە ویستوویەتی زمانی ڕۆژانە تێک بشکێنێت، بۆ ئەوەی زمانی نووسین شوێنی بگرێتەوە، کەچی بەشێکی زۆری نووسەری ئێمە نەک هەر زمانی ڕۆژانە تێک ناشکێنن، بەڵکوو وەک حەقیقەتیش دەیچەسپێنن. لەو گوتارەمدا، کە پێشتر ئامەژەی پێ درا، بە درێژی لەوە دوام و نامەوێت دووبارەیان بکەمەوە، بەڵام یەک دوو پەرەگرافی بۆ ئێرە دەگوازمەوە. تۆ گڵاوت لە بەرانبەر پاکی داناوە. ئەمە ئەو کەلتوور و تێگەیشتنە ستانداردەیە، کە (دێریدا) دەیەوێت هەڵیبوەشێنێتەوە. واتە ئێمە هەمیشە لە ئاستی تێکستەکاندا ڕووبەڕووی دوالیزمە دژەکان (Binary Oppositions)

دەبینەوە وەک ڕۆح/ جەستە، عەقڵ/ ناعەقڵ، قسە/ نووسین، گەرم/ سارد، ڕەش/ سپی، ژیان/ مردن، چاک/ خراپ، جوان/ ناشیرین و زۆری تر، کە میتافیزیکا لەو ڕێگایەوە مانای پێشوەختی خۆی دەسەپێنێت، مانایەک، وا خۆی دەردەخات قەوارەیەکی یەکگرتوو (Coherent) و هاوڕێک (Homogeneous)ی هەیە و بووەتە سێنترالی عەقڵ، دواجار لە شێوەی حەقیقەتێکی نەگۆڕدا دەردەکەوێت. بە کورتی (دێریدا) هەوڵی داوە میتافیزیکای ئامادە ( Metaphysic of Presence) هەڵبوەشێنێتەوە، کە لەسەر بنەمای دوالیزمەکان دامەزراوە، لە کاتێکدا تۆ دەتەوێت بڵێیت لە (بارت) تێدەگەیت و باوەڕیشت بە دوالیزم هەیە، بگرە بەرگرییشی لێ دەکەیت}.

ئەمە بەشێکە لەو نامەیەم، کە هەر ئەو ئێوارەیەی بابەتەکەتت بڵاو کردووەتەوە، بۆم نووسیویت. ئایا ئەمە لە پڕۆژەی خوێندنەوە و نووسینی کردیت و ئەو توانایەی لەو بوارەدا هەتە، کپی کردەوە؟ با لە نێوان خۆمان دەرنەچێت، بەڵام چۆن دەبێت ڕەخنەگرێکی داهێنەر هەست بکات بە پرسیاری نووسەرێکی موفلیس لە پڕۆژەی خوێندنەوە و نووسین دەبێت و تواناکەی دەپووکێتەوە؟ من لە سەرەتایشەوە گوتم بە هۆی وەستانم لەسەر ئەم دوو گوتارەتدا زیاترم خوێندەوە و لە خۆیشم ڕادەبینم بڵێم لە جاران باشتر دەنووسم. ئەوەی بە ڕاستی پڕۆژەی خوێندنەوە و نووسینی هەبێت، نەک بە نامەی

من، کە بریتییە لە پرسیار و وردکردنەوەی چەمکەکان، بەڵکوو بە شتی زۆر ناخۆشیش لە دەستی نادات. (لودڤیگ ڤیتگینیشتاین) درافتی کتێبی (-Tractatus Logico Philosophicus)، کە یەکێکە لە داهێنانە زۆر گرنگەکانی فەلسەفە و لینگویستیک، لە بەرەی جەنگ و لەو کاتەدا نووسی، کە لای ئیتاڵییەکان بە دیل گیرا بوو.(٥١)

---

٥١ https://en.wikipedia.org/wiki/Tractatus_Logico-Philosophicus

# ڕەخنەگری میللی و خوێندنەوە

دەتوانی بە خوێنەری بڵێیت ئەو کاتەی نامەی یەکەمی منت پێ گەیشت، خەریکی خوێندنەوەی چ کتێبێک بوویت؟ ئەودەمەی نامەی چوارەمم بۆ ناردیت، چیت دەنووسی؟ ئەو کتێبەی لە کاتی گەیشتنی نامەی پێنجەممدا دەتخوێندەوە، ناوی چی بوو؟ لە کام گوتارەتدا بە کارت هێنا؟ ئەو کتێبەت لە بیر ماوە، کە لە کاتی گەیشتنی نامەی حەوتەممدا دەتخوێندەوە؟ ئایا ئەو کتێبەی لە کاتی گەیشتنی نامەی سێیەممدا دەتخوێندەوە، هیچی لە زمان و تێگەیشتنت گۆڕی؟ ئەم پرسیارەی دواییانم بۆیە بە خەیاڵدا دێت، چونکە خۆم هەر کتێبێکی گرنگ بخوێنمەوە، هەست دەکەم شتێک لەو تێگەیشتن و زمانەم گۆڕاوە، بەوەی پرسیاری نوێیان لا وروووژاندووم. ئایا سەرجەم ئەو کتێبانەی

لە کاتی گەیشتنی نامەکانمدا خوێندووتنەوە، لە زمانی ئەو دوو گوتارەتدا ڕەنگیان داوەتەوە؟ لە کامەیانت وەرگرت و سەرچاوەکەیت دەستنیشان کرد؟ ئەو توانایەی لە خوێندنەوە و نووسیندا هەتە، بە خوێندنەوەیان گەورەتر بوو؟ ئایا ئەو کتێبانە پرسیاریان تێدا بوو؟ ئەگەر تێیاندا بوو، چۆن ئەو توانایەتیان نەپووکاندەوە؟ ناڵێی بە پرسیار توانات دەپووکێتەوە؟ ئەم پرسیارانە بۆ خۆت جێ دەهێڵم. دەکرێت ئەگەر پێت خۆش نییە وەڵامی خوێنەر بدەیتەوە، ئەوا هەر بۆ خۆشی بە هاوڕێ نزیکەکانتی بڵێیت ئەو کتێبانە چی بوون و چ گۆڕانێکیان بەسەردا هێنایت؟ باوەڕ دەکەم بۆ ئەوانیش ئەو کتێبانە سوودبەخش بن.

ڕەخنەگری میللی هەمیشە وەک شامان (Shaman) خۆی پیشان دەدات، کە هێزێکی سیحری، یان غەیبیی هەیە و لە نووسیندا پەنای بۆ دەبات. واتە بە پاڵپشتی ئەو هێزە لە هەموو شتێک دەزانێت و پێویستی بە خوێندنەوە نییە. کتێبی فلان فیلۆسۆف، کە لای فیلۆسۆفانی تر خوێندنەوەی سەختە، کەچی ئەم بە پاڵپشتی ئەو هێزە، لێی تێدەگات و دەتوانێت لە گوتارەکانیدا کار بە چەمکەکانی بکات. هەر بە پاڵپشتی ئەو هێزە چەند زمانێک فێر دەبێت. ئەو ڕیچوەڵەی ڕەخنەگری میللی لەناویدا هەڵدەسووڕێت، هەمان ئەو ڕیچوەڵەیە، کە شامان تێیدا دەژی. بۆ نموونە شامان باس لەوە دەکات

دەتوانێت لەگەڵ مردوودا بدوێت، پێش لە کارەسات بگرێت، بەسەر ئاگردا زاڵ ببێت. وا خۆی پێشان دەدات چارەسەری ڕۆحیی مرۆڤی نەخۆشی لایە، وەک ئەوەی ڕەخنەگری میللییش پێی وایە لە ڕێگەی نووسینەوە ئەو کارە دەکات. بەم شێوەیە نووسینی ڕەخنەگری میللی جۆرێکە لە شامانیزم. دەستنیشانکردنی نەخۆشی، هۆکارەکانی و چارەسەرکردنی، کە زۆرجار ڕەخنەگری میللی کۆمەڵێک خاڵ دەستنیشان دەکات، دەڵێ ئەوە نەخۆشییەکەیە و چارەسەریشیان بۆ دەدۆزێتەوە؛ هەمان کاری شامانەکانە. شامان پەنا بۆ گۆرانی و سەما دەبات، وەک چۆن ڕەخنەگری میللی نووسینی کردووەتە ئامراز. ئەوەتا تۆ بەبێ ئەوەی پرسیبێتت بۆچی ئەو ڕاگەیاندنەم نووسیوە، دێیت وا لە خوێنەر دەگەیەنیت، کە لە ڕێگەی سیحرەوە منت خوێندووەتەوە و هیچم پێ نەماوە. کتێبم نەفرۆشراوە، بۆیە وازم هێناوە. دەمەوێ خوێنەر بۆ خۆم ڕابکێشم. لە یەکەم نامەتدا، کە بۆت ناردووم، نووسیوتە: (ئەوە چوار ساڵە کتێبت چاپ نەکردووە و بەپێی ئاگاداریی خۆیشم نییتە)، لە کاتێکدا کۆمەڵێک کتێبم هەبوون. لە ڕێگەی نووسەرێکی ناسراوی خۆمانەوە ڕۆمانی (سوارەکان بە قاچاغ بووکیان گواستەوە)م بۆ چاپ ناردبوو. ئەمە شامانیزم نەبێ، چییە؟ بەکارهێنانی زاراوەی قورس لەپاڵ قسەی سادە، هیی ناڕۆشەن و هەندێجار پێکەنیناویدا هەمان ئەو ڕیچوەڵەیە شامان دروستی دەکات. زاراوەی قورسی وەک ئۆنتۆلۆجیا،

دەستەواژەی پێکەنیناویی وەک (دەستەمۆکردنی سادەیی) و شتی تری لەم بابەتە هەمان دۆخی شامانیزممان بە بیر دێنێتەوە. ڕەخنەگری میللی لەناو ئەو ئەتمۆسفێرەدا دەنووسێت، بۆیە ساڵانە دوو سێ کتێب دەخاتە بازاڕەوە، چونکە ئەو هێزە غەیبییە کارەکەی بۆ ئاسان کردووەتەوە. پێویستی بە خوێندنەوە نییە و هەر خوێنەرێکی هۆشیاریش بە ئاسانی لە نووسینەکانیدا هەست بەوە دەکات.

(گادامێر) سەدودوو ساڵ، (شتراوس) سەد ساڵی ڕێک، (راسێل) نزیکەی سەدەیەک، (ژۆن دیوی) نەوەدودوو ساڵ ژیا، کەچی ژمارەی کتێبەکانیان ناگاتە ژمارەی کتێبەکانی ڕەخنەگرێکی میللیی ئێمە، کە هەمووی دە ساڵە دەستی داوەتە کاری شامانی.

دەڵێیت دەمتوانی وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە، کە ئەوە کاری شامانە، نەوەک هیی نووسەر، چونکوو تەنیا شامان دەتوانێت وەڵامی هەموو پرسیارێک بداتەوە. مەبەستم نییە هێرش بکەمە سەر شامانیزم، کە بووەتە جێگەی سەرنجی سایکۆلۆجیست و ئەنترۆپۆلۆجیستەکان، بەڵکوو دەمەوێت ئەوە پێشان بدەم، چۆن نووسەر، کە گوایە ئەرکێکی تری هەیە و خاوەنی دنیایەکی ترە، دەبێتە شامان. مەبەستیشم نییە بڵێم هەمیشە وات کردووە.

ئەگەر هەموو شتێک ڕێژەیی بێت و زیاتر لە لۆژیکێک هەبێت، کە لانی کەم فەلسەفە لە ماوەی ئەو سەدەیەی ڕابوردوودا کاری لەسەر کردووە، چۆن دەتوانین وەڵامی تەواوی پرسیار بدەینەوە؟ پرسیار بۆ کردنەوەی زیاتری دنیایە، بەڵام وەڵام بۆ داخستنیەتی، کە ئەدەب هەمیشە ئەوەی یەکەمیان هەڵدەبژێرێت.

لە خۆم ڕادەبینم بڵێم ئەگەر ئەوانەی ڕەخنەگری میللی بە ناوی فیکرەوە دەیاننووسێت لە کتێب، یان لە گۆڤار و ڕۆژنامەدا بڵاو نەکرێنەوە، کەس نازانێت پێوەندییان بە نووسینی ئەدەبی و فیکرییەوە هەیە. واتە ئەگەر ئەمانە لە ناوەندێکی دەرەوەی ئەدەب و فیکردا بخوێنیتەوە، کەس نازانێت سەر بەو بوارەن. بۆ نموونە تۆ لە گوتاری یەکەمتدا نووسیوتە: (نووسەری ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەنووسێت، کە لێنەکانی بوون و ژیانی لە ڕێگەی نووسینەوە پڕ بکاتەوە).

جارێ بەر لە هەرچی لە دیدی خەڵکی ئاساییشدا ژیان خۆی بەشێکە لە بوون، بۆیە وشەی (ژیان) زیادەیە. ئایا ئەگەر ئەوەت لە شوێنێکی تردا بگوتایە، نەوەک لە گۆڤارێکی، یان لە ڕۆژنامەیەکی ئەدەبیدا، وا دەهاتە گوێچکەوە پێوەندیی بە دنیای فیکر و ئەدەبەوە هەیە؟ دەشێ وا بزانرێت دەڵێیت: (نووسینی ناوی قەرزداران لە دەفتەری قەرز بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانی ژیانە)، کە ڕاستییەکەیشی زۆر بەجێیە، چونکە تۆ کاتێ ناوی

قەرزدارەکان دەنووسیت، دەزانیت هەر یەکەی چەندی بردووە، بۆیە سەری مانگ کاتێ بۆ دانەوەی قەرز دێن، سەرت لێ تێک ناچێت. بەم شێوەیە ئەو نووسینە دەبێتە هۆی پڕکردنەوەی کەلێنەکانی ژیان، کە من خۆم لە کتێبی (ڕاگەردان)دا چیرۆکێکم هەیە باسی دووکاندارێک دەکات چۆن دەبێتە کۆمێدیا، کاتێ شتومەک بە قەرز دەدات، بەڵام ئەگەر لەو شوێنەدا هەزار جار بڵێی (نیتشە) دەڵێت (گەڕانەوەی ئەبەدی) بۆ قەبزی و سکێئێشە باشە و (هایدیگەر) پێی وایە شۆربای ئۆنتۆلۆجیا و دۆشاوی دازاین لە نیسکێنە خۆشترن، دەزانن تۆ ڕەخنەگر و ڕووناکبیریت؟ نەخێر، چونکە ناوەندێکی تری سۆسیۆلۆجییە و کەس چاوەڕێی ئەوەی نەکردووە نووسەری لێ بێت.

پێش ڕاپەڕین من و هاوڕێیەکم لەو بازاڕەی بەغداد بووین، کە باڵندە و ئاژەڵی لێ دەفرۆشرێت. ئەو هاوڕێیەم دەیویست سەگێک بە دەست بهێنێت. خەڵکێکی زۆر لەوێ بوون. بەشێکی زۆریان هەر نەیاندەتوانی دەست لە سەگ بدەن، بەڵام بۆ سەیرکردن هاتبوون. من لەو کاتەدا وا ڕێک کەوت پەردەیەکی زۆر جوان، کە لە قامیش دروست کرابوو، لە پیاوێکی بۆلگاری، یان ڕۆمانی بکڕم. پەردەکەم بە شێوەیەک لە باوەش گرت، وەک بڵێی سەگ بێت، کە هەر بە ڕاستییش لە سەگ دەچوو، بە تایبەتی ڕەنگی. بەو هاوڕێیەمم گوت من وا ئەم کارە دەکەم و تۆ سەرنج بدە! بزانە ئێستا کاتێ بە لای خەڵکدا

دەڕۆم، چۆن دەترسن و خۆیان لا دەدەن. هەر بە ڕاستی کاردانەوەکەیمان بینی. هیی وا هەبوو لەناکاو دوو مەتر خۆی هەڵدەدا و دوور دەکەوتەوە. ئەو هاوڕێیەم گوتی ئەمە چۆنە؟ گوتم هۆکارەکەی سایکۆلۆجییە، چونکە هەموو ئەوانەی لێرەن، خەیاڵیان لای ئەو ئاژەڵەیە. ئەمە لە لایەک و لە لایەکی تر هەر شوێنەکە خۆی وایە. هەر شتێک بە سەگ تێ دەگەن، کە بە دەست مرۆڤەوەیە. ئەگەر ئەمە لە شوێنێکی تر بکەم، خەڵک نەک ناترسن، بەڵکوو هەر لە بنەڕەتەوە وەک سەگی نابینن. نموونەم بەوە هێنایەوە، کە بەشێکی زۆری ئەو شیعر و چیرۆکانەی لە گۆڤارەکاندا بڵاو دەکرێنەوە، شتی ترن و ئەدەب نین، بەڵام چونکە خوێنەر پێی وایە لەو شوێنەدا تەنیا ئەدەب هەیە، ئەوە وایان دەخوێنێتەوە. ئایا ئەگەر بۆ نموونە بەشێکی زۆری ئەو گوتارانەی ڕەخنەگری میللی تێیاندا باسی فیلۆسۆفە گەورەکانی ئەڵمان دەکات، بیانبەیت و لە شاری فرانکفۆرتدا بۆ خەڵکیان بخوێنیتەوە، دەزانن ئەوە نووسەر نووسیونی؟

من تاکوو ئێستا نەمدیوە و کەسیش بۆی نەگێڕاومەتەوە، کاتێ لە کۆڵان، یان لە هەر ناوەندێکی تری سۆسیۆلۆجیدا خەڵک شەڕ بکەن و جنێو بە یەکتر بدەن، گوتەی فیلۆسۆفان بهێننەوە. بۆ نموونە پیاوێک بە لەقە لە دەرگەی ماڵی دەراوسێکەی بدات و بڵێ: وەرە دەرێ، ناپیاو! دیارە تۆ هێشتا نازانیت (هایدیگەر)

پێی وایە ئازار و نیگەرانی گرنگن! یان هەرزەکارێک بە بۆکس بکەوێتە گیانی کوڕەکەی گەڕەکی ژووروو و هاوار بکات: وات لێ دەکەم (مەرگی نووسەر)ی (ڕۆلان بارت) بە چاوی خۆت ببینیت و (مەعریفە و دەستەڵات)ی (میشێل فۆکۆ)ت لێ ببێتە (هەبیتوس)ی (پیر بۆردیۆ)، کوڕی نازانم کێ، بەڵام لای ڕەخنەگری میللی ئەوە کارێکی ئاساییە. شەڕەکە هەمان شەڕ و زمانەکە هەمان زمانە. ئەگەر وا نییە، با یەکێ لەو ڕەخنەگرانە بێت و باسێک لەبارەی هەر یەکێ لەو چەمکانەوە بنووسێت، بە مەرجێ سەرچاوەکانیان دەستنیشان بکات. چۆن مرۆڤ تەنیا یەکێ لەو فیلۆسۆفانە بناسێت و ئاستی زمانی بەرز نابێتەوە؟ چۆن دەتوانێت جوێن بدات؟ چۆن ڕێگە بە خۆی دەدات بە چاکە و خراپە کاری ئەدەبی و هونەری هەڵبسەنگێنێت؟ چۆن و چۆن و چۆن؟

ئەگەر من ناوی چەند جۆرێک لە جۆرەکانی فڕۆکە بزانم لەگەڵ ناوی هەندێک لەو کۆمپانیا و کەسانەی فڕۆکە دروست دەکەن، ئایا مانای وایە دەزانم چۆن فڕۆکە دەفڕێت و چ جۆرە فڕۆکەیەک خراپە، یان چ جۆرێک باشە؟ دەزانم فڕۆکە لێ بخوڕم؟ ڕەخنەگری میللی ناوی هەندێک کتێب و هەندێک نووسەری جیهانی دەزانێت، بەڵام ئایا مانای وایە دەزانێت چ تێکستێک قووڵە و چ تێکستێک لاوازە؟

مەبەستت لە (نووسەری ڕاستەقینە) چییە؟ دەتوانیت گوتارێکی کورت لەو بارەیەوە بنووسیت؟ یان لانی کەم پێناسەیەکی بکەیت؟ نووسەری ڕاستەقینە واتە بوونەوەرێکی تەقلیدی، کە پابەندی دابونەریتە. خاوەنی زمانێکی میللییە و بەو شتانەدا هەڵدەڵێت، کە لای خەڵک ناسراو و خۆشەویستن. بەو زمانە ساکارەی پەلاماری ئەو شتانە دەدات، کە بەر نەفرەتی جەماوەر کەوتوون. ناوەناوە دەنگی هەڵدەبڕێت و دەڵێت: (وەک مامۆستا فلانی شاعیر گۆڕەکەی پڕ لە نوور و جێگەی ناوەڕاستی بەهەشت بێت، لە فلان شیعردا دەفەرموویێت......). دنیای بەسەر دوو بەرە دابەش کردووە: چاکە و خراپە، ئازا و ترسنۆک، ڕاستەقینە و ناڕاستەقینە. هەمیشە دەبۆڵێنێت، کە هەندێک نووسەر بە زمانی خەڵکی خۆمان نانووسن و کەس لێیان تێناگات. لێت ناشارمەوە من تۆم لە سەرووی ئاستی نووسەری ڕاستەقینە داناوە. باوەڕ دەکەم ئەگەر بۆ نامەکانیشم بگەڕێیتەوە، ئەوە ببینیت. نووسەری داهێنەر لە دژی ئەو هێزانەدا دەجەنگێت، کە دەیانەوێت بیکەنە بوونەوەری ڕاستەقینە. وایە؟ سوپاست دەکەم، کە بە (نووسەرێکی موفلیس) ناوت هێناوم، نەوەک بە (نووسەرێکی ڕاستەقینە).

ئەگەر سبەی خوێنەرێک لێت بپرسێت تۆ نووسەری ڕاستەقینەیت، یان لێت بپرسێت، لەبارەی نووسەری

ڕاستەقینەوە چی دەڵێیت، چ وەڵامێکی دەدەیتەوە؟ ئایا ڕەخنەگرێک چەمکی (ئۆنتۆلۆجیا)ی ناسیبێت، کە لە گوتارەکانیدا فڕێی داوە، باوەڕی بە (نووسەری ڕاستەقینە) دەمێنێت؟ ئەری ئەمە زۆر سەیر نییە؟ ئایا ئەمە بنەمای هەیە، یان تەنیا بۆ سڕینەوەی من بە کارت هێناوە؟ ئایا تۆ جارێکی تر لە هیچ بەرهەمێکتدا ناوی ئەو زاراوەیە دەهێنیتەوە، یان بە جارێ دەستی لێ هەڵدەگریت؟

## ڕەخنەگری میللی و تێکەڵکردنی گوتەی خۆی لەگەڵ ناوی فیلۆسۆفاندا

تۆ لە نووسینەکانتدا ناوی فیلۆسۆفێکی وەک (کامیۆ) بهێنیت و پێیشت وا بێت (نووسەری ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەنووسێت، کەلێنەکانی بوون و ژیانی لە ڕێگەی نووسینەوە پڕ بکاتەوە)، لە کاتێکدا سادەترین خوێنەر دەزانێت ئەوە ئەلفوبێیە لە فیکری ئەودا، کە پێی وایە دژایەتییەکی گەورە لەنێوان مرۆڤ و دەوروبەریدا هەیە، بۆیە پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات. (مرۆڤی یاخی)ی (کامیۆ) بە چی کەلێنەکانی بوون (و ژیان!)ی پڕ دەبنەوە؟ (کامیۆ) لە (ئەفسانەی سیزیف)دا دەڵێت: (تەنیا یەک کێشەی گرنگ هەیە لە فەلسەفەدا، کە ئەویش خۆکوشتنە.)(٥٢) هەرچی لەدوای ئەوە بێت، لاوەکییە. ئایا دنیا سێ ڕەهەندی

---

[٥٢] البير كامو، اسطورة سيزيف، نقله الى العربية: أنيس زكي حسن، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت- لبنان، ١٩٨٣، ص١١

هەن، یان نا؟ ئاوەز نۆ جۆری هەن، یان دوانزدە؟ ئەمانە لەدوای ئەو پرسیارەوە دێن.[٥٣]

لە شوێنێکی تردا دەنووسێت: {ئەو هەستە چییە، کە وەسف ناکرێت و عەقڵ لە خەونی پێویستی ژیان بێبەش دەکات؟ ئەو جیهانەی هەتا ئەگەر بە هۆکاری خراپیش ڕاڤە دەکرێت، جیهانێکی باوە... بەڵام بە لاکەی تریشدا، دەبینین مرۆڤ هەست دەکات نامۆ و بێگانەیە* لە گەردوونێکدا لەناکاو ڕووت دەبێتەوە لە خەیاڵپلاوی و ڕووناکی.** ئێکزیل (نەفی)یەکەی بێچارەیە، کاتێک بێبەشە لە یادگاریی نیشتمانێکی ونبوو، یان هیوای وڵاتێکی بەڵێنپێدراو. ئەمە لێکترازانی مرۆڤ و ژیانەکەی، ئەکتەر و دیمەنەکەیەتی، ئەمە بە دروستی بێهوودەیی (absurdity)ـە. تێکڕای مرۆڤە تەندروستەکان، کە بیریان لە خۆکوشتنیان کردووەتەوە، بێ ڕوونکردنەوەیش،

---

[٥٣] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

* لە عەرەبییەکەدا تەنیا وشەی (الغربة) هەیە، کە ئاوەڵناوە، بەڵام لە ئینگلیزییەکەدا (an alien, a stranger) هەن، کە ناون. پێم وایە ئەوەی دوایيان دروستترە، بۆیە لەوێوە وەرمگرتووە.

** لە عەرەبییەکەدا نووسراوە (الاوهام والضوضاء) واتە خەیاڵپلاوی و ژاوەژاو، بەڵام لە ئینگلیزییەکەدا بەم شێوەیەیە: (illusions and lights)، واتە خەیاڵپلاوی و ڕووناکی. وا هەست دەکەم (الاضواء) بێت و بە هەڵە تایپ کرابێت. ئەگەر وایە بۆچی سەرچاوە ئینگلیزییەکە نانووسم؟ ڕاستییەکەی لەگەڵ ئەو چاپە عەرەبییەدا یادگاریم هەیە. مەبەستمە لەم نووسینەمدا تاکوو لە تواناندا بێت ئەو کتێبانە بە کار بهێنم، کە وەک زۆربەی خوێنەرانی هاوچەرخم لە سەرەتای ژیانی خوێندنەوەمدا ناسیومن.

دەکرێت ببینرێت، کە ئەمە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیە لەنێوان ئەو هەستە و پەرۆشیی بۆ مەرگ}.([٥٤])

ئەمە ئەو دنیایە، کە (کامیۆ) پێشانمانی دەدات، ئەو دنیایەی تەواو لێی دابڕاوین. ئەو دنیایەی بە (نیشتمانێکی ونبوو) و (وڵاتێکی بەڵێنپێدراو) وەسفی دەکات، کە مرۆڤ نە یادگاریی ئەوی هەیە و نە هیوای پێیەتی، مادام هەر لە بنەڕەتەوە ئەفسانەیە. ئەو دنیایەی هەر دەبێت تێیدا هەست بە غوربەت بکەیت، چونکە بە بێهوودەیی تەنراوە. چۆن کەلێنەکانی بوون (و ژیان!) لەم دنیایەدا بە نووسین پڕ دەکەیتەوە؟ ئەوە چ بوون (و ژیان!)ێکن و هیی کێن، بە نووسین پڕ دەبنەوە؟ ئەوە چ نووسەرێکە لە ڕێگەی نووسینەوە بوون (و ژیان!)ی خۆی پڕ دەکاتەوە؟ زمانیش نا، بەڵکوو نووسین بە مانا میللییەکەی.

ئەگەر عەریزەنووسێک بە نووسینی عەریزە کەلێنەکانی ژیانی پڕ بکاتەوە، وەک ئەوەی دارتاشێک بە دارتاشی، ئاسنگەرێک بە ئاسنگەری، کرێکارێک بە کرێکاری پڕی دەکاتەوە، ئاساییە، بەڵام نووسەرێک ناوی دەیان فیلۆسۆفی وەک (کامیۆ)ی هێنابێت و باسی پڕکردنەوەی کەلێنەکانی بوون و ژیان بکات، ئەوە نەک من، ڕەنگە زۆر نووسەری تریش واز بهێنن. دەتوانی پێم بڵێی ئەو گوتەیەی (هایدیگەر)ت لە کام کتێبەی وەرگرت و چۆن لەگەڵ ئەم گوتە میللییەی خۆتدا چەسپت

---

[٥٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤

کرد؟ (دواتر پێشانت دەدەم ئەو گوتەیە هیچ پێوەندیی بەو فیلۆسۆفەوە نییە، بەڵکوو بە زمانی ڕۆژانە بۆیت هەڵبەستووە). ئەوە چ نووسەرێکە پێی وایە ئەگەر ئەو دووانە پێکەوە بنووسێت، بەسەر سادەترین خوێنەری فەلسەفەدا تێدەپەڕێت؟ (هایدیگەر) خۆی نا، بەڵکوو خوێنەرێکی سەرەتاییی ئەو فیلۆسۆفە و (نووسەری ڕاستەقینە) پێکەوە ڕێک دەکەون؟ خۆت کاتێ ئەم گوتەیەت نووسی، قاقات لێ دا؟ لام ڕوونە ئەگەر وات بکردایە، نەتدەنووسی؟ ئای گوتەیەکی لەم شێوەیە چ کەتاستڕۆفییەکە! لێرەدایە ئیفلاسی هێندە جوانە و بە خۆشحاڵییەوە هەڵیدەبژێرم.

ئەوەی بە نیازە لەم دنیایەدا ئیفلاس نەکات و ببێتە خاوەنی شت، هەر بەو خەیاڵپلاوییە دەگات، کە (کامیۆ) باسی دەکات. (کامیۆ) لەو پەرەگرافەدا دەیەوێت بڵێت کاتێ لێکدانەوەیەکی ڕازیکەرانە بۆ ئەم دنیایە دەکەیت، ئەوا پێت وایە دنیایەکی گونجاو و ڕێکە، بەڵام هەر هێندە هەستت بەوە کرد ئەو لێکدانەوەیەت تەنیا وەهمە، ئەوا دەمودەست خۆت نامۆ دەبینیت و پێوەندیت پێوەی نامێنێت. ئەوە تۆ ئەم دنیایەت چۆن بینیوە، ئاوا هەست دەکەیت کەلێنەکانی بە نووسین پڕ دەبنەوە، ئازیزی من؟

بۆ زانینت لە حەفتاکاندا بە هۆی ئەوەی چیرۆکنووسێکمان بیرۆکەی (سیزیف)ی لە چیرۆکێکیدا ڕێکرویت کردبوو، ئەو

بابەتە هاتە گۆڕێ. ئەگەرچی بە سادەیی باس کرا و هەندێکیان بە خراپیان دەزانی، بەڵام باس کرا و بۆ ئەو سەردەمە شتێکی نوێ بوو. من بەشی خۆم لێیانەوە فێر بووم. هیچ نەبێ چەمکێکی نوێ و کتێبێکی گرنگم ناسی، تاکوو دوایی بەدواداچوونیان بۆ بکەم. لەم دوو گوتارەتدا تۆ چیت لەو نووسەرانە تێ پەڕاندووە؟ بە دەگمەن نووسەری حەفتاکان و هەشتاکان هەیە بەم زمانە ساکارەی تۆی نووسیبێت، بگرە ئاستی ئەم زمانەت زۆر لە خوار هیی ئەوانە. هیوادارم ئەو چیرۆکنووسە، یان یەکێ لەو نووسەرانەی لەو بارەیانەوە نووسی، وەک بیرەوەرییەکی جوان و گەشی ناو دنیای کەلتوورمان، بە بابەتێک ئاوڕی لێ بداتەوە.

کاتێ بیر لەو گوتەیەت دەکەمەوە، وەک پارادۆکسێک کتێبی (ئیڤەلیوشنی داهێنەر)ی (هێنری برجسۆن)م بە بیر دێتەوە، کە لەسەر پێشنیازی هاوڕێیەک لە کتێبخانەیەکی شەقامی دەواسەدا کڕیم. هەر لەو سەردەمەدا بوو، کە کتێبی (ئەفسانەی سیزیف)یشم خوێندەوە. بەشی چوارەمی ئەو کتێبە لەبارەی نیهل (عەدەم)ەوەیە. لە شوێنێکدا دەنووسێت: (فیلۆسۆفان کەم بایەخیان بە نیهل داوە، بە مەرجێ ئەو بیرۆکەیە زۆربەی کات سپایرەڵ –لولب–یێکی شاراوە و بزوێنەرێکی نادیارە لە فیکری فەلسەفیدا. ئەوە هەر ئەویشە بە شێوەی ڕاستەوخۆ هەر لە بەئاگاهاتنەوەی ئایدیای یەکەمدا لە بەرانبەر هەستدا ئەو کێشە

نیگەرانساز و بابەتانە دەورووژێنێت، کە مرۆڤ هەر لێیان بڕوانێت، تووشی سەرەسووڕە دێت. خەریکە دەست بە فەلسەفاندن نەکەم، ئەگەر پرسیم بۆچی هەم. ئەگەر گوتم پاڵپشتییەک هەیە و بە هەموو بەشەکانی گەردوونم دەبەستێتەوە، ئەوا شتێک ناکەم جگە لەوەی ئەم کێشەیە دوا دەخەم. لەو بارەدا ئەوەم بۆ دەمێنێتەوە بزانم گەردوون بۆچی هەیە. خۆ ئەگەر گەردوونم بۆ پرینسیپێکی نادیار لە ناو، یان لە دەرەوەی خۆیدا گەڕاندەوە، کە هەڵیگرتووە و لێی جیاوازە، ئەوە خەیاڵم تەنیا چەند ساتێک بەو پرینیسپە ئاسوودە دەبێت، چونکە هەمان کێشەم بە هەموو فراوانی و گشتییەکەیەوە بۆ دێتەوە، بەوەی دەڵێم شتەکان لە کوێوە دێن؟ چۆن دەزانین شتگەلێک هەن؟[٥٥]

مرۆڤ ڕووبەڕووی نیهل ببێتەوە، لە کوێ ئەو ڕستە سواو و بێگیانەی لە بیر دەمێنێ، کە دەڵێت: (نووسەری ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەنووسێت، کە لێنەکانی بوون و ژیانی لە ڕێگەی نووسینەوە پڕ بکاتەوە)؟ ئەمە لە کوێی ئەم کێشە ئۆنتۆلۆجییە زەبەلاحەدا خۆی دەبینێتەوە؟ کەلێنی بوون (و ژیان!) بە چی پڕ دەکرێنەوە، مادام (ئەو نیهلەی بوون دادەپۆشێت، یان

---

[٥٥] هنري برغسون، التطور المبدع، ترجمه من الفرنسية الى العربية: جميل صليبا، اللجنة اللبنانية لترجمة الروائع، بيروت، ١٩٨١، ص٢٤٨

بۆشاییەکەی پڕ دەکاتەوە، خودی ئەو نیهلە دەبێت بە شێوەی ئەزەلی بکەوێتە پێش بوونەوە)؟([56])

کەواتە بەپێی ڕوانینی، یان پرسیاری (برجسۆن) ئەوە نیهلە بوون (وجود) دادەپۆشێت و بۆشاییەکەی پڕ دەکاتەوە، نەوەک بە پێچەوانەوە، چونکە نەک هەر گەورەترە، بەڵکوو بەراوردیش ناکرێن. لەم دیدگەیەوە دەڕوانین و دەپرسین: کەلێنی بوون و ژیان بە چی پڕ دەکرێنەوە؟ لە کتێبی کام فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزە وەرگیراوە، یان لەسەر بنەمای کام فیکرە دامەزراوە؟ ئەو گوتەیەم ئەگەر لە شوێنێکی تردا بخوێندایەتەوە، کە ئەو شوێنە پێوەندیی بە فیکرەوە نەبووایە، بە شێوەیەکی تر وەرمدەگرت، بەڵام هیی ڕەخنەگرێک بێت و بە گوتەیەکی ترەوە بەند کرابێت، کە ناوی (هایدیگەر)ی بەسەرەوەیە، ئەوا دیسان دەڵێم چەند خۆشحاڵم، کە وازم لە بڵاوکردنەوە هێناوە! ئەوە چ خوێنەرێکە ئەم گوتەیەی بەسەردا تێپەڕیوە و لانی کەم لە قاقای پێکەنینی نەداوە؟ ئەگەر نووسین بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانی بوون و ژیانە، بۆچی وەک ماسی، یان میوە، لەناو قوتوو هەڵناگیرێت و لە بازاڕ نافرۆشرێت، تاکوو بە ئاسانی دەستمان بکەوێت؟ ئەوە چ دەستگەیەکی چاپەمەنییە سبەی ئەم دوو گوتارەت لەگەڵ کۆمەڵێکی تری هاوشێوەیان لە کتێبێکدا چاپ دەکات و بە خوێنەر دەڵێت:

---

[56] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

بەرهەمێکی نوێی ڕەخنەگرە داهێنەرەکەمان دەرچووە؟ من نووسەری ئەم گوتەیە بم، لە سەرەوە دەست پێ دەکەمەوە، کە وەک پێشتریش لە نامەدا پێم گوتوویت هەموو کاتێ دەستپێکردنەوە نیشانەی ئەوەیە هۆشیارییەکی گەورەترمان لا دروست بووە، کە دەبێت بیسووتێنین. واتە پێی بدوێین و پێی بنووسین، تاکوو خێرا لە ناوی ببەین و شوێن بۆ هۆشیارییەکی نوێی تر ئامادە بکەین، چونکە هۆشیاری وەک ماسیی چلەی هاوینی وڵاتە گەرمەکان وایە، زوو بۆگەن دەکات.

نەهامەتیی ڕەخنەگری میللی ئەوەیە، مادام ئاگای لە بواری فەلسەفە نییە، ئەوا لەگەڵ بواری سیاسەتدا لێی تێکەڵ دەبێت، بۆیە پەنا بۆ درووشم و گوتەی حەماساوی دەبات. ڕەخنەگری میللی وای دێنێتە بەر چاو، (هایدیگەر) و (فۆکۆ) بە نموونە مایکرۆفۆنیان پێ بووە و لەناو ئاپۆرەی جەماوەردا هاواریان کردووە: (ئەی تێکۆشەران، ئەی قارەمانان، ڕاپەڕن! ئەی هەڤاڵان، بڕۆن بۆ پێشەوە و سڵ لە مەرگ مەکەنەوە!).

وەک سەرنجێک: ئەو کاتەی ئەم کتێبەی (برجسۆن)م خوێندەوە، تەنیا چەند شیعر و چیرۆکێکم نووسیبوون، بەڵام هەرگیز باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ڕۆژنامەیەک، یا گۆڤارێکدا بڵاویان بکەمەوە. (ئەگەر ئەو شیعرە ساکارانەی لێ دەربکەم، کە لە قۆناغی هەرزەکاریمدا وەک حزبییەک بۆ حزبم

دەنووسین و ڕەوانەی شاخم دەکردن. خۆشبەختانە زوو دەستم لێ هەڵگرتن). نەشمدەویست دوو دێڕ لەبارەی کتێبێکی واوە بنووسم. هەر ئەو کتێبە و زۆری تر هاوڕێکانم دەیانخوێندنەوە، بێ ئەوەی یەکێکیان خەونی نووسین و بڵاوکردنەوەی هەبووبێت.

ئەرێ ئەوە ئەمڕۆ نووسین لای ئێمە بۆچی هێندە ئاسانە؟ ئەو دارشتنانەی ئێمە چ لای مامۆستای کوردی و چ لای مامۆستای عەرەبیدا پێنجمان پێ لە دە وەرنەدەگرتن، ئاستیان زۆر لەم بابەتانە بەرزتر بوو، کە ئەمڕۆ بڵاو دەکرێنەوە. لەگەڵ هەموو بەرهەمەکانتم نییە و زیاتر مەبەستم لەم دوو گوتارەتە. هیچ کاتێکیش ئەوەم لە بیر ناچێت، کە لەپاڵ ئەوانەدا نووسەری داهێنەرمان هەن، بەڵام چونکە بەو ستایلە میللییە ساکارە نانووسن، کەم ناسراون.

# چەمکی پرسیار و

# بۆچوونی فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزان

وەک گوتم ئەوەم کردووەتە ئەرکی خۆم، تۆ هەر چەمکێکی ئەدەبی، یان فەلسەفی بۆ ئاستی میللی فڕێ بدەیت، من هەڵیدەگرمەوە و لاکەی تری پیشان دەدەم، بۆیە لە خوارەوەدا لەبارەی چەمکی پرسیارەوە باسێک دەنووسم:

سەرەتا با لە بازنەیەکی بچووکەوە دەست پێ بکەم، کە بوونی پرسیارە وەک ناونیشان لای زۆربەی فیلۆسۆفاندا:

(کانت): (ڕۆشەنگەری چییە؟)، (هایدیگەر): (فەلسەفە چییە؟)، (مێتافیزیکا چییە؟)، (بیرکردنەوە چییە؟)، (سارتەر): (ئەدەب چییە؟)، (مێرلۆ-پۆنتی): (فینۆنۆمۆنۆلۆجی چییە؟)، (فۆکۆ): (نووسەر چییە؟)، (ئەشکەنجە چییە؟)، (ڕۆلان بارت): (تێکست

چییە؟) (ریکۆر): (تێکست چییە؟)، (تۆدۆرۆڤ): (سترەکچرالیزم چییە؟)......

ئەمانەم هەر وەک نموونە هێنایەوە، دەنا زۆربەی فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزان پرسیاریان کردووەتە ناونیشانی کتێبیان و ئەو چەمکانەی، کە ویستوویانە لێیان بکۆڵنەوە. سەرجەمیان بە پرسیار دەستیان پێ کردووە. (نیتشە) بەتایبەت لە کتێبی (لە پشت چاکە و خراپەدا)دا پرسیاری (حەقیقەت چییە؟)ی بۆ (لەبەرچی بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێین؟)، یان (چی وامان لێ دەکات بەدوای حەقیقەتدا بگەڕێین؟) گۆڕی.([٥٧])

یەکێ لەو کتێبانەی لە قۆناغی یەکەمی زانکۆدا خوێندمنەوە، (عەقڵ و پێوەرەکان)ی فیلۆسۆفی فرانسی (ئەندرێ لالەند) بوو، لە شوێنێکیدا دەڵێت: {ڕەخنەی فەلسەفییانە بەر لە هەرچی بریتییە لە پرسیاری مرۆڤ لە خۆی، پرسیارێکی جددییانە و ددانی پێدا بنێت، کە ئەوە حەقیقەتە (یان ڕاستییە)، وەک چۆن پەسەندی ناکات، تاکوو نەتوانێت (بەبێ لۆمەکردنی شاراوەی عەقڵ) بیداتە دواوە. پاشان ئەوەی پەسەندی کردووە، تاقیی بکاتەوە، بەوەی بە شتی تری پەسەندکراو بیپێوێت، بەو

---

[٥٧] كرد محمد، الشعر والوجود عند هيدغر، رسالة مقدمه لنيل شهادة دكتوراه في الفلسفة، ، السنة الجامعية ٢٠١١_، ٢٠١٢، ص٨٤

لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکیەتی:

https://theses.univ-oran١.dz/document/٠٤٢٠١٣٢٧t.pdf

مەبەستەی بزانێت لای عەقڵەکانی تردا (بەبێ تەفرەدان و ناچارکردن) پەسەندە و بڕیاری لەسەر دەدرێت، وەک بڵێی گوێ لە کەسانی تر بگرێت و هۆشیاریی خۆی تاقی بکاتەوە، تاکوو بزانێت دەنگدانەوەکەی دەدۆزێتەوە، کە ئاخۆ بۆ ئەو گوتە بیستراوەی شایەت هەیە. بەم شێوەیە حەقیقەتی هاوبەش دەردەکەوێت}.

مەبەستی ئەو فیلۆسۆفە ئەوەیە ڕەخنە لە پرسیارەوە هەڵدەقوڵێت، بەڵام ئەو پرسیارە کاتێ گرنگی پەیدا دەکات، کە لە یەک کاتدا هەم بتوانیت پەسەندی بکەیت و هەم بەبێ ئەوەی عەقڵت لۆمەت بکات، بیدەیتە دواوە. دواتریش ئاراستەی ئەوانەی تری بکەیت، بەڵام نە تەفرەیان بدەیت و نە ناچاریان بکەیت پەسەندی بکەن. مرۆڤ لەو ڕێگەیەوە هۆشیاریی خۆی تاقی دەکاتەوە، ئاخۆ تا چ ئەندازەیەک پرسیارەکەی بایەخی هەیە. هەر لەبەر ئەوەیشە (لالەند) پێی وایە عەقڵ و داد هەمان مانایان هەیە. بە مانایەکی تر خۆشەویستیی ئەوانەی تر و عەقڵ لای ئەو هەمان شتن، گرنگیی پرسیار لای ئەو فیلۆسۆفە لەوەدایە تۆ لە ڕێگەیەوە ددان بە بوونی ئەوەی تردا دەنێیت، چونکە هەر ئەویشە نرخ بە بوونی تۆ و پرسیارت دەدات.([٥٨])

---

[٥٨] اندريه لالند، العقل والمعايير، ترجمه د. نظمى لوقا، الهيئه المصريه العامه للكتاب، ١٩٧٩، ص١٥

ئایا سڕینەوەی ئەوەی تر، هەر خۆی مانای سڕینەوەی پرسیار نییە، بگرە سڕینەوەی خودی خود نییە؟ بە مانایەکی تر ئایا بوونی من نییە وا دەکات، تۆ پرسیارت هەبێت، کە ئەو پرسیارە زامنی مانەوەت دەکات؟ تا ئەو کاتەی نەمانپرسیوە، خودی ئێمە شتێکی چەسپاو و شاراوەیە، بەڵام لە ڕێگەی پرسیارەوە نەک هەر دەجووڵێت، بەڵکوو جەوهەری خۆیشی پێک دەهێنێت. مرۆڤ کاتێ سادەترین پرسیار دەکات، مانای وایە دەیەوێت لە قۆناغی نادیارەوە بگاتە قۆناغێکی تر، کە دیارە، (لە نادیارەوە بۆ دیار)، بەڵام ئەو (دیار)ـە هێشتا ناڕۆشنە. من ئەگەر لە یەکێ بپرسم ناوت چییە، ئەوە پرسیاری من لەبارەی نەزانینەوەیە، یاخود با بڵێین لەبارەی شتێکەوەیە، کە لام ڕوون نییە. ئایا هەتا ئەگەر کەسەکە بیەوێت وەڵامیشم بداتەوە، پرسیاری من تەواو دەبێت؟ بە وەرگرتنی ناوی ئەو، هەندێک زانینم لا دروست دەبێت، کە ڕێگەیە بۆ مەعریفە، نەوەک خودی مەعریفە، لە کاتێکدا مەعریفە بۆ تێکشکاندنە، نەوەک بۆ دەستپێوەگرتن. واتە جیاوازی زۆرە لەنێوان زانین و هۆشیاریدا. من لە ئاستی ناوی ئەو کەسەدا دەشێ خوێندنەوەم هەبێت و لە نیشانە و ماناکانی ئەو ناوە بکۆڵمەوە، کەواتە هێشتا لە بەردەمی پرسیاردام. بەم شێوەیە پرسیار بازنەییە و کۆتاییی نایەت. دەکرێت بگوترێت پێوەندیی نێوان زانین و هۆشیاری تەنیا پرسیار ڕێکی دەخات.

بە بڕوای من پرسیار لە ئازارەوە سەر هەڵدەدات. ئازار هۆکاری هەموو پرسیارێک و بەرهەمی هەموو پرسیارێکیشە.

مرۆڤ تاکوو ئەو کاتەی پرسیار ناکات، کۆیلەیە، چونکە لەبارەی کۆیلایەتیی خۆیەوە نەیپرسیوە. لەبارەی ئەو ڕەگەز و ماتریالانەوە نەیپرسیوە، کە ئەویان نەک کۆیلە کردووە، بەڵکوو نەیانهێشتووە بزانێت کۆیلەیە. پرسیار وا دەکات دۆخی کۆیلەبوونی خۆمان بە ئازاری کۆیلەبوون بگۆڕینەوە، کە ئەوەی پرسیار پێی داوین، ئەو ئازارەیە. لە ڕێگەی ئەو ئازارەیشەوە بە کۆیلەبوونی خۆمان دەزانین، دەنا کۆیلەین، بێ ئەوەی زانیبێتمان، بێ ئەوەی هەوڵی دەرچوون بدەین.

فەلسەفە کاتێ دەست پێ دەکات، کە مرۆڤ پرسیاری گشتی دەکەن. بە هەمان شێوەیش زانست. گەلی یۆنان یەکەم گەل بوو لە ڕووی حەزکردن لە زانینەوە، ئەو پرسیارانەی کرد. وەک دەزانین فەلسەفە و زانست دوو داهێنانی یۆنانییەکانن. ڕاستییەکەی دەرکەوتنی شارستانەتی یۆنانی، کە ئەو چالاکییە عەقڵییە سەرنجڕاکێشەی بەرهەم هێنا، یەکێکە لە مەزنترین ڕووداوەکانی مێژوو، کە نە لە پێش خۆی و نە لە دوای خۆیدا وێنەی نەبووە. لە ماوەیەکی کورتدا، کە دوو سەدەی نەخایاند

گێنیەسی یۆنانی لە بواری هونەر، ئەدەب، فەلسەفەدا ڕەنگی دایەوە.([٥٩])

(پرسیار لەبارەی شتەوە)، کتێبێکی (هایدیگەر)ـە، کە لە بەشی یەکەمیدا ئەم ناونیشانەی داناوە: (ڕێگەی جیاوازی پرسیار لەبارەی شتەوە). ناونیشانە لۆکاڵییەکەیش ئەمەیە: (پرسیاری فەلسەفی و پرسیاری زانستی)، کە لەوێدا دەنووسێت: (لەم لێکچە —موحازەرە-یەدا لەناو پرسیارە سەرەکییەکانی مێتافیزیکادا، تەنیا یەک پرسیار قوت دەکەمەوە: شت چییە؟ ئەم پرسیارە کۆنە. شتی نوێ تێیدا تەنیا ئەوەیە پێویستە سەرلەنوێ بیخەینەوە ڕوو).([٦٠])

هەر لەوێدا (هایدیگەر) دەنووسێت: (بەوەدا ئەو پرسیارە زۆر کۆنە، لە سەدەی حەوتەمی پێش زایین لە فەلسەفەی خۆرئاوا لای یۆنانییەکانەوە دەست پێ دەکات، ئەوا سوودی دەبێت ئەگەر بە کورتی لە ڕووی مێژووییشەوە دەستنیشانی بکەین).([٦١])

---

[٥٩] برتراند راسل، حكمة الغرب، عرض تاريخى لـلفلسفه الغربية في اطار الاجتماعي والسياسي، الجزء الاول، ترجمة: د. فؤاد زكريا، عالم المعرفة، ٦٢، ١٩٨٣، ص٢١

[٦٠] مارتن هايدغر، السؤال عن الشيء (حول نظرية المباديء الترنسندنتالية عند كنت)، ترجمة: اسماعيل المصدق، مراجعة: موسى وهبة، المنظمة العربية لـلترجمة، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠١٢، ص٣٣

[٦١] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٣٤

دیاره مەبەستمان نییه له ناوەرۆکی ئەو کتێبه بکۆڵینەوه، که بێگومان زۆر سەختیشه، بەڵکوو دەمانەوێت تێیدا ئاماژه به گرنگی پرسیار بدەین، که تۆی ڕەخنەگر به چەند وشەیەکی ساده یەکلات کردووەتەوه. کەس هەیه نەیپرسیبێت شت چییه؟ بەڵام ئەوەی گرنگه بەردەوامیی ئەو پرسیارەیه. هیوادارم بۆ نامەکانم بگەڕێیتەوه، تاکوو بزانیت من هەر له ژێرڕۆشنایی ئەو بۆچوونەی (هایدیگەر)دا له تۆم نەپرسیوه؟ ئایا گوتوومه دەبێت تۆ به (ئا)، یان به (نا) وەڵام بدەیتەوه، یان بەردەوام پێم لەسەر ئەوه داگرتووه، که ئەو پرسیارانه پێوەندییان به بۆچوونی تۆوه هەیه و بۆ ئەوەن ئاستی ئەو زمانەت تێ بپەڕێنن، نەوەک وەڵامی ڕاستەوخۆ بدرێنەوه؟

ئەرێ تۆ لەو هەموو نامانەی مندا دێڕێکت نەدۆزییەوه پشتگیریی ئەو ڕایەت بکات، که من ویستوومه تۆ به پرسیار له پرۆژەی خوێندنەوه و نووسین بکەم و ئەو توانایەی تێتدایه، بیپووکێنمەوه؟

(ژیل دۆلۆز) و (فلیکس گاتەری) کتێبی (فەلسەفه چییه؟)یان نووسیوه، که پرسیار تیمای سەرەکیی کتێبەکەیانه، تەنانەت بەشی یەکەمی هەر پرسیاره و له ژێر ناونیشانی (کۆنسێپت چییه؟)دایه. له پێشەکیی کتێبەکەدا دەنووسن: (ڕەنگه پرسیاری

فەلسەفە چییە) لە کاتی درەنگی ژیاندا بکرێت، هاوکاتی گەیشتنی پیری و کاتی قسەکردن بە شێوەی کۆنکریت).([٦٢])

واتە پرسیارێکە چەند بتەوێت خۆتی لێ دوور بگرێت، دواجار لە پیریدا هەر ڕووبەڕووت دەبێتەوە، کە وەک بڵێی لە پیریدا ئەو قۆناغەمان بڕیبێت، کە بە شێوەی ڕووکەش پرسیار بکەین، بگرە لەوێدا بە هەموو ئەو پرسیارانەیشدا دەچینەوە، کە پێشتر لە قۆناغی جیاوازجیاوازی تەمەندا خستوومانەتە ڕوو.

لای (کانت) پرسیار لە هەبوون (الموجود) لەسەر هەر فەلسەفەیەکدا پێویستە، کە ناتوانێت لێی دابېڕێت.([٦٣])

وەک (هایدیگەر) پێی وایە لای (کانت)دا شت، یاخود هەبوون مانای جۆراوجۆری هەن، شتی سروشتی و شت بە مانای تەنی سروشتی، کە دەڵێت: (کانت شتی سروشتی بەوە دیاری دەکات، کە زوو بە دەست دێت. ئەو تەنەی دەکرێت ببێتە بابەتێک بۆ ئەزموونکردن، واتە بۆ زانینی ماتماتیکی سروشتی.

---

[٦٢] Gilles Deleuze and Felix Guattari, What Is Philosophy?

ئەمە لینکەکەیەتی:

https://transversalinflections.files.wordpress.com/٢٠١٥/٠٤/deleuze-٣٢٠٧-what_is_philosophy-fenomenologie-van-schilderkunst.pdf

[٦٣] ایمانویل کانط_ د. جمال محمد احمد سلیمان، انطولوجیا الوجود، دار التنویر للطباعه والنشر والتوزیع، سنة الطبع ٢٠٠٩، ص٢٠٠

تەن شتێکە لە جووڵە، یان وەستاوە لە شوێن، بۆیە جووڵەکان بەوەدا گۆڕانکارین لە شوێندا، ئەوا دەکرێت بەپێی پێوەندییەکانیان لە ڕووی ژمارەوە دیاریکراو بن).([٦٤])

هەر ئەم کتێبەی کانت لەسەر پرسیار دامەزراوە. ڕەخنە لە هەموو فیلۆسۆفانی پێش خۆی دەگرێت بە هەردوو ئاڕاستەی عەقڵی: کە خۆی لە (پلاتۆن)، (ئەریستۆ)، (کریستیان ڤۆن ولف) و (گۆتفرید لایبنتز) دەبینێتەوە. ئاڕاستەی ئێکسپێرمەنتەڵ (تاقیگەرایی): کە (جۆن لۆک) و (داڤید هیۆم) دەگرێتەوە. ئەوەی (کانت) ئاڕاستە دەکات، پرسیارە. پرسیار لەبارەی سەرجەم ڕوانینی ئەوانەوە بۆ بوون. ئەو بەر لە هەرچی وەک (دۆلۆز) دەڵێت، دەپرسێت: (فاکتی زانین چییە (Quid facti).([٦٥])

مەبەستمان نییە لە فەلسەفەی (کانت) بدوێین، بەڵکوو تەنیا دەمانەوێت وەک نموونەیەک لە گرنگیی پرسیاردا ئاماژەی پێ بدەین. چۆن دەتوانین سەرجەم فەلسەفەی دنیا بە چەند وشەیەک بسڕینەوە و بە زمانی میللی بڵێین پرسیار گرنگ نییە؟ مەگەر پرسیارەکانی من لەبارەی هەبوونەوە نین؟ کاتێ

[٦٤] وفيق غريزي، فلسفة كانط وانطولوجيا الوجود_ قراءة في كتاب انطولوجيا الوجود. لە ئێنتەرنێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکەکەیەتی:

http://post٢modernisme.blogspot.com/٢٠١٥/١٢/blog-post_١٨.html

[٦٥] Gilles Deleuze, Kant's Critical Philosophy, The Doctrine of the Faculties, Translated by. Hugh Tomlinson and Barbara Habberjam, The Athlone Press, London, ١٩٨٤, pp١١

بینیومە چەمکێکت فڕێ داوە، ویستوومە لەبارەی ئەو چەمکەوە بپرسم. لە کوێت هێناون، چۆن لێی تێگەیشتوویت و زۆری تر. لەپاڵیدا بۆچوونی خۆمم گوتووە. ئەوەتان نامەکان ماون و با خوێنەر بیانخوێنێتەوە.

هەر لەم کتێبەدا ئەوە دەخوێنینەوە: پرسیاری (هەبوون چییە؟)، یان بە مانایەکی وردتر (ئەمە چییە؟) ئەو پرسیارەیە، کە کاتێ سەرمان لە شتێک سوور دەمێنێت و لەبارەیەوە زانینمان نییە. تۆ کاتێ سەردانی شاری وڵاتێک دەکەیت و ڕێنیشاندەری گەشتوگوزارت لەگەڵە. بێگومان هەر شتێکی لێ دەپرسێت، کە لەبارەیەوە نازانیت و دەپرسیت: (ئەمە چییە؟)، ئەگەرچی تۆ دەیبینی، یان دەستی لێ دەدەیت و هەستی پێ دەکەیت، یان دەیبیستیت، ئەگەر دەنگی لێوە بێت. کەواتە مەبەستت لەو پرسیارەت چییە؟ ئەوەی تۆ دەتەوێت بیزانیت لایەنی دیاری ئەو شتە نییە، بەڵکوو دەتەوێت ناوەرۆکی، یان سروشتی ئەو شتە بزانیت، کە یەکەمجارە بەری دەکەویت و کاکڵەکەی ناناسیت. کەواتە پرسیاری (ئەمە چییە؟) پرسیارە لە ناوەرۆک. پرسیارە لە بوونی ئەوەی هەیە و هەرگیز بوون لێی جیا نابێتەوە. بەم شێوەیە پرسیار لە هەبوون کۆنترین پرسیاری

فەلسەفییە، کە دەبینین پرسیاری (هەبوون چییە)، پریساری سەرەکیی فەلسەفەی یۆنانییە.(٦٦)

(مێرلۆ-پۆنتی) لە کتێبی (دیار و نادیار- لەگەڵ پاشکۆی سەرنجەکانی کار)دا دەڵێت: (ئێمە ناپرسین دنیا هەیە، بەڵکوو لەبارەی بوونیەوە دەپرسین).(٦٧)

هەر (پۆنتی) دواتر دەنووسێت: (فەلسەفە پرسیار ناورووژێنێت ئەو وەڵامانەیش ناخاتە ڕوو، کە وردەوردە بۆشاییەکان پڕ دەکەنەوە. پرسیار لەناو ژیان و لەناو مێژوومان‌دا هەن. لێرە لە دایک دەبن و لێرە دەمرن، ئەگەر وەڵامیان دۆزییەوە).(٦٨)

بەپێی ئەو تێگەیشتنەی (پۆنتی) پرسیار هەر بە زگماک لەناو سەرجەم ژیانمدا هەیە و لەگەڵماندا گەورە دەبێت، بە شێوەیەک دەبێتە مێژوومان. کاری فەلسەفەیش نییە وەڵامی وا ڕووکەشیان بداتەوە، کە هێواش هێواش دایان بپۆشێت، بەڵکوو دەبێت قووڵ بکرێنەوە و بمێنن. بەوەدا پرسیار خودی

---

[٦٦] ایمانویل كانط_ د. جمال محمد احمد سليمان، انطولوجيا الوجود، دار التنوير للطباعه والنشر والتوزيع، سنة الطبع ٢٠٠٩، ص١٩٩

[٦٧] Maurice Merleau-Ponty, The Visible and the Invisible, FOLLOWED BY WORKING NOTES, Edited by Claude Lefort, Translated by Alphonso Lingis, N o r t h w e s t e r n U n i v e r s i t y P r e s s, EVANSTON, ١٩٦٨, PP.٩٦

[٦٨] هەمان سەرچاوە، ل١٠٥

ژیانمانه، ئەوا وەڵام تەنیا مەرگە، تەنیا کۆتاییە. ئەگەر جارێکی تر بۆچوونی (پۆنتی) بە بیر خۆمان بهێنینەوە: (ئێمە ناپرسین دنیا هەیە، بەڵکوو لەبارەی بوونیەوە دەپرسین)، ئەوا دەڵێم پرسیاری من لەبارەی ئەوەوەیە تۆ چیت گوتووە، چونکە ئەگەر لای خۆت ئەوەی گوتووتە، کۆتاییە و هیچی بەدوادا نایەت، ئەوا لای من وەک خوێنەرێکی فەلسەفە ناکەوێتە دەرەوەی پرسیارەوە. تۆ گەلێجار چەمکەکانت فڕێ داون و من هەڵمگرتوونەتەوە، تاکوو پرسیاریان لێوە بکەم. واتە لە بوونی ئەوانەوە پرسیارم کردووە، نەوەک لە هەبوونیان. بەو مەبەستەی زەمینەی پرسیارەکەیش فراوان بکرێت، لەو بارەیەوە هەندێک شتی پێویستم نووسیون. واتە تەنیا پرسیارم نەکردووە، بەڵکوو ئەو سەرچاوانەیشم خستووەتە ڕوو، کە پرسیاری منیان پێک هێناوە.

وای دابنێ من خوێنەرێکی سادەم و پێشتر یەک دێڕم لە فەلسەفە نەخوێندووەتەوە! لەناکاو ئەو دوو تێسکتەم دەخەنە بەر دەست، کە یەکەمیان هیی تۆیە و بە هەمان ئەو زمانەی لە ماڵ و لە گەڕەک، فێری بووم، پێم دەڵێت: (پرسیار گرنگ نییە و وەڵام گرنگە، هەروەها هەموو شتێک وەڵامی هەیە، پرسیار هێزی خۆی لە وەڵام وەردەگرێت)، بەڵام دووەمیان (پۆنتی) نووسیویەتی و لە ئاستێکی تری زماندا پێم دەڵێت: (پرسیار گرنگە و وەڵام گرنگ نییە، پرسیارەکان وەڵام نادرێنەوە)،

کامیان هەڵدەبژێرم؟ لە کامیاندا بەر شتی نوێ دەکەوم؟ ڕەتکردنەوەی پرسیار، ڕەتکردنەوەی خودی زمانە، چونکە (پرسیار لەناو زماندا دەکرێت، هەتا ئەگەر بۆمان دەرکەوت بیرۆکەیەکی پۆزەتیڤ دەتوانێت خۆی لە وشە جیا بکاتەوە و لەسەر توانای ناوەوەی خۆیدا بوەستێت. ڕەتکردنەوە و بە تایبەتییش پرسیار، ناتوانن هیچ خەسڵەتێکی جەوهەریی شتەکان دەرببڕن، لە ڕێگەی ئامرازی زمانەوە نەبێت).([٦٩])

واتە هەر دەبێت لە ڕێگەی زمانەوە پرسیار ئاڕاستە بکرێت و هەر زمانیشە دەتوانێت تەعبیر لەو شتانە بکات، بەوەی ئەو زمانە پرسیاری هەڵگرتووە. ئەگەر بیرۆکەیەک نەیەوێت لە ڕێگەی وشەوە خۆی دەرببڕێت و لەوێوە بە شێوەی سەربەخۆ پرسیار بکات، هێشتا ناتوانێت، چونکە ئەو ئامرازەی گەیاندنی نییە، کە ناوی زمانە. بە مانایەکی تر زمان ڕەت ناکرێتەوە، چونکە خودی ئەو ڕەتکردنەوەیە توانای خۆی لە دەست دەدات و هێزی دەربڕینی نامێنێت، بەوەی زمان پشتی ناگرێت، تاکوو لە ڕێگەیەوە پرسیار بکات.

ئەمە جەختکردنەوەی ئەو فیلۆسۆفەیە لەسەر بایەخی پرسیار وەک ناوەرۆکی ڕاستەقینەی زمان، (بەڵام وەڵام، ئەوە نابێت

---

[٦٩] هەمان سەرچاوە٩٧

بەدوایدا بگەڕێین، بەوەی تەنیا لە مانای وشەدا هەیە، بە شێوەیەک هەر وشەکان خۆیان وەڵامی پرسیارەکانن).([70])

گەڕان بەدوای وەڵامدا شاردنەوەی ئەو پرسیارانەن، کە وەک گوترا لەناو ژیان و مێژووماندا سەریان هەڵداوە و بوونەتە بەشێکی جیانەکراوەی بوون. ئەگەر لای یەکێک لە فیلۆسۆفە گەورەکانی سەدەی بیستەم وەڵام مانای مەرگ و کۆتایی بێت، چۆن پرسیار هێزی خۆیی لێ وەردەگرێت؟ پرسیاری قووڵ، کە ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە بوونمانەوە هەیە، لە دەستی دێت بە هەموو زەمەنەکاندا تێ بپەڕێت و بەردەوام خۆی نوێ بکاتەوە، کە هەتا ئەگەر وەڵامیش بدرێنەوە، ئەو وەڵامانە بۆ ماوەیەکی کورت ڕەنگە شتێک بگەیەنن، بەڵام دواتر ئەوەی ماوەتەوە، هەر پرسیارەکەیە. (ئەو پرسیارانەی لە فەلسەفەدا دەورووژێنرێن، بایەخیان لەو وەڵامانە گەورەترە، کە دەدرێنەوە).([71])

(مێرلۆ-پۆنتی) بەگشتی لەو کتێبەدا بەردەوام لەسەر ئەو پرسیارە فەلسەفییانە دەوەستێت، تەنانەت ناونیشانی هەندێک بەشی کتێبەکەی هەر پرسیارە: پرسیاری فەلسەفی (Philosophical Interrogation)، وردبوونەوە و پرسیار (Interrogation Reflection and)، پرسیار و دایەلێکتیک

---

[70] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

[71] برتراند راسل، حكمه الغرب، عرض تاريخى لـلفلسفه الغربية في اطار الاجتماعي والسياسي، الجزء الاول، ترجمة: د. فؤاد زكريا، عالم المعرفة، ٦٢، ١٩٨٣،ص٣٣

(Interrogation and Dialectic)، پرسیار و ئینتوەیشن – حەدەس- (Interrogation and Intuition)، باوەڕی پێرسێپچوەڵ و پرسیار (perceptual faith and Interrogation).

سەرەتای کتێبی (فینۆمینۆلۆجیای پێرسێپشن Phenomenology of Perception)یشی بە پرسیاری (فینۆنۆمۆنۆلۆجی چییە؟)،(٧٢) دەست پێ کردووە و دەڵێت: (دەشێ سەیر بێت، کە ئەم پرسیارە هێشتا دوای نیو سەدە لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی هوسێرل دەکرێت. ڕاستییەکە ئەوەیە ماوەتەوە و بە شێوەیەک لە شێوەکان وەڵام نەدراوەتەوە). ئەو پرسیارە بە شێوەی جیددی لای (هوسێرل) دەست پێ دەکات، کە پێشتر لای (کانت) و (هیگڵ)یشدا شوێنی گرنگی گرتووە. دوای (هوسێرل)یش بەشێکی زۆری فیلۆسۆفانی وەک (هایدیگەر)، (سارتەر)، (پۆل ریکۆر) و هیی تر پێوەی خەریک بوون، بەڵام وەڵام نادرێتەوە. هەموویان لە ڕوانگەی جیاوازەوە لەو چەمکەیان ڕوانیوە و ڕووبەڕووی بوونەتەوە، کەچی ئەوەی پێی نەگەیشتوون، وەڵامە، لە کاتێکدا هەر لە بنەڕەتەوە نەیانویستووە بە وەڵام بگەن. ئەوە هەر ڕەخنەگری

---

٧٢ Maurice Merleau-Ponty, Phenomenology of Perception, Translated by Colin Smit, London and New York, ١٩٥٨, pp.٢

میللییە هێندە شەیدای وەڵامە، بەوەی وەڵام ئەو ئاستەیە لەسەری گەورە بووە و ویستی تێپەڕاندنی نییە، چونکە هەر تێپەڕاندنێک لە ڕێگەی پرسیارەوە دەکرێت، کە ئەو پێی وایە پرسیار گرنگ نییە.

ئایا (کانت) وەڵامی پرسیاری (ڕۆشنگەری چییە؟)ی دایەوە، ئەگەرچی ناونیشانە ڕاستەقینەکەی بەم شێوەیەیە: (وەڵام بۆ پرسیاری: ڕۆشنگەری چییە؟)، کە پێی وایە تەمبەڵی و ترس هۆکاری ئەوەن ڕێژەیەکی گەورە لە خەڵک بە درێژاییی ژیانیان دەستەپاچە بن، تەنانەت دوای ئەوەیش سروشت لە هەر ڕێنوێنییەکی دەرەکی (alien guidanc) ڕزگاری کردوون. هەر ئەو دووانەیش، واتە تەمبەڵی و ترس هۆکاری ئەوەن کەسانێک بە ئاسانی خۆیان بە ڕێنوێنیان بزانن.([٧٣])

(کانت) لەم گوتارە بەناوبانگەیدا باس لەوە دەکات، کە هیچ شتێک لەوە ئاسانتر نییە مرۆڤ بە دەستەپاچەیی و تەمبەڵی بمێنێتەوە، مادام پێی وایە کەسانێک دەتوانن لە جیاتیی خۆی بیر بکەنەوە و بڕیار لە ژیانی بدەن. هەر خۆیان ئەو سەردار

---

[٧٣] Immanuel Kant, An Answer to the Question: What is Enlightenment? Translated by Ted Humphrey.

لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکەکەیەتی:

https://www.stmarys-ca.edu/sites/default/files/attachments/files/Kant--What%20Is%20Enlightenment_.pdf

و پێشڕۆیە کەڵەکچییانە دەدۆزنەوە. کەم نین ئەو نووسەرە کەڵەکچییانەی بە ئاسانی دەتوانن خوێنەری سادە و تەمبەڵ فریو بدەن و خۆیان لەسەریان بکەنە ڕووناکبیری گەورە. دواجاریش هەر ئەو نووسەرە ساختەچییانە ئەو ڕێژە گەورەیەی خەڵک دەکەنە دادوەر، کە کێ داهێنەرە و کێ داهێنەر نییە؟ کێ مایەپووچە و کێ مایەپووچ نییە؟ بێگومان ئەوانە ئەو نووسەرانە هەڵدەبژێرن، کە فێڵیان لێ دەکەن و فریویان دەدەن. (ئەمە بە شێوەیەکی گشتی دەڵێم، دەنا مەبەستم لە هیچ نووسەرێکی دیاریکراو نییە. باوەڕیشم نە بە دەستنیشانکردنی تۆمەت و نە بە هیی تۆمەتبار هەیە، کە ئەمە ئەو لۆژیکەیە پێشتر دژی وەستاومەتەوە و لێرەیشدا درێژەی پێ دەدەم. ئەوەی من بە گشتی قسەی لێوە دەکەم، دیاردەکانن، کە هیچ نووسەریک نییە بە جارێ هەموو ئەو دیاردانەی تێدا بن).

خودی لێکۆڵینەوە، بە لێکۆڵینەوەی ئەدەبییشەوە، کە بواری تۆیە، لەسەر بنەمای پرسیار دادەمەزرێت، شتێکی سنووردار و بێکۆتایی نییە، بەڵکوو بە کراوەیی جێ دەمێنێت و ناگاتە ئەنجامێکی دیاریکراو.

(فۆکۆ) لەو پێشەکییەی لە ژێر ناونیشانی (نیتشە، فرۆید و مارکس)دا بۆ کتێبی (فەلسەفە لە سەردەمی تراجیدیای ئەگریکیدا)ی (نیتشە)ی نووسیوە، جەخت لەوە دەکاتەوە، کە

ڕاڤە لای ئەو فیلۆسۆفەدا هەمیشە ناتەواوە، بەو مانایەی مەرگ وەک (لە پشت چاکە و خراپەدا)دا دەڵێت بە هۆی زانینی ڕەها (المعرفة المطلقة)وە بەشێکی سەرەکیی ژیان پێک دەهێنێت.([74]) دەگاتە ئەوەی بڵێت ڕاڤە بە شێوەی بێکۆتایی خۆی ڕاڤە دەکات، چونکە بەردەوام خۆی دووبارە دەکاتەوە، بۆیە ئێمە دەبینین زەمەنی ڕاڤە بازنەییە.([75])

(هایدیگەر) دەنووسێت: لە کۆندا وا بوو، ئێستایش وایە و تا ئەبەدیش هەر وا دەبێت، پرسیارەکە ئەوەیە: بوون چییە؟ ئەو پرسیارەیە فەلسەفە ڕووی تێ دەکات و جار لە دوای جار لە وەڵامدانەوەی دەستەوستان دەبێت.([76])

لە کتێبی (پرینسیپی هۆکار)دا بەردەوام کۆمەڵێک پرسیاری فەلسەفی دەورووژێنێت، بێ ئەوەی وەڵامی تەواویان بداتەوە. دەکرێت بگوترێت مێتۆدی کتێبەکە دروستکردنی پرسیارە لەبارەی پرینسیپی هۆکارەوە. بۆ نموونە لە شوێنێکی لێکچەی پێنجەمدا دەڵێت: (پێویستە ئەم پرسیارە بە کراوەیی جێ

---

[74] فريدريك نيتشه، الفلسفة في زمن المأساوي الاغريقي، تقديم ميشال فوكو، تعريب: الدكتور سهيل القش، المؤسسة الجامعية لـلدراسات والنشر والتوزيع، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٣، ص١١

[75] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە١٥

[76] مارتن هيدجر، ما الفلسفه؟ ما الميتافيزيقا؟ هيلدرلين وماهية الشعر، ترجمة: فؤاد كامل ومحمود رجب، دار الثقافه لـلنشر والتوزيع، القاهرة، ١٩٧٤، ص٦١

بهێڵرێت).([٧٧])، یان له شوێنێکی تردا دەپرسێت: {ئایا ئێمەی مرۆڤ تەنیاین لەوەی زانینمان له هەر دۆخێکدا داوای هۆکارمان لێ دەکات؟ بەڵام چۆن هۆکار داخوازی (demand) دروست دەکات؟([٧٨])

هەر خۆی دەڵێت: ناکرێ بە ڕوونی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، تەنیا کاتێ نەبێ، کە بە تەواوی لە جەوهەری هۆکار نەگەین، تەنیا ئەگەر لە جەوهەری هۆکارمان کۆڵییەوە}.([٧٩]) ئەوە لە کاتێکدا پێی وایە ئەو چەمکە لەسەر پرۆبلەماتیکی گەورە وەستاوە و لە هەموو لێکچەکاندا پێ لەسەر ئەو پرۆبلەماتیکە دادەگرێت. کەواتە وەڵامدانەوەی هیچ پرسیارێک نە ئاسانە و نە ئامانجیشە. بەردەوام دەپرسێت: (پرینسیپی هۆکار چی دەڵێت؟). هەر خۆی دەڵێت: (ناتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، تاکوو پێشتر گوێ لە خودی پرینسیپەکە نەگرین. بۆ ئەوەیش پێویستە ئاگامان لەو تۆنە بێت، کە پێی دەدوێت).([٨٠]) مەبەست ئەوەیە ناکرێت بە وەڵام ڕازی بین.

دەتوانم لەم کتێبەدا کۆمەڵێک شوێنی تر دیاری بکەم، کە تێیدا (هایدیگەر) باس لە پرسیار دەکات. چەمکی (هۆکار)ی هێناوە و

---

[٧٧] Martin Heidegger, The Principle of Reason, Translated by Reginald Lilly, Indiana University Press, ١٩٩١, p.٣٤

[٧٨] هەمان سەرچاوە، ل٣٩

[٧٩] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

[٨٠] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

بەردەوام لەبارەیەوە پرسیاری نوێ دەورووژێنێت. خۆزگە تۆیش هەر لای ئەو فیلۆسۆفەدا ئەوەمان بۆ بدۆزێتەوە، کە پرسیار گرنگ نییە و شتی لەم بابەتە. هەر بە گشتی (هایدیگەر) لەو فیلۆسۆفانەیە، کە بەردەوام پرسیار دەکەن و بە کراوەیی جێی دەهێڵن. بۆ نموونە لە گوتاری (سەرچاوەی کاری هونەری)یشدا دەیان پرسیاری گرنگ لەبارەی هونەرەوە دەورووژێنێت، کە دواتر لە شوێنی خۆیدا پەنای بۆ دەبەینەوە.

پرسیار لای (هایدیگەر) بۆ تێپەڕاندنی زانست و لۆژیکە. ئەم پرسیار لەبارەی هەموو ئەو شتانەوە دەکات، کە زانست و لۆژیک بە لاوەی دەنێن، بۆیە پرسیارە سەرەکییەکەی لەبارەی نیهل (العدم)ـەوەیە. ئایا دەکرێت لەبارەی هیچەوە پرسیار بکرێت؟ ئەوە تەنیا زانست نییە نیهل دەداتە دواوە، بەڵکوو لۆژیکیشە. بە بڕوای ئەو (لێکدانەوەی تەقلیدیی بیرکردنەوە و تێگەیشتن هەر پرسیارێک ڕەت دەکەنەوە، کە پێوەندیی بە نیهلەوە هەیە، چونکە ئەو پرسیارە وا مامەڵە لەگەڵ نیهلدا دەکات، وەک ئەوەی بوونەوەرێک بێت لەبارەی خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانیەوە بپرسین. هەتا ئەگەر سوور بووین لەسەر کردنی ئەو پرسیارە وەک دژێکی تێگەیشتن، هێشتا ناتوانین لە وەڵامدانەوەیدا دەستبەرداری تێگەیشتن بین. نیهل بەپێی باوەڕی باو لە نەفیکردنەوەی تەواوی بوونەوەر بەرهەم دێت و نەفیکردنەوەیش پرۆسەسێکە تێگەیشتن ڕایدەپەڕێنێت، بەڵام

هایدیگەر ئەو بابەتە دەخاتە ژێر پرسیارەوە، لەو ڕوانگەیەوە، کە نەفیکردنەوە بە تێگەیشتنیشەوە بەبێ دەرکەوتنی نیهل نایەنە دی، بەوەی دەرکەوتنی نیهل مەرجی بواری نەفی و تێگەیشتنە، نەوەک بەپێچەوانەوە).([81])

پێوەندییەکی پتەو لەنێوان پرسیاری فیکر (پرسیاری فەلسەفی)، کە ئەویش هەر پرسیاری بوون (وجود)ە و مەسەلەی زمان لە فیکری درەنگی (هایدیگەر)دا هەیە، هەر لەبەر ئەوەیشە دواتر (گادامێر) وای دەبینێت (هایدیگەر) کەوتووەتە هەڵکۆڵین تاکوو بە بنەمای شاراوەی زمان بگات.([82])

(گادامێر) خۆی زمان بە شێوازی بنەڕەتی دەزانێت لە تەواوکردنی بوونمان لە جیهاندا و پێی وایە ئەو فۆرمەیە، کە تەواوکاری (شمولیەت)ی دامەزراندن و پێکهێنانی جیهان لە خۆی دەگرێت.([83]) هەر لەبەر ئەوەیە باوەڕی وایە (چالاکیی هونەری ڕاڤە لە ڕۆشنکردنەوەی تێگەیشتندا دەردەکەوێت، نەوەک لە گەیاندنی نهێنی و سەیری کەسەکان، بەڵکوو وەک بەشدارییەک لە دەرخستنی مانای هاوبەش... ئامانجی هەموو لێکتێگەیشتن و تێگەیشتنێک بریتییە لە ڕێککەوتن لەسەر شت،

---

[81] مارتن هایدجر، کتابات اساسیة،الجزء الثانی، ترجمة وتعلیق: اسماعیل المصدق، المشروع القومي لـلترجمة، المجلس الاعلی لـلثقافة، ٢٠٠٣، ص١٠و١١ (مقدمة الکتاب)

[82] د. سعید توفیق، في ماهیة الـلغة وفلسفة التأویل، الـؤسسة الجامعیة لـلدراسات والنشر والتوزیع، الطبعة الاولی، بیروت، ٢٠٠٢، ص٦٠

[83] هانس غیورغ غادامیر، فلسفة التأویل (الأصول. المبادیء. الأهداف)، ترجمة: محمد شوقي الزین، منشورات الاختلاف، الطبعة الثانیة، ٢٠٠٦، ص٩٩و١٠٠

یان سازاندن لەگەڵ شتدا).[٨٤] دەستکەوتنی مانای هاوبەش تەنیا لە ڕێگەی دایەلۆگەوە دێتە دی، کە پرسیار ئامرازی تاقانەی ئەو دایەلۆگەیە.

چۆن پرسیار گرنگ نییە و تۆ ڕەخنەگریت؟ چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە دایەلۆگ لەگەڵ ئەو تێکستە دادەمەزرێنیت، کە دەتەوێت لەبارەیەوە بنووسیت؟ ئا، لێرەدا بڕیار کار دەکات، کە هەمیشە ڕەخنەگری میللی پەنای بۆ دەبات. پێوەرەکە ئامادەیە، پێوەری (چوخ): چاکە، یان خراپە؟ ئەمە ئەو شتەیە لای ئێمە لە سەردەمی زێڕینی خۆیدا دەژی، لە کاتێکدا لە فیکری ڕەخنەییدا شوێنێکی نەبووە و نییەتی. لەم دوو گوتارەتدا، ناڵێم هەمیشە، ئەمەت کردووە.

(گادامێر) لە پێشەکیی کتێبی (سەرچاوەی کاری هونەری)ی (مارتن هایدیگەر)دا دەنووسێت: (بوونی مرۆڤی وجوودی بەوە دەناسرێتەوە بوونی خۆی دەناسێت. لەپێناوی بێسنووریی بوونی مرۆڤی وجوودی و زەمەنەکەی، کە ناتوانێت واز لە پرسیار لەبارەی بوونیەوە بهێنێت، ئەو پرسیارە بە ئاسۆی زەمەنەوە دیاری دەکات).[٨٥]

---

[٨٤] هەمان سەرچاوە، ل١٢٠و١٢١

[٨٥] مارتن هايدغر، اصل العمل الفني، ترجمة: د. ابو العيد دودو، المانيا، منشورات الجمل، الطبعة الاولى، ٢٠٠٣، ص٣٣

واتە ناسینی وجوود بە پرسیاری (وجوود چییە؟)وە بەندە. بۆ ئەوەی ئەو ناسینە بمێنێتەوە، بە بێسنووریی زەمەنەوە دەبەسترێتەوە. بە مانایەکی تر ئەوە پرسیارە لەبارەی بوونەوە، بوونی ئێمە مسۆگەر دەکات، دەنا لە دەستی دەدەین. کەواتە لە کوێ ئەمە لەگەڵ بێبایەخیی پرسیار لای تۆی ڕەخنەگردا دێتەوە؟ هەر بەگشتی پێشەکییەکەی (گادامێر) پێداگرتنە لەسەر بایەخی ئەو پرسیارە.

(د. ئەبو ئەلعید دودو)، کە کتێبی (سەرچاوەی کاری هونەری)ی (مارتن هایدیگەر)ی لە ئەڵمانییەوە کردووەتە عەرەبی، لە پێشەکییەکەیدا دەڵێت: (پرسیار لەبارەی بوونەوە وەڵامی نییە، دەبێت تا کۆتایی دەستی پێوە بگیرێت).[٨٦]

ئایا ڕاستە پرسیار گرنگ نییە؟ هەر لێرەوە دیسان ئاماژە بەو شوێنە دەدەم، کە لە گوتاری یەکەمتدا نووسیوتە (نووسەری ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەنووسێت، کە لێنەکانی بوون و ژیانی لە ڕێگەی نووسینەوە پڕ بکاتەوە). ئەوانەی تەنیا لە ئەلفوبێی فەلسەفەی ئەو فیلۆسۆفە ئاگادار بن، دەزانن ئەم گوتەیە چەند پێکەنیناوییە. ڕەنگە زەحمەت بێت نموونەی لە بەرهەمەکانی پێشووتدا بدۆزرێتەوە.

---

[٨٦] هەمان سەرچاوە، ل١٥

(هایدیگەر) دەنووسێت: {کاتێ دەڵێین قسە قسەکەرە، ئەمە بە شێوەی تایبەت مانای ئەوەیشە قسە قسە دەکات. کەواتە ئەوەی قسە دەکات، قسەیە، نەوەک مرۆڤ، بێ ئەوەی نکووڵی لەوە بکەین مرۆڤ خاوەنی قسەیە، نکووڵی لە ڕەوایەتیی کۆکردنەوەی دیاردە زمانەوانییەکانیش ناکەین لە خانەی (دەربڕین)، یان (دەستەواژە)دا، بۆیە دەپرسین: ئەو سنوورە وردە، کە دەتوانین لە ڕێگەیەوە بڵێین مرۆڤ قسە دەکات، لە کوێیە؟ بۆ ئەوەی وەڵامیشمان دەست بکەوێت، دیسان دەپرسین: قسە (le parler) چییە؟}.([87])

لێرەدا وەک سەرنجێکی بچووک لەبارەی پرسیارەوە: ئەمە بەشێکە لە مێتۆدی (هایدیگەر)، کە هەر کاتێ دەڵێت وەڵامی فڵان پرسیار دەدەینەوە، دەستبەجێ پرسیارێکی تر قوت دەکاتەوە، کە مانای وایە پرسیار کراوەیە و پێوەندیی بە منداڵ و گەورەوە نییە، وەک تۆی ڕەخنەگر گوتووتە. ئینجا بۆ ئەوە دەگەڕێینەوە، کە ئەوەی ئێمە دەریدەبڕین بایەخی گەورەی هەیە. هەر ئەوەیشە ڕوانینمان بۆ وجوود دەردەخات. وەک پێشتریش گوترا (هایدیگەر) ناوی لە کۆبەرهەمی خۆی ناوە (ڕێگەکان)، بەو مەبەستەی خوێنەر وا مامەڵە لەگەڵ هیچ تێکستێکیدا نەکات، گوایە کۆمەڵێک ناسین و زانیارییە لەبارەی بابەتێکی دیاریکراوەوە، بەڵکوو هەر تێکستێک لەو تێکستانە

---

[87] مارتن هيدجر، انشاد المنادي، (قراءة في شعر هولدرلن وتراكل)، تلخيص وترجمة بسام حجار، المركز الثقافي العربي، بيروت، الطبعة الاولى،١٩٩٤، ص١٣و١٤

ڕێگەیەکە پرسیاری بیرکەرەوە دەیبڕێت... ڕێگە دەبێت بەردەوام ببڕرێت و فراوان ببێت، کە لەگەڵ هەر هەنگاوێکی پرسیاردا دەگۆڕێت و بە وەڵامدانەوەی پرسیار کۆتایی نایەت، چونکە پرسیار لە ماوەی ڕێگەدا دەگۆڕێت و بەردەوام لە ڕووناکایی تازەدا دەردەکەوێت. لەگەڵیشیدا ئەو چەمکانەیش دەگۆڕێن، کە پرسیاریان لێوە کراوە، بگرە خودی پرسیارکەریش دەگۆڕێت.(٨٨)

فەلسەفە بە درێژایی مێژووی خۆی دەستی بە پرسیاری بوونەوە گرتبوو، بەڵام (هایدیگەر) جەخت لەوە دەکاتەوە، کە لە کاتی پراکتیزەی ئەم پرسیارەدا تێکەڵییەک لەنێوان بوون و هەبوون (الوجود والموجود)دا دروست بووبوو و فەلسەفە نەیدەتوانی جیاوازی لەنێوانیاندا بکات. نەیتوانیبوو جیاوازییە ئۆنتۆلۆجییەکەیان (La différence ontologique) ببینێت. لە دیدی (مێتافیزیکا)وە، لە (پلاتۆن)ەوە تا دەگاتە (نیتشە) جیاوازیی ئۆنتۆلۆجی، واتە جوداکردنەوەی بنەڕەتییانەی بوون و هەبوون ون بوو، کە ئەمەیش لە قازانجی دووەمیاندا بوو، بەوەی تەنیا یەکەمیان بایەخی پێ دەدرا.(٨٩)

---

[٨٨] مارتن هایدجر، کتابات اساسیة،الجزء الثانی، ترجمة وتعلیق: اسماعیل المصدق، المشروع القومي لـلترجمة، المجلس الاعلى لـلثقافة، ص٤١

[٨٩] کرد محمد، الشعر والوجود عند هیدغر، رسالة مقدمة لنیل شهادة دکتوراه في الفلسفة، ، السنة الجامعیة ٢٠١١_ ٢٠١٢ص٩٤.

لەگەڵ (هایدیگەر)دا پرسیاری (بوون) نەک هەر لەو نادیارییە ڕزگار دەکرێت، بەڵکوو بایەخی سەرەکیی پێ دەدرێت. ڕەخنەگرێک هەر زووزوو ناوی (هایدیگەر) بهێنێت، کە ئەو فیلۆسۆفە پرسیاری بوونی دۆزیبێتەوە و هاوکات نیهلی هێنابێتە ئاستی ئەو بوونەوە، چۆن دەڵێت پرسیار گرنگ نییە؟

تۆ زیاتر لە جارێک لە گوتارەکانتدا ناوی چەمکی (ئۆنتۆلۆجیا)ت هێناوە. ئایا (هایدیگەر) لە ڕێگەی پرسیارەوە نییە ئایدیای دازاین دادەڕێژێت، بەو مەبەستەی لەوێوە بە تێکڕای فەلسەفەی مێتافیزیکای بوون ( The Metaphysics of Existence)دا بچێتەوە، واتە بۆ فەلسەفەی یۆنانی، یان با بڵێین بۆ فەلسەفەی پێش (سۆکرات) بگەڕێتەوە، تاکوو ئەو ئۆنتۆلۆجیایە لە کۆنتێکستە سەرەتایی و نیوەچڵەکەی دەربهێنێت و بیخاتە کۆنتێکستێکی ترەوە، کە زیاتر لە بەردەم ڕوانین و لێکدانەوەدا کراوە بێت؟ ڕێگەم دەدەیت پێت بڵێم ئەوەی کەمترین شارەزاییی لە فەلسەفە هەبێت، دەزانێت پرسیار لای ئەو فیلۆسۆفەدا خاڵی جەوهەرییە، بگرە (هایدیگەر) واتە پرسیار؟ وەک (دێریدا) دەڵێت: (ئەوەی هایدیگەر لە مێتافیزیکای دەکات، پرسیاری بوونە لەگەڵ پرسیاری حەقیقەت و مانا و لۆگۆسدا).([٩٠])

---

[٩٠] جاك دريدا، الكتابة والاختلاف، ترجمة كاظم جهاد، تقديم محمد علال سيناصر، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، الطبعة الثانية، ٢٠٠٠، ص١٢٣

هەر لەو ڕووەوە (دێریدا) خۆی بە قەرزداری ئەو دەزانێت، بە ڕادەیەک ناتوانێت قەرزێکی وەها بە وشە وەسف بکات، بەوەی ئەو زەنگی کۆتاییی میتافیزیکای لێ داوە. دەڵێت ئەو فێری کردین لەگەڵ میتافیزیکادا بڕۆین و پرسیاری ئاڕاستە بکەین، ئەو پرسیارانەی خۆڕسکانە لە بەردەمیدا دەردەکەون، کە ئەو، واتە میتافیزیکا، لە وەڵامدانەوەیاندا دۆژ دادەمێنێت و دژایەتییەکانی خۆی ئاشکرا دەکات.([91])

بەکورتی مەبەستی (دێریدا) ئەوەیە، کە لە ڕێگەی پرسیارەوە میتافیزیکا دادەڕووخێت و بە ناچاری ئەو ناواخنەی دەردەخات، کە دەیویست بیشارێتەوە. لێرەدا ئێمە ئەو شتە دژبەیەکانەی ناوی دەبینین و ئاڕاستەی ترمان بۆ دەردەکەوێت. ئەرێ ئازیز، میتافیزیکا بە چی دادەڕووخێت و ناوەوەی دەکرێتەوە؟ بە پرسیار! واتە ئەو شتەی لەم گوتارەی تۆدا بایەخی نییە، یان بە مانایەکی تر چووەتە ناو گەمەیەکی ساکاری بێزارکەرەوە، کە جارێک باشە و جارێک خراپ. جارێک وایە و جارێکی تر وا نییە، بەڵکوو هایە. کەڕەتێ شلە و کەڕەتێ ڕەقە.

ئایا (هایدیگەر) وەڵامی پرسیاری (میتافیزیک چییە؟)ی دایەوە؟ وەڵامی پرسیارەکانی تری دایەوە؟ (فۆکۆ) وەڵامی پرسیاری (ئەشکەنجە چییە؟) و (نووسەر چییە؟)ی دایەوە؟ (دۆلۆز) و

---

[91] هەمان سەرچاوە، ل٤٧

(گاتەری) وەڵامی پرسیاری (فەلسەفە چییە؟)یان دایەوە؟ و زۆری تر... ئایا (رۆلان بارت) کاتێ پرسی (تێکست چییە؟)، وەڵامی دایەوە، یان پێی وایە وەڵام نادرێتەوە، چونکە جارێکی تر دەکەوینە داوی ماناوە؟([92])

وەڵامیان دانەوە، یان پرۆبلەماتیکیان تێ خستن؟ مەبەست لە دروستکردنی پرسیار، وەڵامدانەوە نییە، بەڵکوو دروستکردنی پرۆبلەماتیکی ئۆنتۆلۆجییە لەو ڕێگەیەوە. (وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارێک هەیە) و (وەڵامم بۆ هەموو شتێک پێیە)، تەنیا لە زمانی ڕەخنەگری میللی و کاربەدەستی حزبییەوە دەبیسترێن. (لە فەلسەفەدا وەڵام نییە). ئەمە ئەو شتەیە، کە هەر خوێنەرێکی جددی لە سەرەتاوە پێی دەگات. ئایدیۆلۆجیا لەسەر ئەو دوو گوتەیە دامەزراوە، دەنا فەلسەفە کاری ئەوەیە ئاستەکانی وەڵام تێ بپەڕێنێت. وەڵام، کە پێوەستە بە زمانەوە، واتە تەنیا لە ڕێگەی زمانەوە دەتوانین وەڵام بدەینەوە، ئەوا خودی زمان بێسنوورە و لە خاڵێکی دیاریکراودا ناوەستێت.

هیچ پرسیارێک نییە وەڵامی دروستی بدرێتەوە، بەڵکوو هەر پرسیارێک، بەتایبەتی پرسیاری فەلسەفی ڕێگە نادات وەڵامی بدەینەوە، چونکە وەڵام کۆتایی بە پرسیار دەهێنێت، بێگومان لای ئەو کەسەی وەڵامی دەداتەوە. مادام لۆژیک وەک

---

[92] رولان بارت، درس السيمولوجيا، ترجمة: عبدالسلام بن عبدالعالي، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، ١٩٨٦، ص١٣

بیرمەندی لوبنانی (عەلی حەرب) پێی وایە لە گۆڕانی بەردەوامدایە، ئەوا هیچ وەڵامێک خۆی ناگرێت و دەچێتە بواری گۆڕانکارییەوە. {لۆژیک بە درێژاییی مێژووی خۆی گۆڕانی بەسەردا هاتووە لە سەردەمی یۆنانەوە تاکوو سەردەمی ئەمڕۆمان، سەردەمی گۆڕانە مەعریفی و تەقینەوە فیکرییەکان، کە لەگەڵ خۆیدا داڕمانی بنەماکان، تێکشکانی قاڵبەکان، بەزاندنی پێوەر و سنوورەکانی هێناوە. لە (ئەریستۆ)وە بۆ (ڕاسێل) لۆژیک بە سەردەمی جیاوازدا تێپەڕیوە و گۆڕانکاریی گەورەی بە خۆیەوە دیوە، لەگەڵیدا ناو و ناوەڕۆکەکان گۆڕاون}.([٩٣])

با ئاماژە بە ناونیشانی بەشی یەکەمی کتێبی (دیالۆگەکان)ی (دۆلۆز) و (گاتەری) بدەین، کە بەم شێوەیەیە: (گفتوگۆ: چییە؟ سوودی چییە؟) دەست پێ دەکات. واتە بە پرسیار. ئایا وەڵامیان دایەوە؟ دەنووسن: زۆر سەختە مرۆڤ لە چاوپێکەوتن (Interview)، گفتوگۆ (Dialogue)، دەمەتەقێ (Conversation)دا بۆچوونی دەرببڕێت. سەرنج دەدەم زۆربەی کات، وەختێ یەکێ پرسیارم لێ دەکات، تەنانەت هەتا ئەگەر یەکێ بە گیریشم بێنێت، ناتوانم بە وردی وەڵامی بدەمەوە. پرسیارەکان وەک هەر شتێ تر دروست دەکرێن. ئەگەر بۆتان نەلواوە بە هۆی ڕەگەزەکانەوە لە هەموو

---

[٩٣] علی حرب، الماهية والعلاقه: نحو منطق تحويلي، المركز الثقافي العربي، الطبعة الاولى، ١٩٩٨، ص١٣

شوێنێک، ئینجا گرنگ نییە لە کوێ، پرسیار دروست بکەن، کاتێ خەڵک ڕووبەڕووتانی بکەنەوە، ئەوا زۆر مەڵێن! هونەری دامەزراندنی کێشە کارێکی زۆر گرنگە: ئێوە کێشە دەهێننە کایەوە، دۆخی کێشە دەهێننە کایەوە بەر لە دۆزینەوەی چارەسەر.(٩٤)

بۆچی دروستکردنی کێشە بە پرسیارەوە دەبەستنەوە؟ چونکە پرسیار کێشەی گەورە لەسەر ئاستی بووندا دروست دەکات، کە وەڵامدانەوەی کۆتاییی نەبێت، بەڵکوو ببێتە خاوەنی بەردەوامی. بە مانایەکی تر ئەو پرسیارە کاریگەری لەسەر بیرکردنەوە دابنێت و ئەو کاریگەرییەی نەوەستێت. بەم شێوەیە پرسیار لە دەرەوەی پێوەری سوود و زیاندایە. ئەوە ڕەخنەگری میللییە دنیا ئاسان دەکاتەوە و دەیەوێت خێرا لە ڕێگەی وەڵامەوە بە هەموو شتێک بگات، دەنا لە بواری فیکر و فەلسەفەدا کوا شوێنێک بۆ وەڵامی کۆتایی و چارەسەر هەیە؟

---

٩٤ Gilles Deleuze and Claire Parnet, Dialogues, translated by Hugh Tomlinson and Barbara Habberjam, New York, Columbia University Press, ١٩٨٧, pp.١

# لە بێبایەخکردنی پرسیارەوە بۆ سڕینەوە

دەگەینە ئەوەی بڵێین ئەو نووسەرەی پێی وایە پرسیار گرنگ نییە، هەر ئەو نووسەرەیشە هێندە ئاسان کاری هونەری دەسڕێتەوە، بێ ئەوەی یەک وشەی لەبارەیەوە بڵێت. ڕەخنەدۆز بەوەدا لەگەڵ ئێستاتیکادا کار دەکات، بەدوای جوانیدا دەگەڕێت، نەوەک ناشیرینی، بەڵام گەڕان بەدوای جوانیدا توانای گەورەی دەوێت و دەبێت دروست بکرێت، کە پێم وایە خودی پرۆسەسەکە، واتە خودی گەڕان بەدوای جوانیدا ئەو هێزەمان دەداتێ. هەمیشە جوانی بە شێوەی شاراوە دەردەکەوێت، بۆیە ئاسان نادۆزرێتەوە. ئەوەمان بەسەردا دەسەپێنێت ورد بۆی بگەڕێین. تاکوو دەیشدۆزینەوە، دەبێت زۆر کونوکەلەبەری بۆ بپشکنین، چەند ماتریالی بۆ پەیدا بکەین و بیخەینە خزمەتی ئەو پرۆسەسەوە.

لە سەردەمی منداڵیمدا هێشتا تەلاری گەورە و دامودەستگەی بەرز دەوروبەریان دانەپۆشیبوو، بەڵکوو خاکێکی فراوان بوو، هاوینان کاتێ گەردەلوول هەڵیدەکرد، بۆ لای دەچووم و دەمویست تێیدا نقوم ببم، بەڵام دایکم تووڕە دەبوو و بۆی باس دەکردم ئەوە هەر ئەو خۆڵوخاشاکەیە، دەچێتە ئاسمان، کە ڕۆژانە قێزی لێ دەکەمەوە. من دەمگوت زۆر جوانە. هەست ناکەم پیس بێت. باوەڕم نییە ئەو خۆڵوخاشاکە بێت. دواتر بۆم دەرکەوت ئەدەبیش وایە باس لە جوانی دەکات بەو ماتریالە پیسانە. ئەوە هەر کاری ڕەخنەگری میللییە تێکستێک بە دەستەوە بگرێت و بەدوای ناشیرینەکاندا بگەڕێت، کە مادام ویستوویەتی بیدۆزێتەوە، هەر دەیدۆزێتەوە، ڕێک وەک ئەوەی لە ئاوێنەدا لە خۆی بگەڕێت. ئەمە ئەو ئاسانکارییەیە، کە هەر نووسەرێ پەرۆشی داهێنانە، خێرا دەستی لێ هەڵدەگرێت، بگرە هەر لە بنەڕەتەوە پەنجەی بۆ نابات.

لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی ڕابوردوودا بۆم دەرکەوتووە ئەوانەی خوێنەرن و نانووسن، زۆر لە هەندێک لەو نووسەرانە چاکتر لە بەرهەمەکانم دەگەن. هۆکارەکەیشی ئەوەیە ئەو نووسەرانە زۆر بە خێرایی دەخوێننەوە و دەیانەوێت زۆر خێرا تێبگەن، بۆ ئەوەی هەر خێرا بە چاک و خراپ هەڵیسەنگێنن، بەڵام ئەو خوێنەرەی نانووسێت، تەنیا مەبەستی ئەوەیە بخوێنێتەوە و چێژی لێ ببینێت. بۆ نموونە کتێبی

(ڕێگەکانی ژەهر) لای زۆر لەو نووسەرانە قورسە، کەچی هەندێک خوێنەر بە وردی خوێندوویانەتەوە و لێی تێگەیشتوون. ئیمەیلیان بۆ ناردووم، یان تەلەفۆنیان بۆ کردووم و لەبارەیەوە هەستی خۆیان دەربڕیوە. ساڵی هەشتا بە هۆی شەڕەوە دەوامی قوتابخانە درەنگ دەستی پێ کردەوە، کە ئەمە بۆ پۆلی سێیەم و شەشەم کێشە بوو، بەوەی دەبووایە مامۆستا لەو چەند مانگەدا هەموو کتێبەکەیان پێ بڵێتەوە. مامۆستایەکی مێژوو لە یەکێ لەو قوتابخانانەی هەولێر، کە هەر لە خۆیەوە شپرزە بوو، ئەمەیش هێندەی تر شپرزەی کردبوو، بۆیە بەردەوام کتێبەکەی بە دەستەوە دەگرت و دەیگوت: (کورە، ئیستعیماری خوێڕی، ئیستیعماری نامەرد، ئەو نیشتیمانە جوانەی عەرەبی وێران کرد. داکی ئەو خەرکە بێتاوانەی گا، قڕی کردن، کوشتنی، ڕاوی نان و.... هتد). گرنگ نەبوو باسەکە چییە، هەمووی لەو چەند وشەیەدا کورت دەکردەوە. بەردەوامیش تەپ تەپ قاچی لە زەوی دەکوتا، تاکوو کاریگەرییەکەی چاکتر دەربکەوێت. جاروبار پێکەنینی پەنگخواردووی یەکێ دەتەقییەوە. مامۆستا پێی دەگوت: (بە چ پێدەکەنی، سەگباب؟ هەوکە مەجالم نییە، بەرام عوتڵەی هاوینێ لە هەر جێیەکی بتبینم، داکت دەگێم). ئینجا هەر خێرا دەستی پێ دەکردەوە: (ئەو نیشتمانە جوانەی عەرەبی وێران کرا، ئیستیعماری هیچوپووچ، ئیستیعماری قەحپەگەواد.....). پەلەی بوو زوو تەواوی بکات. ئایا ڕەخنەگری میللی هەمان شتی

نەکردووە؟ باسەکە هەر چی بێت، لەو چەند وشەیە زیاتری نییە پێی وەسف بکات، کە خەڵکی تر، ئەوانەی وەک نووسەر خۆیان نەناساندووە، لەپێش خۆیەوە دەیزانن. پەلەیەتی خێرا بینووسێت و بڵاوی بکاتەوە. ڕاستە وەک ئەو مامۆستایە ڕاستەوخۆ جوێن نادات، بەڵام مانای وایە پەنا بۆ بەکارهێنانی وشەی زبر نابات؟ ئەو مامۆستایە بەردەوام لای بەڕێوەبەر سکاڵا دەکات، کە ژمارەی قوتابییەکان لە پۆلدا زۆرن، بە ڕادەیەک هەر دوو دوو و سێ سێ لەسەر کورسییەک دادەنیشن. بەڕێوەبەر زۆری لا سەیر دەبێت، چونکە وا نییە و مامۆستاکانی تر باسی کێشەی وا ناکەن، بۆیە ڕۆژێک دەچێت، تاکوو بزانێت چی لە ئارادیە. بۆی دەردەکەوێت زۆربەیان هیی قوتابخانەکە نین، بەڵکوو لە دەرەوە هاتوون بۆ ئەوەی پێبکەنن. زانیویانە لێدانی تێدا نییە و تەنیا جوێنیان پێ دەدرێت، بۆیە گوتوویانە جوێن نەک کێشە نییە، بگرە تامی پێکەنینەکەیش خۆشتر دەکات.

# ڕوانینی ڕەخنەگری میللی

# بۆ چەمکی منداڵ

دەگەینە بازنەیەکی تر، کە بازنەی منداڵ و هۆشیارییە، بەڵام دەمەویت سەرەتا لیت بپرسم، تۆ ئاوا وشەی (هۆشیاری)ت لەو نووسینەدا زەق کردووەتەوە، ئایا لەبارەی ئەو چەمکەوە هیچ ئاگاییەکت هەیە؟ ئەگەر یەکێ ئاگای لەو چەمکە بێت، چۆن لەم ئاستەی زماندا دەنووسێت؟ من ئەگەر تۆم پێشتر نەناسیبێت، بەڵکوو تەنیا ئەم دوو گوتارەتم ئێستا خوێندبێتەوە، ئەوە دەزانم تۆ چەند لەو چەمکە گەیشتوویت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەپرسم پێت خۆشە لەبارەیەوە گفتوگۆ بکەین؟ دیارە لەگەڵ دابەشکردنی مرۆڤدا نیم بەسەر هۆشیار و ناهۆشیاردا و هۆشیارییش بە چەمکێکی سنووردار نازانم، بەڵکوو پێم وایە وەک هەر چەمکێکی تر هەڵدەوەشێنرێتەوە و تێ دەپەڕێنرێت.

ئایا منداڵ بوون (وجود)ی نییە و هەست بەو بوونەی خۆی ناکات؟ ئایا هیچ بوونێک بەبێ پرسیار بوونی هەیە؟ نامەوێت ڕاستەوخۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە. خۆ ئەگەر وەڵامیان بدەمەوە، دەڵێم بەڵێ، منداڵ بوونی هەیە و هەستیش بەو بوونەی دەکات. پرسیار ڕەگەزی سەرەکیی ئەو هەستکردنەیە، بەڵام مێتۆدەکەم وا دەخوازێت وەڵام نەدەمەوە و بۆ وردەکارییەکانی بگەڕێم.

ئایا منداڵ هۆشیاریی نییە؟ (یۆنگ) دەڵێت: هیچ کێشەیەک بەبێ هۆشیاری نییە، بۆیە پێویستە پرسیارەکە بەم شێوەیە دابڕێژین: هۆشیاری چۆن لە دایک دەبێت؟ هیچ کەس ناتوانێت وەڵامی یەقینی ئەو پرسیارە بداتەوە، بەڵام دەتوانین سەرنج لە منداڵی ساوا بدەین کاتێ لە پرۆسەسی پەیداکردنی هۆشیاریدایە. هەر دایکوباوکێ دەتوانێ ئەوە ببینێت، ئەگەر سەرنج بدات. منداڵ کاتێ کەسێک، یان شتێکی نوێ دەناسێتەوە، یاخود دەزانێت؛ ئێمە وا دەزانین هۆشیاریی لا دەرکەوتووە، بەڵام هۆشیاری چییە؟[٩٥]

(یۆنگ) دەڵێت: (هیچ کەس ناتوانێت وەڵامی یەقینی ئەو پرسیارە بداتەوە)، بەڵام ڕەخنەگری ئێمە هەر لە فۆلکلۆرەوە

---

[٩٥] JOSEPH CAMPBELL, (The Portable Jung), Translated by R. F. C. Hull, Published in Penguin Books ١٩٧٦, Reprinted ١٩٧٧. P.١٢

https://archive.org/stream/ThePortableJung/The%٢٠Portable%٢٠Jung_djvu.txt

دەیان وەڵامی دەداتەوە. کارەکە زۆر ئاسانە، نازانم ئەو (یۆنگ)ـە ساویلکەیە بۆ وا زەحمەتی کردووە! هەر دوو وشەی (پرسیار) و (وەڵام) دەهێنێت و یارییان پێ دەکەیت. جارێک دەڵێت بەم شێوەیە باشە و جارێکی تر دەڵێیت نا، بەو شێوەیە. جارێک ئەمیان بە خراپ و جارێکی تریان ئەویان بە چاک دەزانیت. کاتێک دەبینیت دوو سێ لاپەڕەت نووسیون. ڕاستە دواجار خۆیشت سەرت لێ تێک دەچێت و نازانیت پرسیار باشە، یان وەڵام، بەڵام خۆ بەشی ئەوە خوێنەر هەر دەبێت وەک فیکری گەورە بیخوێنێتەوە. ئاخر ئەوە تێگەیشتنی (یۆنگ) بوو، بۆیە لە چەند کتێبێک زیاتری بۆ نەنووسرا، لە کاتێکدا هەندێک ڕەخنەگری خۆمان ساڵانە هەر بۆ خۆشی سێ چوارێک دەخەنە بازاڕەوە. ئەگەر ئەو شارەزاییەی هەبووایە، زنجیرەیەک کتێبی لەبارەی ئیفلاسیی (فرۆید)ـەوە دەنووسی.(LOL)

(تۆدۆرۆڤ) دەڵێت: منداڵ هەوڵ دەدات سەرنجی دایکی ڕابکێشێت، نەک بۆ ئەوەی بێت خۆراکی بداتێ، یان هێزی بخاتە بەر، بەڵکوو ئەو سەرنجە (تەواوکردن)ی لە خۆیدا هەڵگرتووە، کە جەخت لەسەر بوونی ئەو دەکاتەوە.([96]) بەم شێوەیە کاتێ داوای ددانپێدانانی دایکی دەکات، ڕووبەڕووی مەترسی نابێتەوە، بەڵکوو بە شێوەیەکی تر مرۆڤبوونی خۆی

---

[96] تزفيتان تودورف، الحياة المشتركة، بحث انثروبولوجي عام، ترجمة: منذر عياشي، الطبعة الاولى، كلمة والمركز الثقافي العربي، بيروت، ٢٠٠٩،ص٤٧

به هێز دەسەپێنێت. منداڵ نایەوێت جەخت لە بەهاکەی بکاتەوە، کە ئەمە هەر نازانێت، بەڵکوو بەوەندە واز دەهێنێت داوای ئەوە بکات ددانی پێدا بنرێت و هیچی دیکە نا، کە ئەمە شتێکی گرنگە.[٩٧]

واتە منداڵ ئەوەی دەیەوێت لە ڕێگەی ئەو پێوەندییەوە دایبمەزرێنێت، جەختکردنەوەی بوونی خۆیەتی لای ئەوەی تردا، کە دایکیەتی. فیلۆسۆفانی یۆنانی بە وردی باسیان لەوە کردووە، کە مرۆڤ بەبێ ئەوانەی تر بوونەوەرێکی ناتەواوە. (تۆدۆرۆڤ) لەم کتێبەدا بە نموونە دەیانهێنێتەوە. هەروەها ئاماژە بە بۆچوونی (ڕۆسۆ)یش دەدات لەوەی، کە مرۆڤ پێویستی بە ئەوانەی ترە. هەر لەوێدا دیالێکتیکی سەردار و کۆیلە (Master–slave dialectic)ی (هیگڵ)یش دەخاتە بەر باس، کە لە ددانپێداناندا خۆی بەرجەستە دەکات. من خۆم پێشتر لە دوو گفتوگۆدا باسی ئەو تێزەی (هیگڵ)م کردووە، کە یەکێکیان بڵاو کراوەتەوە و ئەوەی تریان هێشتا نا. لێرەدا ئەم پەرەگرافەی لێ وەردەگرم: {پێی وایە بوونی (ئەوەی تر) بۆ خود گرنگە، چونکە لەو ڕێگەیەوە، واتە لە ڕێی ئەو (ئەوەی تر)ەوە خود هەست بە خۆی دەکات. بە مانایەکی تر خود لە ڕێی (ئەوەی تر)ەوە پێوەندی بە خۆیەوە دادەمەزرێنێت. لێرەیشدا ئەو جیاوازییە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ململانێ.

---

[٩٧] هەمان سەرچاوە، ل٤٨

دەگاتە ئەوەی بڵێت خودناسین تەنیا لە ڕێی غوربەتەوە دێتە کایەوە، غوربەت لە سروشتدا، بەوەی خود لە (من) دادەبڕێت، تاکوو بۆی ببێتە (ئەوەی تر)}. بەکورتی لای (هیگڵ) خودەکان بۆ ئەوە دێنە دەرێ، تاکو بچنە ململانێ و ددانیان پێدا بنرێت. منداڵیش وێنەی هەر خودێکی تر وەک (تۆدۆرۆڤ) جەختی لەسەر دەکاتەوە لەناو ئەو ململانێیەدایە. داخوازیی ددانپێدانان بە جەنگێکی گرنگ دادەنرێت. هۆکارەکەیشی ئەوەیە ددانپێدانان بۆ مرۆڤ بەهاکەی لە بەهای ژیان گرنگترە، بەوەی شەڕی مانونەمانە. ([98] ) بیرۆکەی ددانپێدانانیش هەمیشە بە دەستەڵاتەوە بەندە. مرۆڤ بۆیە دەیەوێت ددانی پێدا بنرێت، تاکوو خۆی بسەپێنێت.([99]) بۆ بوونی ململانێ و ددانپێدانانیش هەمیشە دەبێت دوو لایەن هەبن. هەتا دایک و منداڵ، یان ژن و مێرد لەوە بە دەر نین.([100])

وەک دەبینین ئەم بابەتە لای ئەوانەی بەوە ڕازی نین تێگەیشتنی سادەی خەڵک بە هەند وەربگرن، قووڵاییەکی زۆری هەیە وەک لای (تۆدۆرۆڤ)دا دەیبینین. یەکلاکردنەوەی بابەتێکی فەلسەفیی لەم شێوەیە بە چوار وشەی وا سادە، دوورە لەوەی فیکری خوێنەری پرسیارکەر بجووڵێنێت. فیکری هەر نووسەرێک لەسەر فیکری نووسەرەکانی تر، چ هیی پێش

---

[98] هەمان سەرچاوە ل٤٢

[99] هەمان سەرچاوە، ل٤٣

[100] هەمان سەرچاوە، ل٤٦

خۆی بێت و چ هیی هاوکات، دادەمەزرێت، کە لێرەدا تێکستواڵیتی و دایەلۆگ ڕۆڵی گەورە دەبینن، وەک ئەوەی (تۆدۆرۆڤ) لەم کتێبەدا کردوویەتی، کە لەسەر فیکری زۆر لە فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزانە هەم فیکری کتێبەکەی دامەزراندووە و هەم دایەلۆگێکی بەردەوامی لەگەڵدا کردوون. فیکری ئەم گوتارانەی تۆ لەسەر فیکری کام لەوانە دامەزراون و چ دایەلۆگێکیان هێناوەتە دی؟ ئایا سبەی ئەگەر نووسەرێک بیەوێت لەبارەی پرسیاری منداڵەوە بابەتێک بنووسێت، دەتوانێت لەسەر ئەم دوو گوتارەی تۆدا فیکری خۆی دابمەزرێنێت و گفتوگۆیان لەگەڵ بکات؟ ڕەنگە بڵێی ئەوە نییە تۆ وا گفتوگۆیان لەگەڵ دەکەیت. با، دەیکەم، بەڵام لای من دۆخەکە وەک سەرەتا گوتم جیاوازە. بەوەدا من لەو گوتارەدا کراومەتە بابەت، ئەوا دەبێت ئەو بابەتبوونە لە خۆم دابماڵم، بەوەی بوونی من ڕێگە نادات بکرێمە بابەت، کە لە دایەلۆگیش زیاتر ڕێگەی ترم نییە لەو پێناوەدا بیگرمە بەر. وەک گوتیشم ئەگەر گوتارەکەی تۆ لە ئاستێکی تردا بووایە، ئەوا بە ناچاری دەبووایە ئاستی ئەم نووسینەی منیش لەمەی ئێستای بەرزتر بێت، کە ئەودەم هێزی دایەلۆگەکەیش گەورەتر دەبوو. ئەگەر لێم بپرسیت چیی نوێم لەم بۆچوونە دەستگیر بوو، ئەوا وەڵامەکەم ئەوەیە تەنیا ئەو پرسیارە، کە چۆن ڕەخنەگرێک ڕێگەی بە خۆی داوە ئەوە بنووسێت؟ لەگەڵ ئەوەیشدا من بە بایەخەوە لەو پرسیارە دەڕوانم، کە هەر ئەمەیشە وام لێ

دەکات بەم شێوەیە بنووسم. ئەوەیش بیری خۆت و خۆم دەهێنمەوە، کە ئامانجی ئەم نووسینەم تێپەڕاندنی ئەو زمان و تێگەیشتنەیە بە مەبەستی گەیشتن بە زمان و تێگەیشتنێکی تر، کە هیوادارم لای تۆیش وا بکەوێتەوە.
ئایا ویژدانیەت، کە (هایدیگەر) بە جەوهەری و سەرەکیی دەزانێت لە بووندا، شتێکە لە گەورەییدا دروست دەبێت، یان هەر لە سەرەتاوە هەیە؟ (هایدیگەر) پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە ئەزموونێک هەیە لە نیهلدا دەردەکەوێت، ئەویش ئەزموونی نیگەرانییە، بەڵام ئەمە دەبێت وامان لێ بکات سەرەتا پارێز بکەین، بەوەی چۆن ڕێی تێ دەچێت بایەخێکی وا گەورە بەم پرسیارە بدەین لە بەرانبەر نوێنەری زانستە جۆراوجۆرەکاندا، بە پشتبەستن بە حاڵەتی ویژدانی، بە خۆبژێویکی ڕووت (معيش ذاتي محض)ی وەک نیگەرانی. ئەو پارێزییە لەسەر ئەو بۆچوونە باوە دەوەستێت، کە وای دەبینێت دۆخە ویژدانییەکان (die stimmungen)، واتە ئەوانەی هەست و خرۆشانیان پێ دەگوترێت، دیاردەی تێپەڕن، هەندێجار لەسەر بوون (کەینوونە: دازاین)دا دەردەکەون و دوایی گوم دەبن، سیمای خودیی ڕووت بە خۆوە دەگرن، بۆیە بە هیچ شێوەیەک پێوەندییان بە حەقیقەتەوە نییە. (هایدیگەر) بە پێچەوانەوە لە ڕاڤەکردنی بووندا بایەخی گەورە بە ویژدان و دۆخە ویژدانییەکان دەدات. لە پەرەگرافی بیستونۆی (گەردوون و کات)دا ئەوە دەردەخات، کە ویژدانیەت ( die

چۆنیەتییەکی سەرەکیی بوونی کەینوونەیە (befindlichkeit لە جیهاندا. ئەوە نییە کەینوونە هەندێجار و لە بۆنە دیاریکراوەکاندا هەبێت، بەڵکوو سەر بە بونیادی کەینوونەیە. ویژدانیەت ئەو چۆنیەتییە سەرەتاییەیە، کە پێیەوە بوونمان لە دنیادا لای شتەکان و ئەوانەی تردا دەردەکەوێت. هەر هەڵسوکەوتێکی کەینوونە، چ تیۆری و چ پراکتیک، چ لە ئاستی خودی خۆیدا و چ لە ئاستی شتەکان و ئەوانەی تردا، لەسەر بنەمای دۆخی ویژدانی دادەمەزرێت: خۆشی، خەمباری، سەرسامی، سووسەکردن (فضول)، نۆستاڵگیا (حنین)، پەرۆشی، هیوا، نائومێدی، بێزاری، بێباکی و زۆری تر.([101])

ویژدانیەت لای (هایدیگەر)دا ئەزموونی سەرەتایی و دەرکەوتنی ڕەسەنییانەی کەینوونەیە، واتە بە شێوەی سەربەخۆ هەیە و لە ڕێگەیەوە ژیانی ریالیستیی خۆی دەردەخات. ئەمە لای ئەودا پێوەندیی بە ڕاڤەکردنی فینۆمینۆلۆجیاوە هەیە، کە وەک مێتۆدێک بۆ خوێندنەوەی مێتافیزیکای بوون گرتوویەتیە بەر. بە مانایەکی تر پەڕینەوە لە دیاردەوە، کە خودی بابەتی شتەکان دەگرێتەوە، بۆ جەوهەر، بە مەبەستی ڕۆچوون و قووڵبوونەوەی زیاتر. بەم شێوەیە دۆخە ویژدانییەکانی فینۆمینۆلۆجیا هەر لە سەرەتای گەردوون و کاتدا دروست دەبن، کە نیگەرانی ناوەرۆکی ئەو پێوەندییەیە،

---

[101] مارتن هايدجر، كتابات اساسية،الجزء الثانى، ترجمة وتعليق: اسماعيل المصدق، المشروع القومي لـلترجمة، المجلس الاعلى لـلثقافة، ٢٠٠٣، ص١١ (مقدمة الكتاب)

بەوەی مرۆڤ هەست بە نیگەرانی دەکات، کاتێ دەزانێت هەر دەبێت لە ئەنجامدا ڕووبەڕووی مەرگ ببێتەوە، کە ئەو نیگەرانییە هەر خۆی خودی نیهلە. نیگەرانی یارمەتیی تاک دەدات نیهل بناسێت. واتە دەیخاتە بەردەم دیالێکتیکی بوون و مەرگ. مەرگ دەبێتە ئەزموونێکی تایبەت بۆ تاک و هیچ بوونەوەرێکی تر لەگەڵیدا بەشدار نابێت، کە ئەمە تەواو نیگەرانییەکەی زەق دەکاتەوە. دەگەینە ئەوەی بڵێین نیگەرانیی ڕەسەن، واتە ئەو نیگەرانییە قووڵەی بە ناخی مرۆڤدا ڕۆ دەچێت و هەموو شتەکان و کەسەکان دەگرێتەوە، دۆخێکی ویژدانییە و سەرچاوەی ئازادییشمانە.

کەواتە پرسیار لەبارەی مەرگەوە، پرسیارە لەبارەی نیگەرانی و نیهلەوە، کە ئەمە پێوەندیی بە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراوەوە نییە، بەڵکوو بەشێکی دانەبڕاوی بوونە، بۆیە ئەو ڕەخنەگرەی پێی وایە پرسیاری منداڵ بایەخی نییە، دوور و نزیک لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەی (هایدیگەر) بە تایبەتی و هیی فەلسەفە بە گشتی ڕێک ناکەوێت، بەڵکوو گوتەیەکە وەک گوترا لە ئاستی فۆلکلۆری کوردییەوە هێنراوەتە ئاستی نووسینەوە. بە مانایەکی تر، قسەیەکی سواوە، لە دەمی خەڵکەوە وەرگیراوە و هەر بەو سادەییەی خۆی داڕێژراوەتەوە. هێندە هەیە ئاماژە بە سەرچاوەکەی نەدراوە، لە کاتێکدا دەبووایە بنووسرێت: (لە داپیرە شیرین و باپیرە قسەخۆشەکانەوە ماوەتەوە). دووبارە دەپرسین ئایا منداڵ دۆخی ویژدانیی نییە؟

ئایا منداڵ نازانێت خۆشی، ناخۆشی، بێزاری، هیوا، نائومێدی و زۆری تر چین؟ ئایا منداڵ پرسیار لەبارەی مەرگەوە ناکات؟

ئایا منداڵیش وەک گەورە هەر بە تێگەیشتنی (هایدیگەر) دوو بوونی نین، بوونێکی لە جیهاندا و بوونێکی لەگەڵ ئەوانەی تردا؟ واتە بوونێکی ڕەسەن و بوونێکی ساختە؟ لە دیدی (هایدیگەر)دا کات وەک شتەکانی تری سروشت شتێکی بەردەست نییە، واتە مەوجوود نییە، بەڵکوو لەگەڵ بوونی مرۆڤایەتی (الوجود الانسانی)ـەوە دێتە کایەوە. بەم شێوەیە کات بە بوون دیاری دەکرێت.(١٠٢)

ئایا منداڵ بەشێکە لە بوونی مرۆڤایەتی، یان نا؟ بەپێی بۆچوونی (هایدیگەر) بەشێکە، بەڵام ئەگەر تۆ ڕوانینێکی جیاوازت هەیە، هیوادارم دەریببڕیت، تاکوو بزانین چییە!

پرسیاری منداڵ بەشێکە لە پراکتیزەی زمان، کە لەو ڕێگەیەوە پێوەندی بە دنیاوە دەکات. بە بڕوای (ژۆلیا کریستیڤا) سەرجەم ئەو ڕاڤانەی پێوەندییان بە فێربوونی زمانەوە هەیە لای منداڵ، لەگەڵ هەموو ئەو گوتە لۆژیکییانەی، کە لە ماوەی گەشەکردنیدا گەشە دەکەن لەپێناوی تێگەیشتنی دنیادا، هەمیشە بۆ زمان ئاڕاستەن و تیشک دەخەنە سەر میکانیزمی کارکردنی، لە کاتێکدا زمانەوانییە فۆرمەڵەکان (اللسانیات الشکلیة: Formal semantics) کاری وایان لە دەست

---

(١٠٢) کرد محمد، الشعر والوجود عند هیدغر، رسالة مقدمه لنیل شهادة دکتوراه في الفلسفة، ، السنة الجامعیة ٢٠١١_، ٢٠١٢، ص١٠٤

نەدەهات. کاتە بنەڕەتییەکەی پێوەندیی نێوان خود و زمانەکەی بێگومان لە پێش سەرەتای سەدەی بیستەم دیاری دەکرێت.[103] مەبەستی (کریستیڤا) لە کارەکانی (فرۆید)ـە، کە دیدیگەیەکی نوێی لە نواندنی میکانیزمی کاری زماندا کردووەتەوە و پەشێوییەکی لە چەمکەکانی (دیکارت)دا هێناوەتە گۆڕێ.[104]

لە کاتێکدا تۆ پرۆسەسی فێربوون بە شتێکی بێنرخ دەزانیت، ئەوا فەلسەفە لە سەردەمی یۆنانەوە تاکوو ئەمڕۆ بایەخی گەورەی پێ داوە. (سۆکرات)، (پلاتۆن)، (ئەریستۆ)، (دێکارت)، (کانت)، (رۆسۆ) و زۆری تر خۆیان بۆ ئەو بوارە تەرخان کردووە. فیلۆسۆفێکی وەک (ژان پیاجە) هەموو ژیانی بۆ ئەوە دانا. (رۆسۆ)، وەک لە پێشەکییەکەدا گوترا (ئیمیل)ی نووسیوە، کە لە پێنج کتێب پێک دێت و لەو ڕێگەیەوە شێوازێکی نوێی پەروەردەی داهێناوە. ئەگەرچی لە سەردەمی خۆیدا سووتێنرا، بەوەی ئەو جۆرە پەروەردەیان بە خراپ دەزانی، بەڵام زۆری نەبرد کاریگەرییە گەورەکەی لەسەر فیکری فەلسەفیی دنیادا دەرکەوت. باوەڕم وایە هەر ڕەخنەگرێکی میللی چەند لاپەڕەیەک لەم بەرهەمە بخوێنێتەوە، جارێکی تر ناڵێت ئەو تێکستە ئەمەی چاکە و ئەوەی خراپە، کە (رۆسۆ) لەوێدا بەگژ

---

[103] جوليا كريستيفا، التحليل النفسي واللغة، ترجمة: د. زياد عزالدين عوف، مجلة الاداب العالمية، العدد١٣٦، سنة٢٠٠٨، ص١٤

[104] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

ئەو پێوەرەدا دەچێتەوە. واتە ڕەخنە لەو مامۆستایانە دەگرێت، کە شت بۆ قوتابی ڕوون دەکەنەوە و دەڵێن ئەمە باشە، بەڵام ئەوە خراپە. ڕەخنەگری میللیی ئێمە تازە خەریکی ئەو کارەیە و بەرگرییشی لێ دەکات! ئامادەم بە یەک گوتار بۆی بگەڕێمەوە، ئەگەر پێویستی کرد.

(هایدیگەر) فێربوون بە بیرکردنەوەوە دەبەستێتەوە. واتە دەڵێت پێویستە ئێمە فێری بیرکردنەوە ببین. دەپرسێت فێربوون چییە؟ لەم ڕووەوە دەنووسێت: (مرۆڤ فێر دەبێت، کاتێ هەڵسوکەوت و غەریزەکانی وا لێ دەکات وەڵامدانەوەیان بۆ ئەوەی وا دەردەکەوێت، جەوهەری بێت. ئێمە بەو ئەندازەیە فێر دەبین، کە ئەو بوونەوەرە چییە بایەخی خۆمانی ئاڕاستە دەکەین).[105]

واتە فێربوونی ئێمە بەندە بەوەی دەمانەوێت چی فێر ببین، کە ئەوە ئاڕاستەمان دەکات، تاکوو فێری ببین و بیری لێ بکەینەوە. کەواتە ئەو (چییە) گرنگە، چونکە ئەوەیە قووڵاییی بیرکردنەوەی ئێمە دەردەخات. بیرکردنەوەیش لای (هایدیگەر) وەک پێشانمان دا بەندە بە پرسیارەوە. کەواتە منداڵ وەک هەر بوونەوەرێکی تر کاتێ پرسیار دەکات، مانای وایە بایەخی بۆ ئەو شتانە هەیە، کە دەیەوێت فێریان ببێت. پێشتریش نووسیویەتی: (ئێمە وا لە مرۆڤ دەڕوانین، کە بە ڕاستی

---

[105] مارتن هيدجر، التقنية_الحقيقة_ الوجود، ترجمة: محمد سبيلا و عبد الهادي مفتاح، المركز الثقافي العربى، الدار البيضاء، ط١، ١٩٩٥، ص١٨٧

بوونەوەرێکە توانای فێربوونی هەیە، چونکە زیندوو و ئاقڵە....
بەوەدا مرۆڤ زیندوو و ئاقڵە، ئەوا لەسەری پێویست دەکات هەر کاتێ ویستی بیر بکاتەوە. هەرچەندە مرۆڤ دەیەوێت بیر بکاتەوە، بەڵام هەرگیز ئەوەی بۆ ناکرێت، بەڵام دواجار هەر دەیەوێت بیر بکاتەوە، شتی زۆری دەوێ و توانای گەرەکە. مرۆڤ دەتوانێت بیر بکاتەوە، کاتێ ئەوانەی بۆ دەستەبەر دەبن).([١٠٦])

مەبەستمان نییە باس لە چەمکی فێربوون بکەین لای ئەو فیلۆسۆفەدا، بەڵکوو تەنیا دەمانەوێت بزانین ئەو گوتە میللییەی تۆ چەند دوورە لەو تێگەیشتنەی فەلسەفە بەگشتی و فەلسەفەی (هایدیگەر) بەتایبەتی لەم ڕووەوە هەیانە.

هەر لەم ڕووەوە دەپرسین: بۆچی (لودڤیگ ڤیتگینیشتاین) ناو لە زمان دەنێت گەمە، یان گەمەی بەرز؟

مرۆڤ کاتێ دەدوێت، دەنگ و کاتێ دەنووسێت، وشە بەرهەم دەهێنێت، واتە لەسەر کاغەزدا هێڵ دەنەخشێنێت، بەڵام ئەوە چییە مانا بەو دەنگ و هێڵکارییانە دەدات؟ بەپێی تراکتاتوس (Tractatus)، کە (مانای نامە، پەیام، گوتار، ڕاڤە و شتی لەم بابەتەیە: Treatise)، تاکەڕستە، کە مانای هەیە لەو ناوانە پێک دێت، پێکەوە پێوەستن. ئەو ناوانە دنیایەکی تایبەت بە

[١٠٦] هەمان سەرچاوە، ل١٨٥

زمان دەدەن.(١٠٧) بەم شێوەیە وەک چۆن دنیا لۆژیکی خۆی هەیە، ئەوا زمانیش خاوەنی لۆژیکی خۆیەتی، کە ئەرکی زمان لەوەدا بەرجەستە دەبێت وێنەی دەرەکیی دنیایە. گەمەی زمان وێنەکەیەتی، کە لەو دنیایەی دروست کردووە. بەوەدا زمان گەمەیە، کەواتە یاسای هەیە وەک هەموو گەمەکانی تر، بۆیە ڕەچاونەکردنی ئەو یاسایانە دەبێتە هۆی تێکچوونی. هەر لە ڕێگەی ئەو گەمەیەیشەوە منداڵ فێر دەبێت و پێوەندیی بە دنیاوە دەکات.(١٠٨)

دەتوانین بە پێداگرییەوە بڵێین ڕاڤەی ئاکتەکانی یاسادانان (legislative acts) لە سادەترین ئاستە بنەڕەتییەکەیدا، یاریی زمانە، کە ڕێگەی یاسای ڕێنوێنیکەرانەیە بۆ پاڵپشتی مانا. ڕاڤەی تایبەتی یاسای تایبەت لە کۆمەڵێک ئارگیۆمێنتی دیاریکراو پێک دێت، کە دەبێتە زنجیرەیەک جووڵە لە گەمەی ڕاڤەکردنی ئاکتەکانی یاسادانان‌دا... بەپێی ئەو گەمەیە جووڵەی سیماتیکییانە (semiotic practices)ی ئێمە بەو یاسایەوە

---

[١٠٧] Hjördis Nerheim og Viggo Rossvær, Filosofins Historie fra Sokrates til Wittgenstein, Oversættelse og biografier: Niels Christian Stefansen, ٢ udgave, ٢. oplag ٢٠٠٠, Politiken Forlag A/S, København, s.٢٠٥

[١٠٨] Nicolas Xanthos, WITTGENSTEIN'S LANGUAGE GAMES:

لە نێت وەرگیراوە. لینکەکەی ئەمەیە:

http://www.signosemio.com/wittgenstein/language-games.asp

بەندە. واتە هەڵسوکەوت و وشەکانمان شتی ڕوواری نین، (لە خۆیانەوە نین)، بەڵکوو یاسایان هەیە.(١٠٩)
منداڵ لە ڕێگەی ئەو گەمەیەوە فێر دەبێت. بە چی؟ بە پرسیار. پرسیار خۆی پێوەندیی بە تێگەیشتنی ئەو یاسایانەوە هەیە. لە دیدی (لودڤیگ ڤیتگینیشتاین)ـەوە منداڵ بۆیە دەپرسێت، تاکوو لە یاساکانی ئەو گەمەیە بگات. کەواتە ئەوەی تۆ دەیڵێت گوایە ئەو فێربوونە خراپە و نرخی نییە، ئەوا یەکێک لە گەورەترین فیلۆسۆف و زماننناسەکان بەهای گەورەی بۆ دادەنێت. ئەدەب هەر خۆی گەمەیە. نووسین و خوێندنەوە گەمەن.(١١٠) بەوەدا زمان گەمەیە، ئەوا ڕێگەیشە بۆ زانین. منداڵ لە ڕێگەی ئەو گەمەیەوە پێوەندی بە ژیانەوە دەکات. (لودڤیگ ڤیتگینیشتاین) دوای چاپکردنی یەکێک لە گرنگترین کتێبەکانی سەدەی بیستەم، وازی لە فەلسەفە هێنا و چوو لە قوتابخانەی سەرەتاییدا وانە بە منداڵان بڵێتەوە.(١١١)
فێربوون لە فەلسەفەدا مادام لەسەر پرسیار و گومان دامەزراوە، ئەوا زۆر جیاوازە لەو فێربوونەی ئایدیۆلۆجیای سیاسی و ئایینی مەبەستیانە، کە یەقین ڕەگەزی سەرەکییانە.

---

١٠٩ هەمان سەرچاوە

١١٠ هەمان سەرچاوە

١١١ WITTGENSTEIN BIOGRAPHY

لە نێت وەرگیراوە. ئەمە لینکەکەیەتی:

HTTPS://HISTORY-BIOGRAPHY.COM/LUDWIG-WITTGENSTEIN/

جوداکردنەوەی منداڵ لە کۆمەڵگە، یان بە مانایەکی تر دانەنانی منداڵ وەک ئەندامێکی کۆمەڵگە، بەرهەمی ئەو کەلتوورە زارەکییەیە، کە هێزی خۆی لە ئایین و ترادیشنەکانەوە وەردەگرێت. (ئەدلەر) لە بەشی (منداڵ و کۆمەڵگە) لە کتێبی (تێگەیشتن لە سروشتی مرۆڤ)دا ئەو بایەخە بۆ منداڵ دەگەڕێنێتەوە. سەدەیەک لەمەوبەر ئەو سایکۆلۆجیستە ڕەخنە لەو کەسانە دەگرێ، کە بۆچوونی منداڵ بە هەند وەرناگرن، لە کاتێکدا تۆ لەم گوتارەتدا بە زمانی ڕۆژانەی خەڵک پرسیاری منداڵ بە کەم دەزانیت. لەم بارەیەوە (ئەدلەر) دەڵێت: (ئەو منداڵانەی تووشی گاڵتەپێکردن دەبنەوە و بۆچوونیان بە کەم دەزانرێت، ترس لەوە پەیدا دەکەن سۆز و خۆشەویستیی خۆیان دەرببڕن، چونکە لەوە دەترسن کاتێ ئەو سۆز و خۆشەویستییە دەردەبڕن، دیسان گاڵتەیان پێ بکرێت و بە کەم بزانرێن).([١١٢])

ڕەخنەگری میللیی ئێمە، کە هێندە بە ڕقەوە دەنووسێت و هەرچی بێتە بەر دەمی، دەیسڕێتەوە، بەشێکی هۆکارەکەی ئەوەیە لە کەلتوورێکدا چاوی کردووەتەوە، کە تێیدا منداڵ بە کەم دەزانرێت. ئەگەرچی ئەوە کاری هەر داهێنەرێکە تێگەیشتنی ئەو کەلتوورە ڕەت بکاتەوە و تێی بپەڕێنێت، بەڵام ڕەخنەگری میللی توند دەستی پێوە دەگرێت.

---

[١١٢] Alfred Adler, Understanding human nature (W. B. Wolfe, Trans.), New York: Premier Books, Fawcett World Library, p.٤٢

(ماری کلێجز)، کە پرۆفیسۆری ئەدەبی ئینگلیزییە لە زانکۆی کۆلۆرادۆی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، بە ناونیشانی (پۆستۆمۆدێرنیزم) گوتارێکی نووسیوە و تێیدا دەڵێت: (لە سەردەمی پۆستمۆدێرنیزیمدا منداڵ بایەخی گەورەتری لەوەی پێشوو هەیە. لە سەردەمی مۆدێرنیتیدا، کە عەقڵ و مەعریفە هاوواتا بوون، ئەوا پێچەوانەکەی نەزانین، خراپی و شتی تر بوو، کە لە منداڵ، ژن و مرۆڤی سەرەتایی بەرجەستە دەکرا).(١١٣)

لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا زانین (knowledge) یەکسان بوو بە زانست (science). گێڕانەوەکە بەم شێوەیەیە: زانست زانینێکی باشە. گێڕانەوە پێچەوانەکەیشی ئەمەیە: خراپ، دواکەوتوو و ناعەقلانی، کە ئەمە بە منداڵ، ژن، مرۆڤی سەرەتایی و شێت پێوەست دەکرا.(١١٤)

خەسڵەتی سەرەکیی پۆستمۆدیرنیزم تێکشکاندنی سێنترالیزمە، لەپێناوی دۆزینەوە و دەرخستنی ئەو دەنگ و ڕەنگە جیاوازانەی شاردوونیەتیەوە، بۆیە ئەدەبی ئەم سەدەیەی

---

١١٣ Mary Klages, Postmodernism.

لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکەکەیەتی:

https://homepage.univie.ac.at/melanie.loidolt/courses/ws٢٠٠٧Inter/postmodern.htm

١١٤ هەمان سەرچاوە

ڕابوردوو بە ئێستایشەوە بەوە دەناسرێتەوە، خۆی لەو بابەتانە دەدات، کە پێشتر بە کەم دەزانران. سەیر نییە ئەگەر بایەخی ژن لە هیی پیاو و بایەخی منداڵ لە هیی گەورە زیاتر بێت لەو ئەدەبەدا. لە خۆم ڕادەبینم بڵێم هەر لە سەرەتاوە بایەخی گەورەم بەم دووانە داوە. بە مانایەکی تر کارەکتەری پەراوێزخراو (Marginal Characters) هەمیشە لە بەرهەمی مندا شوێنی تایبەتی هەیە، کە لە گفتوگۆکانمدا ئاماژەی پێ دراوە و نووسەرە داهێنەرەکانی خۆیشمان لەبارەیانەوە نووسیوە. دەبێت ئەوەیش بگوترێت، من کاتێ باس لە پۆستمۆدێرنیتی دەکەم، تەنیا مەبەستم ئاستە ڕەخنەیی و فەلسەفییەکەیەتی، نەوەک واقیعی دنیای پۆستمۆدێرنیتی. نامەوێت بڵێم دنیا بە تێپەڕاندنی مۆدێرنیتی بە لای باشیدا گۆڕاوە، یان دەگۆڕێت. وەک (زیگمۆنت باومەن)ی فیلۆسۆف و کۆمەڵناسی پۆڵەندی بە (ڕەق) و (شل) ناویان دەبات، هەمان شتن، بگرە لە سەردەمی (شل)یدا چەمکەکان زیاتر مانای خۆیان لە دەست داوە و داڕووخانی مرۆڤ گەورەتره بووە.(١١٥)

---

١١٥ لەم بارەیەوە کۆمەڵێک کتێبی نووسیون، کە چەمکی شل خاڵی هاوبەشی ناونیشانیانە: (مۆدێرنیتیی شل، ژیانی شل، خۆشەویستیی شل، کاتی شل: ژیان لە سەردەمی نایەقیندا و هتد). بەکورتی (باومەن) دەیەوێت بڵێت کۆمپانیا بازرگانییەکانی سیستەمی سەرمایەداری لە ڕێگەی کۆنسەمپشن (بەکاربردن)ـەوە دەستیان بەسەر مرۆڤدا گرتووە و ئازادییان لێ سەندووەتەوە. وایان لێ کردووە ناسان و خێرا هەموو شتێکی بەسەردا ساغ بکرێتەوە، کە ئەمە تەنیا نیگەرانی، ترس و نائومێدییەکانی تاکی زیاتر کردووە.

# ڕەخنەگری میللی و
# چەمکی دایەلۆگ

دەپرسم: تۆ چۆن بە لای ئەو هەموو فیلۆسۆفەدا تێپەڕیویت و لە گوتارەکانتدا ناوت هێناون، نەکەوتووەتە بەر چاوت، کە پرسیار چییە؟ ئێستایش دەڵێیت پرسیار هێزی خۆی لە وەڵام وەردەگرێت؟ پێت وایە ئەو قسە کرێسپ و سەیرانەی لەبارەی پرسیار و وەڵامەوە کردووتن، لە ئاستی بۆچوونی ئەو فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزانەدا بەهایەکیان هەیە؟ بۆ هەر لە ئاستی فیلۆسۆف و نووسەران، بگرە لە خوار ئاستی تێگەیشتنی باوی خەڵکیش نین؟ ئەم دوو گوتارەت جارێکی تر چاپ دەکەیتەوە؟ ئایا دەستگەی چاپەمەنیی وا هەیە، ئەرکی چاپکردنی نووسینێک لە ئەستۆ بگرێت، کە ئەمە ئاستەکەیەتی؟

ئەمانە تەنیا پرسیارن، دەنا لەگەڵ سڕینەوەیاندا نیم، بەڵکوو لەگەڵ ئەوەدام قسەیان لێوە بکەم. هەر لەبەر ئەوەیشە ئەم نووسینەی بەردەستم هاتووەتە بەرهەم.

تۆ ڕەخنەگری ئەدەبی بیت و باوەڕیشت بە دایەلۆگ نەبێت، پێت وا بێت دایەلۆگ لە پڕۆژەی خوێندنەوە و نووسینت دوور دەخاتەوە و توانات دەکوژێت، لای من هەندێک سەیر دێتە بەر چاو. ئایا جگە لە دایەلۆگ ڕێگەیەکی تر هەیە، مرۆڤ لێیەوە بەر دنیا بکەوێت؟ بەر ئایدیا و تێگەیشتنی جیاوازی ئەوانەی تر بکەوێت؟ (باختین) باوەڕی وایە هەر کاتێ دوو دەنگ هەن، ئەوا دایەلۆگ بوونی هەیە. بەکورتی لەناو هەر دەستەواژە و وشەیەکدا دوو دەنگ بەر یەکتر بکەون، قووڵاییی ئەوانە دەردەکەوێت.([١١٦])

ئەگەر تۆ لەگەڵ نامەکانی مندا دایەلۆگت بکردایە، ئەم دوو گوتارەت دەنووسین؟ یان لانی کەم بەم زمانە دەتنووسین؟ دایەلۆگ بەوەدا بەشی جیانەکراوەی زمانە، توانای هەیە لەو ئاستەمان بەرز بکاتەوە، کە لێیەوە دەستمان پێ کردووە و بە ئاستێکی دیکەمان بگەیەنێت، کە تاکوو ئێستا لامان شاراوە بوو، بۆیە دایەلۆگ هونەری دەرخستنی شاراوەکانە، بۆ ئەوە

---

[١١٦] میخائیل باختین، شعریة دویستویفسکی، ترجمة: الدکتور جمیل نصیف التکریتي، مراجعة: الدکتورة حیاة شرارة، دار توبقال للنشر، الدار البیضاء، ١٩٨٦، ص٢٦٩

نا دەستیان پێوە بگرین و لە ئاستیاندا بوەستین، بەڵکوو بۆ ئەوەی زیاتر و بە هێزێکی گەورەترەوە بەردەوام بین.

(گادامێر) لەوەدا بە (سۆکرات) سەرسامە، کە بە ڕێگەیەکی داهێنەرانە دایەلۆگ لە دژی نەیارەکانیدا بە کار دەهێنێت.([117]) هەر لەم ڕووەوە ئاماژە بە (دایەلۆگەکانی پلاتۆن)یش دەدات، کە هاوڕێی بەردەوامی بوونە و کاریگەریی ئەوان لەسەری زیاتر بووە لەو کاریگەرییەی فیلۆسۆفە ئایدیالیستەکانی ئەڵمان لەسەریان هەبووە.([118])

دایەلۆگ بەوەی دایەلۆگە، جۆرێک لە پێوەندیی ئاڵوگۆڕی (العلاقة التبادلية) لەنێوان دوو لایەندا پێویست دەکات: خود و بابەت، یان بە مانایەکی وردتر لەنێوان (من) و (ئەوەی تر)دا، بەو تێگەیشتنەی ئەو (ئەوەی ترە) تۆیت، یاخود کەسێکی قسەکەرە، توانای هەیە بدوێت و لە دایەلۆگدا بەشدار ببێت. پێوەندەیی ئاڵوگۆڕی مانای پرۆسەسی تێگەیشتن و ڕاڤەکردن لە ڕێگەی دایەلۆگەوە ناکرێت لە یەک ئاڕاستەدا ڕوو بدات، لە (من)ـەوە بۆ (ئەوەی تر) بێت، بەڵکوو پێویستە ئەو پرۆسەسە لە (ئەوەی تر)یشەوە بۆ (من) بێت.([119])

---

[117] هانز جورج غادامير، التلمذة الفلسفية (سيره ذاتية)، ترجمة: علي حاكم صالح ود. حسن ناظم، دار الكتاب الجديد المتحدة، الطبعة الاولى، ٢٠١٣، ص٣٠٩

[118] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

[119] د. سعيد توفيق، في ماهية اللغة وفلسفة التأويل، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٢، ص١٥٤و١٥٥

(هایدیگەر) و (گادامیر) بایەخی زۆریان بە بیرۆکەی پێوەندیی ئاڵوگۆڕی داوە. ([120]) (هایدیگەر) لەبارەی شیعرێکی (هۆڵدێرلین)ـەوە دەنووسێت: ئێمەی مرۆڤ دایەلۆگین. بوونی مرۆڤ لەسەر زمان دامەزراوە، بەڵام زمان لە ڕووی مێژووییەوە لە دایەلۆگ دێتە دی، بەوەی دایەلۆگ هەر ڕوویەک لە ڕووەکانی بەکارهێنانی زمانمان نییە، بەڵکوو زمان تەنیا کاتێک دەتوانێت ڕەسەن بێت، کە دایەلۆگە. وەک شتێکی ئاسایی مەبەستمان لە زمان نموونەی وشە و یاسای ڕێکخستنی قسەیە، کە شتێک نین، جگە لە لایەنی دەرەوەی زمان. کەواتە (دایەلۆگ) چییە؟ بە ڕوونی قسەکردنە لەگەڵ ئەوانەی تردا لەبارەی شتەوە. ئەودەم قسە بریتییە لە میدیەیتە (وسیط)ی نێوانمان لە کۆکردنەوە و پێکگەیاندنماندا... بەڵام هۆڵدێرلین دەڵێت: (کاتێ دایەلۆگ بووین، دەمانتوانی گوێ لە یەکتر بگرین). توانای گوێگرتن ئەنجامی قسەکردنمان نییە لەگەڵ یەکتردا، بەڵکوو لەلایەن پرۆسەسی قسەکردنەوە سەپاوە، بەڵام توانای گوێگرتن خۆی لەسەر بواری وشە وەستاوە (قائمة على امكان الكلمة)، کە پێویستی پێیەتی. ئێمە دایەلۆگین، ئەوە مانای وایە ئێمە دەتوانین گوێ لە یەکتر بگرین.([121])

---

[120] هەمان سەرچاوە، ل١٥٦

[121] هەمان سەرچاوە، ل١٥٧

ئەوە بەشێکە لە بۆچوونی ئەو فیلۆسۆفەی، کە تۆ پێت گوتووین دەیناسیت، بۆیە نازانم چۆن لە گوتاری دووەمتدا نەک هەر دایەلۆگ دەدەیتەوە دواوە و پرسیار بێنرخ دەکەیت، مندالێش لەگەڵیدا، بەڵکوو گلەییت هەیە، کە بە پرسیار لە خوێندنەوەیان دوور خستوویتیەوە. دایەلۆگ وات لێ دەکات زیاتر بخوێنیتەوە، یان لە خوێندنەوە دوور بکەویتەوە؟

(هایدیگەر) بەردەوام پێ لەسەر (دایەلۆگی شیعری)یش دادەگرێت. بۆ نموونە دەنووسێت: دایەلۆگی ڕاستی و ڕاستگۆیانە لەگەڵ گوتەی شیعریی شاعیرێک لە شاعیرەکاندا ناکرێ ئینتیمای بۆ شیعر نەبێت. واتە هەر دەبێت ئەو دایەلۆگە پێوەندیی بە شیعرەوە هەبێت. ئەوە دایەلۆگی شیعرییە لەنێوان شاعیرەکاندا پێک دێت، بەڵام هەندێجار دەکرێ و پێویستیشە دایەلۆگێک لەنێوان فیکر و شیعردا بکرێت، چونکە فیکر و شیعر پێکەوە لەو پێوەندییە ڕوونە بە دەر نین، یاخود دەرباز نابن، ئەگەرچی جیاوازیش بن (بە قسە). ئامانجی دایەلۆگی نێوان فیکر و شیعر وروووژاندنی بوونی قسەیە (وجود الكلام)، تاکوو لەناوچووەکان سەرلەنوێ فێر ببن چۆن لە قسەدا نیشتەجێبوونیان پێ دەبەخشرێتەوە.(١٢٢)

---

١٢٢ مارتن هيدجر، انشاد المنادي، (قراءة في شعر هولدرلن وتراكل)، تلخيص وترجمة بسام حجار، المركز الثقافي العربي، بيروت، الطبعة الاولى،١٩٩٤، ص٢٣

ڕەخنەگرێک خۆی وا ناساندووە ئاگای لەو فیلۆسۆفەیە و لەپاڵ دوو ئازیزی تردا گۆڤاری (شیعر) دەردەکات، ئایا چەند ئەمە لە زمانی ئەم دوو گوتارەیدا ڕەنگی داوەتەوە؟ کامەیە ئەو دایەلۆگەی لەگەڵ بەرهەمی من و هیی نووسەرانی تردا کردوویەتی؟([123]) ئایا کاتێ باوەڕمان بە پێوەری چاکە و خراپە هەیە و دەڵێین ڕەخنە بریتییە لە بڕیاردان، دەتوانین دایەلۆگ بکەین؟

[123] دیارە مەبەستم نییە تانە لەو دوو ئازیزە بدەم، کە باوەڕم بە تێکەڵکردنی کەسەکان نییە و خوێندنەوەی بەکۆمەڵ ئەو شتەیە، شەڕی لە دژ دەکەم.

# ناوی نووسەران و

# گلەییی ڕەخنەگری میللی

بەوەدا لای ئێمە ڕەخنەگری میللی بوونەوەرێکی بێئاگایە لە بوارەکەی خۆیدا، هەر شتێک دەداتە دواوە و بە وڕێنەی دەزانێت، کە لەگەڵ ئەو تێگەیشتنە ساکارەیدا نایەتەوە. لێرەیشدا خەتاکە دەخاتە ئەستۆی نووسەرانی ترەوە و دەڵێت ئەوان هیچیان بۆ گوتن پێ نییە، دەنا خۆی (نووسەرێکی ڕاستەقینە!)یە و لە هەموو شتێک دەگات، چونکە وا لە تێگەیشتن دەڕوانێت، کە ئەو شتەیە خۆی بە زگماک هەیەتی و هەر ئەو ڕووبەرەیە، کەلتووری میللی ناسیویەتی.

لە گوتاری یەکەمتدا کتێبی (ڕاگەردان)ی منت بە وڕێنە داناوە، بێ ئەوەی یەک نموونەی لێ بهێنیتەوە، کە بێگومان لەم نووسینەدا (وڕێنە) یەکێکە لەو چەمکانەی، لێی ورد دەبینەوە،

بەڵام پێویستە لە دەروازەیەکی ترەوە بۆی بچین، کە ئەویش، ئەوەیە، من بەوە تۆمەتبار دەکەیت، گوایە ناوی نووسەران دەهێنم و لێیان تێناگەم، بێ ئەوەی یەک نموونەیان لێ بهێنیتەوە و پیشانی خوێنەریان بدەیت. پێم دەڵێیت لەو نووسەرانە نەگەیشتووم، کە ناویان ڕیز دەکەم. بۆ نەدەهاتی ڕەخنەم لێ بگریت، تاکوو خۆم ڕاست بکەمەوە؟ (ڤیتگینشتاین) دەڵێ لە کتێبی یەکەمیدا کۆمەڵێک هەڵەی گەورەی کردوون، کە ئەوەی یارمەتیی داوە بەو هەڵانەی بزانێت، (فرانک رامسای: F. Ramsey) بووە. هەروەها ناوی (مامۆستا ستراڤا: Straffa)ی زانکۆی کەمبرێجیش دەهێنێت، کە بە هەمان شێوەیە لە سەرنجەکانی سوودی بینیوە.([١٢٤]) سوپاسی زۆریان دەکات.

ئەگەر تۆ پێت وایە من ناوی نووسەران دەهێنم، بەڵام لێیان تێناگەم، دەتوانی چ لەمانەی لێرە ناویان هاتووە و چ لەوانەی لە گوتار و گفتوگۆکانی پێشوومدا باسم کردوون، نموونەیەک بهێنیتەوە؟ لە ئێستاوە سوپاست دەکەم، ئەگەر کارێکی وا بکەیت. ئەگەرچی دەبووایە زووتر بتکردایە، بەڵام پێم وا نییە هێشتا درەنگ بێت. هیچ کاتێ لە خوێنەرم نەشاردووەتەوە، کە بە پلەی یەکەم نووسەری ئەدەبی گێڕانەوەم، بۆیە ڕەخنەدۆزی و ڕاڤەکاری ئیشی سەرەکیی من نین. ئێستایش دەیڵێمەوە، کە

---

[١٢٤] لودفيك فتغنشتاين، تحقيقات فلسفية، ترجمة وتقديم وتعليق: د. عبد الرزاق بنور، إعداد المنظمة العربية لـلترجمة، الطبعة الاولى، بيروت،٢٠٠٧، ص١١٥

دەشێ تێگەیشتنم لە هەر یەکێ لەو چەمکانە لاواز بێت، یان وەک پێویست نەبێت، بەڵام هەوڵم داوە لێیان تێبگەم، کە ئەو هەوڵە بە گرنگ دەزانم. من کەس داوای لێ نەکردبووم و یەک خوێنەر چاوەڕێم نەبوو، کاتێ ئەوانەم دەخوێندەوە. هەرگیز باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێک لە ڕۆژان ببمە نووسەر، بۆیە هێندە بە ئاسانم زانی واز بهێنم. بۆ زانینت بەشێکی زۆری ئەو کتێبانەی لێرە لێم وەرگرتوون، پێشتر خوێندوومنەتەوە، بێ ئەوەی بزانم ڕۆژێک دێت ئاوا بۆیان دەگەڕێمەوە. ئەوە منم لە گوتار و گفتوگۆدا زیاتر لە جارێک گوتوومە تێگەیشتن ئاسان نییە، بەڵام ڕەخنەگری میللی پرۆسەسەکەی ئاسان کردووەتەوە. بۆ نموونە لە (ڕۆشنبیر و جاگەر)دا وام گوتووە.

ئەگەر لە دیدی (هایدیگەر)ەوە بڕوانین، کە تۆ لە فیلۆسۆفانی تر زیاتر ناوی دەهێنیت، ئەوا ئێمە نابێت هەموو شتێک بزانین، چونکە حەقیقەت بە مانا بنەڕەتییەکەی بریتییە لە پرۆسەسی دەرخستن و سەرپۆشلادان لەسەر شتێک (alithia). ئەگەر حەقیقەت دەرخراو بێت، واتە داپۆشراو نەبێت، ئەوا لەناو ئەو دانەپۆشراوەدا پۆشین بڵاو دەبێتەوە. ئەو پۆشینە یان ڕەتکردنەوەیە، یان نکوولّیکردنە، کە هەردووکیان پێکەوە حەقیقەتی نەگەتیڤ، یاخود ناحەقیقەت پێک دەهێنن. ئەو حەقیقەتە نەگەتیڤە، یاخود ئەو ناحەقیقەتە مەرجە بۆ ڕوودانی حەقیقەت، بەو مانایەی دەرخستنە. کەواتە حەقیقەت بەو

شێوەیە ڕوو دەدات، کە هاوکات شاردنەوەی تێدا بێت، چونکە مرۆڤ نابێت هەموو شتێک بزانێت، بەوەی کاتێ هەموو شتێک دەزانین، مانای وایە لێرەدا شتێکی ناشاراوە، یان دانەپۆشراو ماوە لە بواری کراوەی هۆشیاریی مرۆییدا، بەڵکوو هەموو بوارەکە شاراوە و داپۆشراوە، بۆیە کردنەوەی بواری هۆشیاری، کە تێیدا دەرخستن و شاردنەوە ڕوو دەدەن، مەرجی میتافیزیکای پێشوەختە لە ڕووداني حەقیقەتدا. بە هەمان شێوە دەکرێ بگوترێ تێگەیشتنی حەقیقەتی زمان کردنەوەی بواری هۆشیاری دەخوازێت لە تێگەیشتنی زمان بەو سیفەتەی گوتەیەکە ئەوەی دەردەکەوێت و ئەوەی دەرناکەوێت؛ پێشان دەدات، هەروەها ئەوەی دەکرێت گوتراو و دیار (منطوقا وظاهرا) لە قسەدا، ئەوەی دەکرێت شاراوە و داپۆشراو بێت لە بێدەنگیدا.([١٢٥])

تێنەگەیشتن کارێکی ئاسایی و تێگەیشتنیش ڕێژەییە، کە هەر یەکەمان بە شێوەیەک لە چەمکێک تێدەگەین. بە هۆی ڕەخنەکانی (نیتشە)، (هایدیگەر)، (فۆکۆ)، (دێریدا) و ئەوانەی تر لە راشنالیتی (عەقلانیەت)، کە عەقڵی هەم دەکردە ئامڕاز و هەم پێوەر بۆ تێگەیشتن، بەو مانایەی تێگەیشتنی بە ڕەها دەزانی و هەر شتێکی بە ناتێگەیشتن دادەنا، کە زانست و عەقڵ پاڵپشتییان نەدەکرد، ئەوا چەمکی تێگەیشتنیش وەک هەموو

---

[١٢٥] د. سعيد توفيق، في ماهية اللغة وفلسفة التأويل، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٢، ص٣٤و٣٥

چەمکەکانی تر گۆڕانی بەسەردا هات و لەوە دەرچوو سنووری هەبێت، بۆیە زیاتر لە ڕێگەیەک، بگرە بێژمار ڕێگەی تێگەیشتن دەرکەوتن و ئەو سێنترالیزمە تێک شکا. دوالیسمی تێگەیشتن و ناتێگەیشتن کورتی هێنا و دابەشکردنێکی لەم شێوەیە هێزی خۆی لە دەست دا. بە مانایەکی تر، دەستەڵاتی حەقیقەتی بابەتی (Objective Truth)، کە هەموو دەنگێکی دەرەوەی خۆی سەرکوت دەکرد، پێداچوونەوەی بۆ کرا و لە بەرانبەریدا ڕێژەییبوونی چەمکەکان بایەخی پێ درا. لەمەوە ئاڕاستەی نوێ لە فەلسەفە، ئەدەب، مێژوو، سۆسیۆلۆجیا و بوارەکانی تردا هاتنە کایەوە.

بەوەدا ڕەخنەگری میللی لەم گۆڕانکارییانە بێئاگایە، ئەوا هێشتا هەر بەو پێوەرەی لە کۆمەڵگەی وەرگرتووە، بە مانایەکی تر بەو پێوەرەی لە داپیرە و باپیرە ئازیزەکانی وەرگرتووە، لەو دوو چەمکە دەڕوانێت، لە کاتێکدا دەبووایە ئەو لە پێش ئێمەی نووسەرانی ئەدەبەوە بەو شتانە بگەیشتایە و ئاسۆی بیرکردنەوەمانی پێ فراوان بکردنایە.

من هەوڵ دەدەم لەو چەمکانە تێبگەم و بەردەوامیش گوتوومە مەرج نییە باش لێیان تێگەیشتبێتم. بەکورتی ئەمە تێگەیشتنی تایبەتی منە و هیی کەسێکی تر نییە، بۆیە سبەی یەکێکی تر دێت و لە بەرانبەر ئەم تێگەیشتنەی مندا هیی خۆی دەردەخات، نەوەک بیسڕێتەوە، وەک چۆن من ئەوەی تۆ ناسڕمەوە،

بەڵکوو قسەی لێوە دەکەم. سڕینەوە واتە گەڕانەوە بۆ پێوەر، چونکە من تەنیا کاتێ ڕێگە بە خۆم دەدەم بۆچوونێک بسڕمەوە، کە پشت بە پێوەرێک ببەستم و وەک تاقەسەرچاوە لەو پێوەرە بڕوانم، کە ئەمە وەک گوترا لە فیکری ڕەخنەییدا تێ پەڕێنراوە.

کەواتە شتێک نییە بە ناوی سڕینەوە، بەڵکوو ئەوەی هەیە تێپەڕاندنە و پێشاندانی ئاستێکی بەرزترە لەوەی هەیە. بەهەرحاڵ ئەمە تێگەیشتنی منە. ئەوە نەهامەتییە تۆ کۆمەڵێک چەمک فڕێ بدەیت و وا خۆت دەربخەیت لێیان گەیشتوویت، لە کاتێکدا نەتەوێت گفتوگۆیان لەبارەیەوە بکەیت. من ئامادە بووم لەبارەی هەر وشەیەکەوە نووسیومە، گفتوگۆ بکەم. ئەوەتا لەگەڵ ئەوەیشدا وازم هێناوە، کەچی لەپێناوی ئەم دایەلۆگەدا گەڕاومەتەوە. دوای ئەوەی وازهێنانی خۆم ڕاگەیاند و تۆ هەر خێرا بە گوتارێک هێرشت کردە سەرم، من نامەیەکم بۆ نووسیت و تێیدا باسی چەمکی تێنەگەیشتنم بۆ کردیت، کە ئەمە بەشێکیەتی:

(تێگەیشتنی تەواو مەحاڵە، بەڵکوو تەنیا لە بەشێکی هەر شتێک دەگەم. تێنەگەیشتن ئەو هێزەیە وامان لێ دەکات بەردەوام بین، دەنا تێگەیشتن ئەگەر چەقی بەست، لە کار دەکەوێت. دەمێکە گوتوومە هۆشیاری بۆ ئەوەی نەبێتە خواوەند، دەبێت لە ژیانی ڕۆژانەدا بە کاری بهێنین. ئەگەر هۆشیاری بۆ ئەوە

بێت ئەوانەی تری پێ بشکێنین، ئەوە خواوەندە و ئێمەی کردووەتە کۆیلە. گوتوومە چێژی گەورە لەوەدا نییە بەر هۆشیاری دەکەویت، بەڵکوو لەوەدایە بە کاری دەهێنیت، چونکە ئەگەر بە کاری بهێنیت، هەست دەکەیت ئەو پیرۆزییەی لە دەست دەدات و دەبێتە شتێک وەک هەموو شتەکانی ترت. چێژ کاتییە و لە ناو دەچێت، بۆیە پێویستت بەوە هەیە هیی تری بخەیتە شوێن، کە ئەمە وا دەکات پرۆسێسی هۆشیاری بچێتە باری دینامیکییەوە و کۆتاییی نەیەت، مادام بووەتە شتی بەردەوامی ڕۆژانەت).

(دۆلۆز) و (گاتەری) لە بەشی یەکەمی کتێبی (فەلسەفە چییە؟)دا، کە ناونیشانی (چەمک چییە؟)یان بۆ داناوە، دەنووسن: (چەمکی ئاسان بوونی نییە. هەر چەمکێک پێکهاتە -componet ی خۆیی هەیە، کە بەو پێکهاتەیەی پێناسە دەکرێت. چەمک چەندبارەییە - multiplicity- ، ئەوە ئەگەر نەگوترێت هەر ژمارەیەک چەمکێکە. هیچ چەمکێک نییە تاکپێکهاتە بێت - with only one component- تەنانەت چەمکی سەرەتا، یان چەمکی یەکەم، کە فەلسەفە لێیەوە دەستی پێ کردووە، کۆمەڵێک پێکهاتەی هەن - has several components-.([126])

[126] Gilles Deleuze and Felix Guattari, What Is Philosophy?

هەر (دۆلۆز) و (گاتەری) لە شوێنێکی تری کتێبەکەدا دەڵێن: لە لایەکی ترەوە چەمکەکان لەسەر هەمان ئاستدا پێوەندییان پێکەوە هەیە. لێرەدا چەمکەکان بە یەک دەگەن، کۆمەکی یەکتر دەکەن، سیمای یەکتر ڕێک دەخەن، دەچنەوە سەر هەمان فەلسەفە -belong to the same philosophy- هەتا ئەگەر مێژوویشیان جیاواز بێت.(١٢٧) واتە دەشێ چەمکێکی فەلسەفی و یەکێکی سایکۆلۆجی، یان چەمکێکی ئەدەبی و یەکێکی سۆسیۆلۆجی بە شێوەیەک لە شێوەکان بە یەک بگەنەوە، با لە کاتی جیاوازیشدا دەرکەوتبێتن، کە بۆ تێگەیشتنیان پێویستمان بەوە دەبێت لە هەموو کایەکاندا بۆیان بگەڕێین و لێیان بکۆڵینەوە. ئایا ئەمە پرۆسەسێکی ئاسانە؟ بەڵێ، ئەوەی (دۆلۆز) و (گاتەری) بە سەختی دەزانن، لای ئێمە بە ڕادەیەک ئاسان کراوەتەوە، نەبێتەوە. هێندە بەسە بزانیت چی خراپە و چی باش، ئیتر دەبیتە ڕەخنەگر.

ڕاستییەکەی من گومانم لەوانەیە تێدەگەن، نەوەک لەوانەی تێناگەن، چونکە ئەوە تێنەگەیشتنە هێزمان دەداتێ بەردەوام بین و نەوەستین، لە کاتێکدا تێگەیشتن واتە گەیشتن بە خاڵی کۆتایی و وەستان. تێنەگەیشتن چەمکێکی نیگەرانە، بۆیە لە

---

ئەمە لینکەکەیەتی:

https://transversalinflections.files.wordpress.com/٢٠١٥/٠٤/deleuze-٣٢٠٧-what_is_philosophy-fenomenologie-van-schilderkunst.pdf

[١٢٧] هەمان سەرچاوە

شوێنێکی دیاریکراودا خۆی ناگرێت و هەمیشە لە جووڵەدایە، بەڵام تێگەیشتن چەمکێکی ئاسوودەی بێخەمە و نایەوێت ئەو شوێنەی خۆی جێ بهێڵێت. ئەوەی گوتووتە (بە پرسیار لە پرۆژەی خوێندنەوە و نووسین کراویت) و (ئەو توانایەی هەتە، ویستوویانە کپی بکەنەوە)، بەرهەمی تێگەیشتنە. تۆ پێت وایە تێگەیشتوویت و پرسیار هەڕەشەیە بۆ سەر ئەو تێگەیشتنەت، بەڵام من بۆیە هێندە بە ئاسایی ئەو قسەیەت لێ قەبوول دەکەم، کە تێناگەم، چونکە پێویستم بە تێگەیشتن نییە و نامەوێ پێی بگەم.

(بێرتراند راسێل) پێشەکیی بۆ کتێبی (Tractatus Logico-Philosophicus)ی (لودڤیگ ڤیتگینیشتاین) نووسیوە، کەچی ئەوەی دواییان دەڵێت (راسێل) لە مەبەستەکانی نەگەیشتووە.(١٢٨)

---

١٢٨ WITTGENSTEIN BIOGRAPHY

لە نێت وەرگیراوە. ئەمە لینکەکەیەتی:

HTTPS://HISTORY-BIOGRAPHY.COM/LUDWIG-WITTGENSTEIN/

# ڕەخنەگری میللی

## چۆن لە چەمکی وڕێنە گەیشتووە؟

کورتکردنەوەی ئەدەب و فیکر لە وڕێنەدا تەنیا لەبەر ئەوەی لێی تێناگەیت، دیسان پێوەندیی بەوەوە هەیە، کە تۆ لە لایەک پێوەری چاکە و خراپەت بۆ هەڵسەنگاندن داناوە و لە لایەکی تر باوەڕت بە پرسیار و دایەلۆگ نییە. ئەمە دواجار بەلاوەنانی پرۆسەسی ڕاڤەکردنە، کە کاری سەرەکییە لە نزیکبوونەوە لەگەڵ تێکستدا. ئەگەرچی ئەمە سەیر دێتە بەرچاو ڕەخنەگرێک خاوەنی تێگەیشتنی لەم شێوەیە بێت، بەڵام من مامەڵە لەگەڵ نووسراودا دەکەم. ئەوەی لە بەردەممدایە، ئەمانەی تێدا نووسراون و دەبێت لاکەی تریان دەربخەم.

(پۆل ریکۆر) لەو بەشەی لە ژێر ناونیشانی (لە خەملاندنەوە بۆ باوەڕکردن: From Guess to Validation)دایە لە کتێبی (تیۆریی ڕاڤەکردن، سەرپلەسی مانا)دا دەپرسێت بۆچی

پێویسته یەکەم کردار له کردارەکانی تێگەیشتن شێوەی خەملاندن وەربگرێت؟ هەروەها پێویسته له تێکستدا چی بخەملێنین؟[129]

مەبەستی (رێکۆر) ئەوەیه، که هەر تێکستێک له کۆمەڵێک ئاراستەی جیاواز پێک دێت و فرەگۆیه. کەواته هەمیشه زیاتر له رێگەیەک بۆ راڤەکردنی تێکست هەن. راست نییه بگوترێت راڤەکانیش هەموویان وەک یەک وان.[130] بەم شێوەیه نزیکترین و روونترین مانای هێرمۆنیتیکا گریمانکردنی بوونی مانای دەرەکی و مانای ناوەکییه له هەر سیمبۆڵ و تێکستێکدا. کاری راڤەکەر دەرخستنی مانای ناوەوەیه، چونکه ئەو مانا راستییەکەیه.[131] دیاره دۆزینەوەی ئەم مانا ناوەکییه دەکەوێته سەر بینینی ئەو راڤەکارەی لێی دەڕوانێت و له رێگەی پرسیارەوه بەری دەکەوێت.

بەوەدا رەخنەگری میللی یەک لۆژیکی بۆ خوێندنەوه هەیه و ئاگای له تیۆرییەکانی راڤەکردنی تێکست نییه، ئەوا پێشتر بڕیاری داوه چی بەو تێکسته دەڵێت، که رووبەڕووی دەبێتەوه. کەواته ئەو رەخنەگرەی حوکم لەسەر تێکستێک

[129] Paul Ricoeur, Interpretation Theory: Discourse and the Surplus of Meaning, Texas Christian University Press, ١٩٧٦, pp.٧٥

[130] هەمان سەرچاوه، ل٧٩

[131] بول ريكور، الذات عينها كآخر، ترجمة وتقديم وتعليق، د. جورج زيناتي، المنظمة العربية للترجمة، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٥، ص١٥

دەدات و بە بڕیارێک دەیسڕێتەوە، ئەوا هاوکات هەموو ئەو ڕاڤانەی تریش دەکوژێت، کە بۆ ئەو تێکستە دەکرێن، بگرە هەر لە بنەڕەتەوە بە مەبەستی ڕاڤەکردن لەو تێکستە نزیک نەبووەتەوە.

لە پێشەکیی کتێبی (ڕاگەردان)دا، کە تۆ پێت وایە وڕێنەیە، نووسیومە: {هەمیشە باوەڕم وا بووە جیاوازیی نێوان نووسەری ئەدەبی و فیلۆسۆف ئەوەیە، کە یەکەمیان دوو ئەرک و دووەمیان یەک ئەرکی لە ئەستۆیە. واتە کاری فیلۆسۆف فەلسەفەیە، بەڵام هیی نووسەری ئەدەبی پێکڕا ئەدەب و فەلسەفەیە، بۆیە ئاسان نییە مرۆڤ ببێتە نووسەری ئەدەبی، لە کاتێکدا نووسینی ئەدەب و ڕەخنە لای ئێمە هێندە ئاسان کراوەتەوە، بە ڕادەیەک هەر کاتێ بتەوێت، دەتوانیت دەستی بۆ ببەیت.

ئەدەب توانای تێکشکاندنی هەموو ئەو حەقیقەتانەی هەیە، کە فەلسەفە و زانست دوای هەوڵی زۆر پێیان گەیشتوون. ئەدەب بەوە دەناسرێتەوە ڕێگە نادات هیچ حەقیقەتێک تەمەنی درێژ بێت، بەڵکوو خێرا تێکی دەشکێنێت، با ئەو حەقیقەتە هیی خۆیشی بێت، مادام تەنیا دوای تێکشکانی، ئینجا وردەکارییەکانی دەردەکەوێت. بەم جۆرە تێکستی ئەدەبی کاتێ فۆرمی جیاوازی خۆی وەردەگرێت، کە شتە گەورەکان بۆ پارچەی وردورد دەگۆڕێت، بە ڕادەیەک بۆ هەر پارچەیەک

سەربەخۆیی فەراهەم دەکات، بێ ئەوەی ئەمە ببێتە هۆی بچڕانی ئەو پێوەندییە شاراوەی نێوانیان، کە لێرەدا گرنگیی مێتافۆر و ڕێتۆریک (مەجاز و ڕەوانبێژی) دەردەکەوێت، بەوەی زمانی ئەدەب زمانێکە پڕە لە پرۆبلەماتیک و ئیمبیگویتی، زمانێکە ڕێگەت نادات تەنیا بە یەک ئاڕاستەدا بیخوێنیتەوە. دەکرێت بڵێم زوو ئەو تێگەیشتنە سواوەم تێپەڕاند، کە مرۆڤ بەسەر لایەنی چاکە و لایەنی خراپە دابەش دەکات.

هەر لە منداڵییشەوە پێچەوانەی زۆربەی خەڵک من لەو فیلمانەی چ لە تەلەڤزیۆن و چ لە سینەمادا دەمبینین، دژی ڤیلەن (Villain) نەبووم. واتە ئەو ئەکتەرەی ڕۆڵی بەدکار دەبینێت. جارێ هەر کاتێ پۆلیس ڕاوی تاوانباری نابێت، من هیوام خواستووە بۆی نەگیرێت، هەتا ئەگەر تاوانەکەی زۆریش گەورە بووبێت. ئەمە لە بواری نووسینی ئەدەبدا سوودی پێ گەیاندم. هەر لە سەرەتاوە ئەو تێگەیشتنە وای لێ دەکردم لە ڕاستەوخۆیی دوور بکەومەوە، بەڵکوو هەمیشە هەوڵ بدەم ماناکان بشارمەوە و لە ڕێگەی ئاماژەوە بیانگەیەنم. منداڵێکی بزێوم دەهێنایە بەرچاوم، کە دایکی لەگەڵ خۆی بۆ لای پووری دەبات، چونکە تازە منداڵێکی بووە و ئەو کۆرپەیە گوێچکەی نییە. دایکی ئامۆژگاریی دەکات، کە بە هیچ شێوەیەک ناوی گوێچکە نەهێنێت، نەبادا دڵی پووری ئازاری

پێ بگات. ئەویش بەڵێنی پێ دەدات بە لای ئەو وشەیەدا نەچێت. لەوێ بە پووری دەڵێت: (لە ئێستاوە گوێزەری بدەرێ! ڕاستە هێشتا ددانی دەر نەکردووە، بەڵام خۆ دەتوانیت بۆی بکەیتە شەربەت. گوێزەر چاوی تیژ دەکات. ئەگەر چاوی کز ببێت، پێویستە چاویلکەی بۆ بکرێت. ئەوەیش قەیدی ناکات. ڕۆژانە زۆر کەس دەبینین چاویلکەیان هەیە، بەڵام پێم ناڵێت ئەم منداڵەی تۆ چۆن بیکاتە چاوی؟).}

سیمبۆڵ یەکێکە لە ڕەگەزە گرنگەکانی ئەدەب، کە وا دەکات هەر پارچەیەک بە کۆمەڵێک ئاراستەی جیاواز بخوێنرێتەوە. (جلبیێر دۆران: Gilbert Durand) لە کتێبی (خەیاڵی سیمبۆڵی)دا لەسەر ئەو چەمکە شەڕانگێزەدا وەستاوە و لێی کۆڵیوەتەوە. لە شوێنێکی کتێبەکەدا بۆچوونی (یۆنگ) لەو بارەیەوە شی دەکاتەوە و دەڵێت لە ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ پێناسەی کلاسیکیی سیمبۆڵ، دووبارە ئەوە بە ڕوونی دەردەخات، کە فرەئاماژەیە (ئەوە ئەگەر نەگوترێت ئاماژەکانی یەکسانن). دەگەینە ئەوەی بڵێین سیمبۆڵ ناتوانێت خۆی بە یەک ئەنجامەوە بچوێنێت، مەگەر بۆ یەک هۆکاری بگۆڕین. سیمبۆڵ بۆ شتێک لە شتەکان دەگەڕێتەوە، بەڵام بۆ تاقە شتێک ناگۆڕێت.([١٣٢])

---

[١٣٢] جيلبير دوران، الخيال الرمزي، ترجمة: علي المصري، الطبعة الثانية، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٩٤، ص٦٤

واتە سیمبۆڵ چەمکێکی کراوەیە لە بەردەم هەر لێکدانەوەیەکدا، کە ئەمەیش وا دەکات نەتوانین ئەنجامی بۆ دابنێین، یاخود بۆ هۆکارێکی دیاریکراوی بگەڕێنینەوە. پێم وایە هەر مرۆڤ خۆی خودێکی سیمبۆڵیی هەیە، بەوەی ئەگەر بەشێکی دەرەوەیمان لێ دیارە، ئەوا بەشە بێسنوورەکەی ناوەوەیمان لێ شاراوەیە، کە ئەو دەرەوەیە لایەنی سیمبۆڵیی ناوەوەیەتی، بۆیە ناکرێت لە ڕەهەندێکدا کورتی بکەیتەوە، وەک ئەوەی ڕەخنەگری میللی دەیکات. کاریگەریی دۆخە دەروونییەکان لە دەرەوەدا دەردەکەون و ئێمە وەک سیمبۆڵ لەسەر جەستەدا دەیانبینین. کاتێ لە ناوەوە ئاسوودەیە، پێدەکەنێت، کاتێ دڵشکاوە، دەگری، وەختێکیش تووڕەیە، دەمارەکانی گرژ دەبن، کە هەموو ئەمانە سیمبۆڵن و تەنیا بەشێکی کەمی ئەو مرۆڤەمان بۆ دەردەخەن، بەڵام بەشە شاراوەکەی، ئەوا دەمانخاتە بەردەم پرۆسێسی گەڕان و ڕاڤەکردنەوە، بێ ئەوەی ڕێگەمان بدات بە ئەنجامێکی دیاریکراو بگەین. هەر لەبەر ئەوەیشە ڕاڤەکان وەک (ریکۆر) پێی لەسەر دادەگرێت، تەنیا خەمڵاندن و هیچ ڕاڤەیەکیش نییە لەوەی تریان بچێت. لەبەر ئەوەیە بێژمار لێکدانەوەمان لەبارەی مرۆڤەوە هەن. هەر لەبەر ئەوەیشە ئەو هەموو جۆرەی زانستی مرۆڤایەتی سەریان هەڵداوە، کە ئەگەر خاڵی هاوبەشیان بریتی بێت لە تێگەیشتن لەو مرۆڤە، ئەوا ڕێگەکانیان جیاوازن. هێزی هەر تیۆری و زانستێکیش لەوەدایە چیی نوێ دەخاتە سەر ئەو تێگەیشتنە، بەڵام پێوەری چاکە و

خراپە، کە وەک (نیتشە) دەریدەبڕێت هیی مرۆڤی ناو مێگەلە، نەک هیچ شتێک بەو تێگەیشتنە نابەخشێت، بەڵکوو ئەوە خودی ئەو پێوەرەیە، کە دەبێت بەردەوام تێ بپەڕێنرێت. {لێرەدا مەبەستمان لە وشەی مێگەل (Herd)، بە مانا فەلسەفییەکەیەتی، نەوەک بە مانا باوەکەی}. دەستپێوەگرتنی ڕەخنەگری میللی بەو پێوەرە لەبەر ئەوە نییە شتێکی نوێی داهێناوە، بەڵکوو بەو پێوەرە لە دایک بووە و هێشتا بەر شتی نوێ نەکەوتووە، تاکوو لەو ڕێگەیەوە بەری بدات.

(تۆدۆرۆڤ) لە دژی ئەو تێگەیشتنە سواوە دەوەستێتەوە، کە تێکستی ئەدەبی دەخاتە ژێر تاقیکردنەوەوە و بە پێوەری چاکە و خراپە، درۆزنی و ڕاستگۆیی لێکی دەداتەوە. لەم ڕووەوە دەنووسێت: (ئەوەی دەگوترێت گوایە تێکستی ئەدەبی بۆ واقیعێک دەگەڕێتەوە، کە ئەو واقیعە سەرچاوەکەیەتی، واتە ئێمە هەر بە ڕاستی پێوەندیی ڕاستگۆیی لەنێوانیان دادەمەزرێنین و ڕێگە بە خۆمان دەدەین دیسکۆرسی ئەدەبی ملکەچی تاقیکردنەوەی حەقیقەت بکەین، واتە دەستەڵاتی حوکمدان لەسەری بە هەڵە و ڕاست).([١٣٣])

ڕەخنەگری میللی دەیەوێت ئەدەب ڕوون بێت و بەڵگەی هەبێت، کە هەمان ئەو شتەیە پێشتر ناسیومانە، واتە شتێک

---

[١٣٣] تزفيطان طودوروف، الشعرية، ترجمة شكري المبخوت ورجاء بن سلامة، دار توبقال للنشر، دار البيضاء، المغرب، الطبعة الثانية، ١٩٩٠، ص٣٤و٣٥

نییە لە دەرەوەی سنووری تێگەیشتنی خۆیدا، بۆیە بەو پێوەرەی خۆی دەیپێوێت، ئایا چاکە، یان خراپە، درۆیە، یان ڕاستە؟ لە پێشەکیی کتێبی (ڕاگەردان)دا نووسیومە:

(لای ئێمە ئەم دۆخە تاکوو ئەمڕۆیش بەردەوامە، کە ڕەخنەگری دیمۆتیک ڕۆمانێکی گەورە تەنیا لەبەر وشەیەک ڕەت دەکاتەوە، کە خۆی پێی وایە هەڵەیە، بێ ئەوەی باس لەوە بکات بۆچی هەڵەیە. لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا ڕەخنەگرێک لەبارەی بەرهەمی نووسەرێکەوە هەندێک شتی نووسیبوو، کە چ من و چ هاوڕێکانم بە هەموو سادەییی خۆمانەوە قاقامان لێ دەدا. لە منیان پرسی: ئەمە چۆن لێک دەدەیتەوە؟ گوتم: ئەکتەرێک لە فیلمێکدا بەشداری دەکات و ڕۆڵی کەسێک دەبینێت، کە ئەو کەسە دەستێکی قرتاوە. هەر ئەو ئەکتەرە لە فیلمێکی دیکەدا دەردەکەوێتەوە و ڕۆڵی کەسێکی دیکە دەبینێت، کە سێ دەستی هەن. ڕەخنەگرێک ڕەخنە لە فیلمی یەکەم دەگرێت و هەموو ڕەخنەکەیشی ئەوەیە، کە ئەکتەرەکە بە ڕاستی دەستی نەبڕاوەتەوە. بەڵگەی چییە؟ لە فیلمی دواتردا نەک دوو دەست، بەڵکوو سێیانی هەن. هەرگیز بە لای ئەوەدا ناچێت، کە ئەکتەر کاری ئەوەیە ئاکتی کەسانی دیکە بکات و مەرج نییە ڕووداوەکان ڕاستەقینە بن. ئاخر ئەگەر ئەکتەرێک بۆ ئەوەی ڕۆڵی کەسێک ببینێت دەستی براببێتەوە، پێویستە بە ڕاستی دەستی ببڕێتەوە و لەوەی

دیکەیشیان قاچێکی لێ بکرێتەوە، بەشی چەند فیلم دەکات؟ هەر کاتێ دەزانیت یەک ئەندامی لەشی نەماوە. هەر بەم شێوەیە ڕەخنەگر فیلمی دووەمیشی بە خراپ دەزانێت، بگرە دەڵێت سەرجەم کارەکانی لاوازن، مادام بۆی دەرکەوتووە و بەڵگەی هەیە بە ڕاستی دەستی نەبڕاوەتەوە. ئەمڕۆ پێم وایە ڕەخنەی ڕەخنەگری میللی بۆیە هێندە لاوازە، چونکە پشت بە بەڵگە دەبەستێت. پێویستە جیاوازی لەنێوان لۆژیک و بەڵگەدا بکەین، کە دوو شتی تەواو لە یەکدی جیاوازن. کاتێ دەڵێین لۆژیک، مەبەستمان لە لۆژیکی ناوەوەی تێکست خۆیەتی، نەوەک لۆژیکێکی دیکە. لە بڕیاری ڕەخنەگری میللیدا ئەوەی زیانی پێ ناگات، تێکستی سادەیە، چونکە ئەو تێکستە هەمان زمان و تێگەیشتنی ڕۆژانەی هەیە. بەڵگەی زۆری هەن، کە لە واقیع نزیکە، بگرە هەر خۆی بە شێوەیەک لە شێوەکان لاساییکردنەوەی واقیعە. سەیر نییە ڕەخنەگری میللی هێندە بەو تێکستانە سەرسامە، کە سەری لێیان دەردەچێت. شتەکە لەگەڵ تێکستی قووڵدا تەواو جیاوازە. بۆ ئەوەی تێکستێک وەک قەوارەیەکی سەربەخۆ و جیاواز پێک بێت، پێویستی بەوەیە مەودایەکی فراوان لەنێوان خۆی و ئەو واقیعەدا بخوڵقێنێت، کە لە ناویدا پێ گەیشتووە. ئەمە وا دەکات خوێنەر ڕێگە بە خۆی نەدات بە هەمان پێوەری واقیع بیخوێنێتەوە، بەڵکوو ئەوەی بەسەردا دەسەپێنێت هەوڵی دۆزینەوەی کۆدەکانی بدات و تایبەتمەندییەکانی بناسێتەوە. ڕەخنەگری میللی کاری ئاوای لە

دەست نایەت، بۆیە پەنا بۆ بڕیار دەبات و بە چەند وشەیەکی حازربەدەست دەیسڕێتەوە).

(هایدیگەر) پێی وایە کاری هونەری لە هەموو شوێنێکدا هەیە. بەرد لە کاری هونەریی تەلارسازیدا، درەخت لە کاری هونەریی هەڵکۆڵیندا، ڕەنگ لە تابلۆی نیگاردا، دەنگ لە کاری هونەریی زماندا، ئاواز لە کاری هونەریی میوزیکدا هەیە. کەواتە سیمای شمەکی (الشیئي) لە هیچ کارێکی هونەری دانابڕێت، تەنانەت خەریکە بە حەتمی پێچەوانەکەی بڵێین، کە تەلار لە بەرد، هەڵکۆڵین لە درەخت، تابلۆ لە ڕەنگ، کاری زمانی لە دەنگ، کاری هونەریی میوزیک لە ئاوازدا هەیە.... بەڵام ئەو شمەکییە سروشتییە چییە لە کاری هونەریدا؟.... کاری هونەری ڕەهەندێکە، شمەکی تێ دەپەڕێنێت. ئەو شتەی تر، کە تێیدا خۆی حەشار دەدات، ئەوەیە دەبێتە کاری هونەری. کاری هونەری شتێکی دروستکراوە، بەڵام شتێکی تر دەڵێت، کە ئەو شتە ڕووت (مجرد)ـە نییە لە خودی خۆیدا.([١٣٤]) لێرەدا (هایدیگەر) ناو لەوە دەنێت (میتافۆر) و دواتر بە (سۆمبۆڵ)ـەوە گرێی دەدات.([١٣٥]) بەڵام (شت) لای (هایدیگەر) چییە؟ لە لاپەڕەکانی دواتردا بەشێکی سەربەخۆی بۆ تەرخان

---

[١٣٤] مارتن هایدغر، اصل العمل الفني، ترجمة: د. ابو العید دودو، المانیا، منشورات الجمل، الطبعة الاولی، ٢٠٠٣، ص٣٣

[١٣٤] هەمان سەرچاوە، ل٦٢

[١٣٥] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

کردووه: (وشەی شت بە هەر شتێک دەگوترێت، کە نیهل نییە).([١٣٦]) واتە عەدەم نییە. (هەر بەو مانایە کاری هونەرییش شتە، ئەگەر بە شێوەی ڕەها بوونی هەبوو).([١٣٧])

(گادامێر) هەر لەو پێشەکییەدا، کە بۆ کتێبی (سەرچاوەی کاری هونەری)ی (هایدیگەر)ی نووسیوە، دەڵێت: {شتەکان تەنیا شتی ڕووتن، بەو مانایەی لێرەدا هەن، بە چاوپۆشین لەوەی بۆ بەجێهێنانی خزمەتێک دەست دەدەن، یان نا. (هایدیگەر) ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە تێگەیشتنی وجوودی جۆرێکی وا لەسەر ئەو شێوازەی هاوڕێکە لەگەڵ ئەو پرۆسەسە چەسپاو و مەبەستدارەی لە زانستی نوێدا هەیە، ڕێگە نە بە شتبوونی شت و نە بە ئامێربوونی ئامێر دەدات. بۆ ڕوونکردنەوەی ئامێربوونی ئامێر بە کارێکی هونەرییەوە پێوەستی دەکات، کە تابلۆیەکی (ڤان گوخ)ە، بریتییە لە پێڵاوی جووتیارێک. ئەوەی لەم کارە هونەرییەدا دەردەکەوێت، خودی ئامێرەکەیە، واتە نەک تەنیا هەبوون (الموجود)ەکە، دەشێ بۆ بەجێهێنانی خزمەتێک دەست بدات، بەڵام ئەوە شتە، وا دەکات بوونەکەی (وجودە: بە عەرەبی) خزمەت بکات، یان پێویستە لەسەری خزمەتی خاوەنی پێڵاوەکە بکات. ئەوەی لە کارە هونەرییەکەی نیگارکێشدا دەردەکەوێت و ئەوەی بە زەقی دەریدەخات، جووتە پێڵاوەکە نییە، بەڵکوو جەوهەری ڕاستەقینەی ئامێرە،

---

[١٣٦] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٦٤

[١٣٧] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

که ئەو لە پێیەتی. سەرجەم ژیانی لادێی لەو پێڵاوەدا بەرجەستە کردووە. کاری هونەری وایە، که لێرەدا حقیقەتی موجوود دەردەکەوێت. پێویستە لەسەرمان تێبگەین، کە دەرکەوتنی حەقیقەتێکی لەم چەشنە لە کاردا بەرهەم دێت بەپێی ئەوەی تێیدا ڕوو دەدات، نەوەک لە ژێرخانی شتبوونی (بنيته التحتية الشيئية)}.(١٣٨)

واتە کاری هونەری شێوازی تایبەت و سەربەخۆی خۆی هەیە لە دەرخستنی جەوهەر و حەقیقەتی مەوجوودەکاندا. بە مانایەکی تر لە ڕێگەیەوە هەم جەوهەری شت و هەم جەوهەری ئامێریش دەردەکەوێت، بەوەی خۆی نە دەبێتە شت و نە دەبێتە ئامێریش، لە کاتێکدا لە زانستدا، بە مانایەکی تر لە پیشەسازیدا ئەو جەوهەرە ون دەبێت. ئەو جووتە پێڵاوە لە دیدی (هایدیگەر)دا ڕێک حەقیقەتی ئەو ئامێرە و ئامێربوونی ئەو ئامێرە دەردەخات. جەوهەری ئەو جووتە پێڵاوە نە لەو ماتریالەیە لێی دروست کراوە و نە لەو فۆرمەی بەپێی پێویستیی بەکارهێنان وەریگرتووە، بەڵکوو لە بەکارهێنانی ڕاستەقینەیدایە. کەواتە جەوهەری شت نە چەسەپاوە و نە گەیشتووەتە دۆخی تەواوبوونیش، بەڵکوو دەکەوێتە سەر ئەو ڕووداوەی لە وجووددا تێیدا ڕوو دەدات. لەبەر ئەوەیە جەختی لەسەر سەرچاوەی کاری هونەری دەکاتەوە.

---

[١٣٨] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٤٣

ڕەخنەدۆزی فرانسی (میشێل هار) هەر لەم ڕووەوە دەڵێت: (ئەوەی کاری هونەری لە ئامێر جیا دەکاتەوە، یان ئەوەی شیعر لە ڕێکلام جیا دەکاتەوە، ئەوەیە، کە کاری هونەری لەپێناوی ئەرکێکی دیاریکراو، یان لەپێناوی پرۆسەسێکی بەرژەوەندیخوازانە، ماتریالیێتیی ئەو ماهییەتە تێ ناپەڕێنێت، کە لێی دروست کراوە. کاری هونەری لە سەرچاوەی ڕەسەن دروست کراوە و بەرهەم هێنراوە.)([١٣٩])

کەواتە ئەگەر بمانەوێت کاری ئەدەبی بە پێوەری میللی بخوێنینەوە، بەو مانایەی بمانەوێت چەند لەگەڵ ئەوەی هەیە، هاوڕێکە، وەک ئەوەی ڕەخنەگری میللی دەیکات، جەوهەری ئەو هونەرە نابینین، بۆیە دەبێت پەنا بۆ زمانی ڕۆژانەی خەڵک ببەین و بە سێ چوار وشەی سواو دەریببڕین. بە مانایەکی تر بڵێین وڕێنەیە، بێ ئەوەی تەنانەت پێناسەی وڕێنەیش بکەین.

---

[١٣٩] متاهات، (نصوص وحوارات في الفلسفة والادب) ترجمة: حسونه المصباحي، مراجعة: د. قدامة الملاح، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٩٠، مقالة (هايدغر والشعر، الشاعر لا يأتي بالخلاص)، ص٢٦

# ڕەخنەگری میللی و سەرچاوەی کاری هونەری

ئەوەی ڕەخنەگری میللی نایبینێت و ناتوانێت بەو تێگەیشتنە میللییەی ببینێت، سەرچاوەی کاری هونەرییە، کە (هایدیگەر) بەم شێوەیە پێناسەی دەکات: (لێرەدا سەرچاوە واتە لە کوێ و بە چی ئەو شتە دێتە کایەوە، ئەوە چییە و چۆنە).([١٤٠]) ناوی لێ دەنێت جەوهەر. بەم شێوەیە پێی وایە پرسیار لەبارەی سەرچاوەی هونەرییەوە، پرسیارە لەبارەی سەرچاوەی جەوهەرییەوە. پرسیاری ئەوە دەکات: لە ڕێگەی چ شتێکەوە و چۆن هونەرمەند دەبێتە ئەو هونەرمەندەی هەیە؟ لە ڕێگەی کاری هونەرییەوە. کەواتە ئەوە کاری هونەرییە وا دەکات هونەرمەند ببێتە هونەرمەند. هونەرمەند سەرچاوەی کاری

---

[١٤٠] مارتن هايدغر، اصل العمل الفني، ترجمة: د. ابو العيد دودو، المانيا، منشورات الجمل، الطبعة الاولى، ٢٠٠٣، ص٥٨

هونەرییە و کاری هونەرییش سەرچاوەی هونەرمەندە. ئەمیان بەبێ ئەوەی تریان نابێت.([١٤١])

لەگەڵ ئەوەیشدا دەکرێت هەر لای ئەودا بگوترێت (هونەرمەند هێندەی هونەر بایەخدار نییە، نزیکەی وەک ئەو ڕاڕەوەی لە پرۆسەسێکی داهێنەرانە و لەپێناوی دەرکەوتنی کارەکەدا خۆی تێک دەشکێنێت).([١٤٢])

واتە کاری هونەری ئەو بوارەیە، کە چالاکیی هونەرمەندی تێدا دەردەکەوێت، کە هەر لەوێیشەوە ئێمە هونەرمەند دەناسین. ئەمە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە باوەیە، گوایە هونەر بە هۆی هونەرمەندەوە دێتە بوون. بە شێوەیەکی گشتی ئەگەر نە هونەرمەند بەبێ کاری هونەری و نە کاری هونەری بەبێ هونەرمەند ببێت، بەوەی هەر یەکەی سەرچاوەی ئەوەی ترە، ئەوا لەم نێوەدا ئەوەی کۆیان دەکاتەوە (هونەر)ە، مادام هونەر سەرچاوەی هەردووکیانە، بۆیە (هونەر: art) بە هاوواتای (کاری هونەری:art work)، یان (work of art) نازانێت.([١٤٣])

---

[١٤١] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

[١٤٢] **Aili Bresnahan, The Dynamic Phenomenon of Art in Heidegger's The Origin of the Work of Art.**:لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکیەتی:

https://www.researchgate.net/publication/٢٧٦٢١٩٣٤٦_The_Dynamic_Phenomenon_of_Art_in_Heidegger's_The_Origin_of_the_Work_of_Art

[١٤٣] هەمان سەرچاوە.

لە شوێنێکی تردا دەنووسێت: (ئێمە تەنیا لە ڕێگەی جەوهەری هونەرەوە دەتوانین بزانین کاری هونەری چییە).[١٤٤]

نەهامەتیی ڕەخنەگری میللی، کە بە ئاسانی هەر تێکستێک دەسڕێتەوە، ئەوەیە، لەبارەی ئەو سەرچاوەیەوە پرسیاری نەکردووە، چونکە پرسیار بە شتێکی بێنرخ دەزانێت. هەتا ئەو کاتەی پێوەری چاکە و خراپە هەیە، ئێمە دوورین لەوەی جەوهەری کاری هونەری ببینین و لەبارەی هونەرەوە بپرسین. تۆ دەڵێیت ڕەخنەت لە من گرتووە، بەڵام چۆن ڕەخنەت گرتووە، ئەگەر تۆ جەوهەری کاری هونەریت نەدیبێت و پرسیارت لەبارەی چەمکی هونەرەوە نەکردبێت؟ تۆ پێوەرێکت بۆ بە کار هێناوم، کە لەوێوە بەو ئەنجامە گەیشتوویت بەرهەمەکانم وڕێنەن، لەو نووسەرانە نەگەیشتووم و ئیفلاسم کردووە.

هەر (هایدیگەر) دەڵێت: (بۆ ئەوەی جەوهەری هونەر بدۆزینەوە، لەسەرمان پێویستە لە کاری ڕاستەقینە بگەڕێین و بپرسین کاری هونەری چییە و جەوهەرەکەی چۆنە).[١٤٥]

دەگەینە ئەوەی بڵێین ئەوە ئامادەگیی شت نییە لە کاری هونەریدا، کە ئەو شتە دەکاتە هونەر و داهێنان، بەڵکوو ڕێک

---

[١٤٤] مارتن هایدغر، اصل العمل الفني، ترجمة: د. ابو العيد دودو، المانيا، منشورات الجمل، الطبعة الاولى، ٢٠٠٣، ص ٥٩

[١٤٥] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٦٠

بە پێچەوانەوە ئەوە ئامادەکردنی شتی نادیارە تێیدا ئەمەی لە دەست دێت، بەوەی هەڵگری مانا، ئاماژە و سیمبۆلە. {هونەر لای (هایدیگەر)دا نە پرۆسەسە و نە بەرهەمی چالاکیی مەبەستداری هونەرمەندێکیشە، بەڵکوو هێزێکی بزوێنەرە، واتە (دیاردەیەکی دینامیکی: a dynamic phenomenon)یە زیاتر لەوەی تەنیا شوێنێک بێت، هونەری تێدا بکرێت}.([١٤٦])

ئەمەیش وا دەکات نووسەر، یان هونەرمەند بوونەوەرێکی سەربەست بێت، کە هەر ئەو سەربەستییەیشە وای لێ کردووە کارەکەی ملکەچی یاسا و کلێشەکان نەکات، بەوەی کاری هونەری ئەگەرچی لە ماتریال پێک دێت، وەک بۆ نموونە تابلۆ لە قوماش، فڵچە، ڕەنگ و شتی تر دروست دەکرێت، یان کاغەز و قەڵەم بۆ نووسین دەخرێنە کار، بەڵام بەهای ئەوانە کاتێ دەردەکەوێت، کە ئەو مانا، ئاماژە و سیمبۆلانە تێیدا بەرهەم دێن. هەر بۆیە وەک پێشتر گوترا هونەر هەم سەرچاوەی هونەرمەند و هەم هیی کاری هونەرییشە، وەک بڵێی هونەر بە خودی دازاین بزانێت، بەوەی شتەکانی تێدا ئامادە دەبن، بگرە ئەو شتانەی لە هونەردا ئامادە دەبن لەوانە حەقیقەتترن، کە لە واقیعدا هەن، لە کاتێکدا هەمیشە پێی لەسەر

---

[١٤٦] **Aili Bresnahan, The Dynamic Phenomenon of Art in Heidegger's The Origin of the Work of Art.**:لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکیەتی:
https://www.researchgate.net/publication/٢٧٦٢١٩٣٤٦_The_Dynamic_Phenomenon_of_Art_in_Heidegger's_The_Origin_of_the_Work_of_Art

ئەوە داگرتووە هونەر ڕێگەیەکە لەو ڕێگایانەی حەقیقەتیان تێدا دەردەکەوێت، کە پێم وایە هەر لەم شوێنەوە کاری ڕاڤەکار دەست پێ دەکات چۆن ئەمانە دەخوێنێتەوە و لەبارەیانەوە دەپرسێت.

بەگشتی ڕەخنەگری میللی نەک خۆی بەم پرسیارەوە خەریک ناکات، بەڵکوو کاتێ لەبارەی کارێکی هونەرییەوە دەدوێت، خودی تێکستەکەیش دەشارێتەوە. لە دوورەوە ئاماژە بەوە دەدات ئەمیان خراپە، بەڵام ئەویان باشە. ئەمەیان شایانی خەڵاتە و ئەوەیان بۆ ناو تەنەکەی خۆڵ دەست دەدات. بەم شێوەیە ڕەخنەگری میللی لەبارەی ئامادەگیی شتەوە دەنووسێت، واتە ئەوەی هەیە، نەوەک لەبارەی ئەو نادیارەی تێیدا ئامادە کراوە. ئەو شتەی دیارە و بە زەقی دەبینرێت، لای ئەم بایەخی هەیە، بەوەی بە ئاسانی بە دەست دێت و هەر چاوێکی تریش دەتوانێت هەستی پێ بکات. لەبەر ئەوەیشە بە گشتی ڕەخنەگری میللی هێندە شەیدای ئەو تێکستە ڕووکەشانەیە، کە بە زەقی دەکەونە بەر چاوی، بەوەی ئەوانە ئەو هێزە بزوێنەرەیان نییە، وەک (هایدیگەر) لە کاری هونەریدا پێی لەسەر دادەگرێت. بەردەوام گوترا زمان و تێگەیشتنی ڕەخنەگری میللی هەمان زمان و تێگەیشتنی خەڵکی ئاساییە، ئەو خەڵکەی وەک ڕەخنەگر و داهێنەر خۆیان نەناساندووە. دەکرێت هەر مرۆڤێکی تری کۆمەڵگە بێت و شوێنی

ڕەخنەگرێک لەو ڕەخنەگرە میللییانە بگرێتەوە، بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێک ڕوو بدات. ئەرێ زاراوەی (نووسەری ڕاستەقینە) لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەی (هایدیگەر)دا ڕێک دەکەوێت؟

پرسیار لەبارەی حەقیقەت و ناوەرۆکی کاری هونەرییەوە، هەر دەبێت لە ڕێگەی خودی ئەو کارە هونەرییەوە بێت. هەموو ڕوانینێکی ڕەسەن بۆ کاری هونەری بەپێی ڕوانینی (هایدیگەر) پێویستە ئەو ڕەوتە ببڕێت، کە مێتافیزیکای خۆرئاوا لە بایەخدانی بە هەبوون کێشاویەتی، بەوەی کاری هونەریی تەنیا بۆ شت گۆڕیوە. حەقیقەتی کاری هونەری لەوەدا کورت ناکرێتەوە بابەتێکە و بۆ لێکدانەوە دەشێت بەپێی یاسا و شێوازە پێشینەییە دیاریکراوەکان، بەڵکوو جیهانێکی سەربەخۆیە و دنیاکەی تێیدا ئامادەیە، بەو مانایەی کاری هونەری لە خودی داهێنەر و وەرگر جودا دەبێتەوە، بۆیە پێویستە وەرگر لە نزیکیەوە بمێنێتەوە.(١٤٧)

واتە ناکرێت هیچ تێکستێک لەوەدا کورت بکەینەوە، کە باس لە شتێکی دیاریکراو دەکات، بەڵکوو پێویستە بزانین ئەوە سنووری تێگەیشتنی نووسەریشی بەزاندووە، بەو مەبەستەی ببێتە جیهانێکی سەربەخۆ. هەر بەپێی لێکدانەوەی (هایدیگەر) کاری هونەری ڕاڤەکارییە و لە بەرانبەر ئەگەر و

١٤٧ کرد محمد، الشعر والوجود عند هیدغر، رسالة مقدمه لنیل شهادة دکتوراه في الفلسفة، ، السنة الجامعیة ٢٠١١_، ٢٠١٢ص١٣٥

خەملاندنەکاندا کراوەیە. کاری هونەری بەر لە هەرچی بەرزکردنەوەیە لە ئاستی حەقیقەتدا، بەڵام ناوەرۆکی حەقیقەت وەرناگرێت بە مانای هاوڕێکی (تطابق) لەگەڵ بوونی دەرەکی (الوجود الخارجي)دا. هەر کارێکی هونەری شێوەی کرانەوە، یاخود دەرخستن (انکشاف)ی هەبوون (الموجود) وەردەگرێت. کەواتە {کاری هونەری لەسەر شێوازی خۆی بوونی هەبوون (وجود الموجود) دەکاتەوە. ئەو کردنەوەیە لە کاری هونەریدا بە مانای دەرخستن دێت}.([١٤٨])

مەبەستم نییە بە درێژی لەوە بدوێم، کە کاری هونەری لای ئەو فیلۆسۆفە شەڕانگێزەدا چۆنە، بەڵکوو دیسان گەرەکمە پێشانی بدەم کاتێ ڕەخنەگری میللی لە سەرچاوەی کاری هونەری بێئاگایە و لەبارەیەوە پرسیار ناکات، چۆن پەنا بۆ کەلتووری میللی دەبات، ئەو کەلتوورەی ساتێک جێی نەهێشتووە و هەر کارێک لە دەرەوەی ئەو پێوەرەی بێت، بە وڕێنە، توڕەهات و شتی لەم بابەتەی دەزانێت. دیسان دەیڵێمەوە گەڕاندنەوەی کاری هونەری بۆ ئاستی میللی، واتە بۆ ئەو ئاستەی سادە دەکرێتەوە، تاکوو بە خراپ، یان بە چاک حوکمی لەسەر بدرێت، هەوڵێکە بۆ کوشتنی گیانی ئێستاتیکیی ئەو کارە. ڕەنگە ئەو ڕەخنەگرە دەیان جار وشەی مێتافۆر و سیمبۆڵی بە کار هێنابێت، بەڵام چونکە لە سەرچاوەیان

---

[١٤٨] هەمان سەرچاوە، ل١٣٨

بێئاگایە، ئەوا هەر بۆ ئاستی میللییان دەگەڕێنێتەوە و لەوێ بە زمانی ڕۆژانە لێیانەوە دەدوێت، کە ئەمە بۆ هەموو چەمکەکانی تریش هەمان شتە. تێکڕای ئەو چەمکانە تەنیا ناون و بیسراون، دەنا نە کۆنتێکستیان دیارە و نە لە شوێنی خۆیاندا بە کار هاتوون.

# ڕەخنەگری میللی و چەمکی ڕاڤە

لە کاتێکدا بە گشتی ڕەخنەگری میللی پێوەری چاکە و خراپەی لە کۆمەڵگە وەرگرتووە و لە دنیای ئەدەب و فیکردا کاری پێ دەکات، ئەوا چەمکی ڕاڤە لای فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزاندا بووەتە کێشەیەکی گەورە، بە ڕادەیەک هەر یەکەی لە دیدگەی خۆیەوە ڕووبەڕووی بووەتەوە.

(لودڤیگ ڤیتگینشتاین) لەبارەی ڕاڤەکردنەوە حەوت بابەت (case) دەخاتە ڕوو: یەکەم: گەردوون بریتییە لە هەموو شتێک، کە بابەت (کێیس).ە. گەردوون بۆ فاکتەکان دابەش دەبێت. دووەم: ئەوەی بابەتە، ڕاستییەکە، بوونی فاکتی ئەتۆمییە. سێیەم: وێنەی لۆژیکیی شتەکان، بیرکردنەوەیە. چوارەم: بیرکردنەوە پێشنیازێکی ماناداره. پێنجەم: پێشنیازەکان ئەرکی ڕاستەقینەی پێشنیازە سەرەتاییەکانن. شەشەم: فۆرمی گشتیی ئەرکە ڕاستەقینەکان ئەمانەن: $[\bar{p}, \bar{\xi}, N(\bar{\xi})]$. ئەمە فۆرمی گشتیی پێشنیازەکانە. حەوتەم:

ئەوەیە مرۆڤ نابێت قسەی لێوە بکات، بەڵکوو پێویستە لێی بێدەنگ بێت.([١٤٩])

لێرەدا هەڵبژاردنی بێدەنگی لەبەر ئەوە نییە (تراکتاتووسی لۆژیکی فەلسەفی) ناتوانێت قسەی لێوە بکات، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە ئەو بێدەنگییە گرنگە، تاکوو دەستی والآ بێت بۆ شتی تر، کە (ڤیتگینشتاین) باوەڕی وایە ئەرکی فیلۆسۆف کۆتاییی نایەت، بەڵکوو ئەرکەکەی بە نوێبوونەوەی زمان نوێ دەبێتەوە. ئەو ڕوانینە دینامیکییە زەمەنییە وای لێ دەکات هەڵوێستێکی پێچەوانەی هەڵوێستی یەکەمی هەبێت، کە وەک گوترا ددان بەوەدا دەنێت کاری فیلۆسۆف کۆتاییی نایەت، وەک ڕێگەی فەلسەفە هێڵی شەمەندەفەر بێت، کە سەرەتای ببینین و کۆتاییمان لێ دیار نەبێت.([١٥٠])

(ۆلفگانگ ئایزەر) پێی وایە تیۆریی فینۆمینۆلۆجیی هونەر جەختی تەواو لەسەر ئەو بیرۆکەیە دەکاتەوە، مرۆڤ کاتێ لە

---

[١٤٩] LUDWIG WITTGENSTEIN, From *Essential Selections in ١٩th and ٢٠th Century Philosophy*, by James Fieser.

لە نێت وەرگیراوە. ئەمەیە لینکەکەی:

https://www.utm.edu/staff/jfieser/class/٣١٦/pri/١١-٣١٦-wittgenstein.htm

[١٥٠] لودفيك فتغنشتاين، تحقيقات فلسفية، ترجمة وتقديم وتعليق: د. عبد الرزاق بنور، إعداد المنظمة العربية لـلترجمة، الطبعة الاولى، بيروت،٢٠٠٧، ص٤٠و٤١

کاری هونەری دەڕوانێت، نابێت تەنیا دەقی ڕاستی ( actual text) لە بەرچاو بگرێت، بەڵکوو پێویستە بە هەمان ئەندازە بایەخ بەو کردارانە (actions)یش بدات، کە بە وەڵامدانەوەی ئەو تێکستەوە پێوەستن. تێکست تەنیا دیدگە هێڵکارییە جیاوازەکان (schema- tised views) دەخاتە ڕوو، کە دەکرێت لە ڕێگەیانەوە بە بابەتی کارەکە بگەین.([151])

لێرەدا (ئایزەر) دوو تەوەرە لە کاری ئەدەبیدا دەبینێت: تەوەرەی هونەری و تەوەرەی ئێستاتیکی. یەکەمیان تێکستی نووسەرەکەیە و دووەمیان ئەو تێگەیشتنەیە، خوێنەر بە دیی دەهێنێت. لە ژێرڕۆشنایی ئەو تەوەرەییەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە خودی کارەکە ناکرێت نە لەگەڵ تێکستەکە و نە لەگەڵ بەدەستهاتنەکەیشی هاوڕێک (identical) بێت، بەڵکوو دەبێت بکەوێتە نێوان هەردووکیانەوە. پێویستە کارەکە لە تێکست زیاتر بێت، چونکە تێکست تەنیا ژیان دەگرێتەوە، کاتێ بە دی دێت. جگە لەوەیش تێگەیشتن ناکرێت بە شێوەیەک لە شێوەکان لەگەڵ هەڵسوکەوتی تاکانەی خوێنەر ( the individual disposition of the reader) جیا بێت. نزیکبوونەوەی تێکست و خوێنەر، بەرهەمی ئەدەبی دێنێتە

---

[151] Wolfgang Iser, The Reading Process : A Phenomenological Approach

لە نێت وەرگیراوە و ئەمە سەرچاوەکەیەتی:

https://is.muni.cz/el/١٤٢٣/jaro٢٠١٦/SOCV٥V/um/٦١٨١٦٩٦٢/ISER-the-Reading-Process_١_.pdf

کایەوە. ئەو نزیکبوونەوەیش هەرگیز ناکرێت بە ڕوونی دەستنیشان بکرێت، بەڵکوو دەبێت بە شێوەی گریمانی بمێنێتەوە. کاتێ خوێنەر بەو ڕەهەندە جیاوازانەدا تێدەپەڕێت، کە تێکستەکە دەیانخاتە ڕوو و بۆچوونە جیاوازەکان پێکەوە دەبەستێتەوە، وا دەکات کارەکە بکەوێتە جووڵە وەک چۆن خۆیشی دەبزوێت.([١٥٢])

بەم شێوەیە لای (ئایزەر) وەک یەکێ لە ڕەخنەدۆزە گەورەکانی ئەدەب، کاری ئەدەبی تەنیا لە تێکست پێک نایەت، بەڵکوو ئەو کردارانەیش دەگرێتەوە، کە لە ڕێگەی بەرکەوتنی خوێنەرەوە بە دەست دێن. بە مانایەکی تر کاری ئەدەبی نە لە تێکست کورت دەکرێتەوە و نە لە خوێنەریش، بەڵکوو لەنێوان هەردووکیاندا شوێنێکی سەربەخۆ دەگرێت، وەک ئەوەی کارێکی هاوبەش بێت. تێکست لە ڕێگەی وشە و ئایکۆنەوە تەنیا هەندێک سیما پیشان دەدات، کە ئەوانە ڕێگە بۆ خوێنەر خۆش دەکەن لەوێوە بۆ ناوی بخزێت. بە مانایەکی تر خوێندنەوە سنووری ئەو وشە و ئایکۆنانە دەبڕێت و لەودیو نهێنییەکان دەدۆزێتەوە. ئەمەیش مەرجی بەشداریکردنە لەگەڵ تێکستەکەدا بۆ پێکهێنانی کارە ئەدەبییەکە، بەوەی ئەگەر تێکستەکە هەیە، ئەوا کارەکە هێشتا پێک نەهاتووە، تاکوو ئەو کاتەی خوێنەر بەر تێکستەکە دەکەوێت، کە ئەو تێگەیشتنەیش

---

[١٥٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

شتێکی بەرجەستە نییە چوارچێوەی هەبێت، بەڵکوو گریمانییە، بێسنووورە و دەشێ بەردەوام گۆڕانی بەسەردا بێت.

کەواتە ئەو ڕەخنەگرەی لە دوورەوە ئاماژە بە کارێکی ئەدەبی دەدات و دەڵێت هیچ نییە، وڕێنەیە و شتی لەم بابەتە، ئەوە هەر لە بنەڕەتەوە لەگەڵ ئەو کارەدا بەریەککەوتنی نەبووە، چونکە هەموو بەرکەوتنێک ئەوە دەسەپێنێت، خوێندنەوەیەک بە دەست بهێنێت، بەوەی تەنیا لەوێوەوە کارە ئەدەبییەکە دەبینێت. کەواتە هەر گوتەیەکی ئەو ڕەخنەگرە حوکمە، بڕیارە، بەکارهێنانی پێوەری چاکە و خراپەیە، کە لە بواری ڕاڤەکاریدا بەهایەکی نییە، چونکە کارەکەی هەر نەدیوە.

بەپێی ئەو تێگەیشتنەی (ئایزەر) دەتوانم بڵێم کاتێ خوێنەرێک بە بایەخەوە کارێکی ئەدەبی دەخوێنێتەوە، ئەوە هاوکات بایەخی بە خۆیشی داوە. تێکست، دروستتر وەک (دێریدا) ناوی دەنێت نووسین([١٥٣])، خۆی ژیانە، چونکە ڕەنگدانەوەی، بگرە داڕشتنەوەی ژیانی نووسەرە بە شێوەی ئێستاتیکا، بۆیە ئەو ڕەخنەگرەی پەلاماری تێکست دەدات، بەو مانایەی لە ناوی ببات، ئەوە هەر لە بنەڕەتەوە ژیانی نەناسیوە، ڕقی لە دنیایە و کەسێکی مەرگدۆستە. لە کۆنتێکستدا لەگەڵ ئەو تیرۆریستە یەک دەگرێتەوە، کە ژیانی مرۆڤ لەسەر ئاستی

---

[١٥٣] لە لاپەڕەکانی سەرەتای ئەم کتێبەدا پێشان دراوە، کە (دێریدا) چۆن لە چەمکی نووسین دەڕوانێت.

فیزیکەڵدا لە ناو دەبات. هەمان میکانیزمە. سەرچاوەی مەرگپەرستی، داخرانە. (دیارە بە گشتی ئەوە دەڵێم و لەگەڵ کەسی دیارکراوم نییە).

بەوەدا ڕەخنەگری میللی پشتی بە کەلتووری میللی بەستووە، سەیر نییە هێندە مەرگپەرست بێت، بەوەی ئەو کەلتوورە هەموو ئێلەمێنتەکانی سڕینەوە و لەناوبردنی هەڵگرتووە. ویستی کرانەوە وامان لێ دەکات ئەم ئاستەی خۆمان تێ بپەڕێنین و بە کۆمەڵێک ئاستی دیکە، بە چەند ڕووبەری تری بیرکردنەوە بگەین، هەروەها بەر کۆمەڵێک کەناڵی تریش بکەوین، بۆیە ئەمانە ئاستی هۆشیاریمان دەگۆڕن و حەزی دایەلۆگمان فراوانتر دەکەن، کە دواجار وا دەکات ڕوانینمان لە ئاستی ئەو کەلتوورەی لەناویدا گەورە بووین و لەناویدا بیرمان کردووەتەوە، بگۆڕێت، بەڵام داخران واتە مانەوە لەو شوێنەی خۆمان و دەستگرتن بەوەی هەیە. بێنرخکردنی فیکری نووسەر و وەسفکردنی بەو شتانەی کۆمەڵگە بە قێزەونیان دەزانێت، پێوەندیی بە ڕوانینی ئەو کەسەوە هەیە بۆ خودی ژیان. ئەو کەسە با ناوی دەیان فیلۆسۆف لەو فیلۆسۆفانەی هێنابێت، کە لەپێناوی ژیاندا جەنگاون، بەڵام لە تێزەکانیان نەگەیشتووە، بگرە هەر لێیان نزیک نەبووەتەوە و لە هەمان ئەو سەرچاوەیەوە ژیانی ناسیوە، کە تیرۆریستێک لێی وەرگرتووە. وەک گوترا ڕەخنە، دروستتر ڕاڤە هەمیشە

لەگەڵ ئێستاتیکادا مامەڵە دەکات. بە مانایەکی تر بەدوای جوانیدا دەگەڕێت و بۆچوونی خۆی لەسەر دادەمەزرێنێت، بەڵام کاتێ ئەو ڕەخنەگرە میللییە بە دوای ناشیریندا وێڵە، ئەمە پێوەندیی بە ژیان و دیدگەی خۆیەوە هەیە، کە خۆی و دەوروبەری ناشیرین دەبینێت. بە مانایەکی تر ئەو ڕەخنەگرە خودی خۆی بە شتێکی بێبەها دەزانێت و هەر ئەوێیش دەکاتە ڕوانگە بۆ بینینی دەرەوە. لە ئاستی شەعبییشدا دەگوترێت: (فلان نرخی خۆی نازانێت، بۆیە خەڵک بە کەم سەیر دەکات).

ئەمە لە فەلسەفەدا ئەلفوبێیە، کە ڕوانینمان بۆ دنیا هەمان ڕوانینمانە بۆ خودی خۆمان. هەردووکیان (ڕەخنەگری میللی و تیرۆریست) هەوڵی سادەکردنەوەی دنیا دەدەن و بۆ باش و خراپ دابەشی دەکەن. خراپەکان دەبێت لە ناو ببرێن، چونکە لەناوبردن پرۆسەسێکی ئاسانە و لەوە ڕزگاری دەکات لە ژیان بکۆڵێتەوە، کە ژیان پڕە لە ڕەنگی جیاواز، دەنگی جیاواز، هەستی جیاواز، بینینی جیاواز و هەموو شتێکی جیاواز. باشەکان دەبێت بمێننەوە و بپەرسترێن، چونکە پەرستنیش وەک سڕینەوە ئاسانە و لە پرسیار ڕزگاری دەکات. (ناڵێم تۆ هەمیشە ئەوەت کردووە، بەڵام لەو دوو گوتارەتدا لێیت لا نەداوە. ڕەخنەگری میللیی وایشمان هەیە، ئەمە کاری بەردەوامی بووە).

ئەو ڕەخنەگرە میللییەی بە تێکستێک دەڵێت هیچ نییە و دەبێت لە ناو بچێت، ئەوە ڕوانگەکەی تەسک و ڕوانینەکەی کورتە. دەستی بە لۆژیکی (سڕینەوە و پەرستن)ەوە گرتووە و لە دژی پرسیاردا دەجەنگێت. ئەگەر ئەو لایەنە ئاسانە هەڵنەبژێرێت، ئەوە لایەنە قورسەکە ڕووبەڕووی دەبێتەوە و بەسەریدا دەسەپێت لێکدانەوەی بۆ بکات، تەنانەت کاتێ بە دۆستەکانی دەڵێت باش، پێمان ناڵێت بۆچی ئەوانە باشن و چ جیاوازییەکیان هەیە، چونکە ئەوەیش دیسان لێکدانەوەی دەوێت و ڕووبەڕووی پرسیاری دەکاتەوە.

وەک پێی لەسەر داگیرا ڕەخنەگری میللی ڕوانینێکی میللییانەی تەسکی هەیە، بۆیە هەوڵ دەدات دنیای داهێنان هێندەی ئەو تێگەیشتنەی خۆی بچووک بکاتەوە، بەو مەبەستەی پرۆسەسی بڕیاردان بە چاکە و خراپە، کە پرۆسەسێکی ئاسانە، بخاتە کار، بۆیە نەک هەر جیاوازی نابینێت، بەڵکوو مەبەستیەتی هەموو جیاوازییە بەدەستهاتووەکانیش بسڕێتەوە. لە (نیتشە)وە، دروستتر لەگەڵ دەرکەوتنی ڕەخنەدۆزانی مۆدێرنیتی، واتە ئەوانەی ڕەخنەیان لە عەقڵ، زانست و تەکنەلۆجیا گرت، بەوەی بوونەتە هۆی دروستبوونی سێنترالیزم، بایەخی گەوەر بە جیاوازی درا، بە ڕادەیەک لە بەرهەمی هەموویاندا ڕەنگی دایەوە. بۆ نموونە (جیاوازی و نووسین)ی (دێریدا) و زۆری تر. لە بەرهەمەکانی (فۆکۆ)دا بە

شێوەیەکی بەرچاو کار لەسەر دامەزراندنی ئەو جیاوازییەدا کراوە. لە (ئارکیۆلۆجیای زانین)دا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە دەستنیشانکردن (diagnos) لە ڕێگەی گەمەی جیاکاری (play of distinctions)یەوە ناتوانێت حەقیقەتی شوناسمان بسەلمێنێت. ئەو دەیچەسپێنێت ئێمە جیاوازین، کە هۆکارمان جیاوازیی چەمکەکانمانە، مێژوومان جیاوازیی کاتەکانمانە، خودمان جیاوازیی ماسکەکانە.(١٥٤)

چەمکی ئارکیۆلۆجی لای (فۆکۆ)دا بە مانای کردنەوەی ئەو دیسکۆرسانەن، کە وا خۆیان دەردەخەن قەوارەی یەکگرتوو و چەسپاون. بەم شێوەیە دەیەوێت وشە و شت، دیسکۆرس و بابەت لە یەکتر بترازێنێت و بیانکاتەوە، لێرەوەیە نەک هەر کۆمەڵێک چەمکی نوێ لە دایک دەبن، بەڵکوو چەمکە کۆنەکانیش مانای نوێ بە خۆیانەوە دەگرن. لە بەرهەمەکانی تریشیدا بە هەمان شێوە، بۆ نموونە لە (وشەکان و شتەکان)دا مامەڵە لەگەڵ ئەو چەمکانەدا دەکاتەوە. مەبەست ئەوە نییە باسێک لەبارەی (فۆکۆ)وە بنووسم، بەڵکوو تەنیا دەمەوێت ئاماژە بەوە بدەم فەلسەفە لەم سەدوپەنجا ساڵەی ڕابوردوودا بە هەموو ئاڕاستە جیاوازییەکانیەوە کاری بۆ کرانەوە و دەرخستنی جیاوازی کردووە، کە ئەمە لە ڕەخنەی ئەدەبی و

---

١٥٤ Michel Foucault, THE ARCHAEOLOGY OF KNOWLEDGE AND THE I)ISCQURSE ON LANGUAGE, Translated from the French by A. M. Sheridan Smith, PANTHEON BOOKS, NEW YORK, ١٩٧٢, p.١٣١

هونەریدا ڕەنگی داوەتەوە، لە کاتێکدا لای ئێمە زۆرکەم ئەو کاریگەرییەی دەرکەوتووە، بگرە ڕەخنەگری میللی هەتا ئەمڕۆیش درێژە بە کەلتووری سڕینەوە و لەناوبردنی جیاوازی دەدات.

ئەگەر (فۆکۆ) ڕەخنەی توند لە دەستنیشانکردن دەگرێت، ئەوا ڕەخنەگری میللی مادام خاوەنی هەمان تێگەیشتنی خەڵکە و هەمان زمانی ئەوانیشی هەیە، لە ڕێگەی خودی دەستنیشانکردنەوە، کە پرۆسەسێکی چەند بلێی ئاسانە، دنیای داهێنان بچووک دەکاتەوە و بە چاک، یان بە خراپ حوکمی لەسەر دەدات.

(باشلار) خەیاڵی مرۆڤ بە هەر چوار ڕەگەزەکە: ئاو، ئاگر، هەوا و خاکەوە دەبەستێتەوە، بەو مانایەی وێنەی شیعری لەوانە پێک دێت. وێنەی شیعری ئەزموونێکی هەستیارە لە دنیادا، خەیاڵ وەک خەون و وەک فیکر توانایەکی گەورەی لە بەرهەمهێنانیدا هەیە.... بەم شێوەیە خەیاڵ لای ئەو نوێکەرەوەیە و لە قووڵاییی وێنەی شیعرییەوە دەردەچێت، وێنەی نوێ و جیاوازی هەن، کە هەموویان تەعبیر لە یەک جەوهەر دەکەن.([١٥٥])

---

[١٥٥] غاستون باشلار، لهب شمعة، د. مي عبدالكريم محمود، أزمنة لـلنشر والتوزيع، عمان، الطبعة الاولى، ٢٠٠٥، ص١٣و١٤

وەک بڵێی ویستبێتی بڵێت وێنەی شیعری بەوەدا بەرهەمی خەیاڵە و لەو چوار ڕەگەزە دروست دەبێت، کەواتە نەک هەر گەردوونە، بەڵکوو گەردوونێکی باڵاترە. وەک سەرنجێک وێنەی شیعری لای (باشلار)دا تەنیا پێوەندیی بە شیعرەوە نییە، بەڵکوو خودی گەردوونە و هەموو شتێک دەگرێتەوە. لێرەوە دەڵێم چۆن دەکرێت ئەو وێنەیە بە دوو وشە پووچ بکەیتەوە و حوکمی لەسەر بدەیت؟ ئایا سەیر نییە ڕەخنەگرێک ئەمە ڕوانینی بێت بۆ کاری هونەری و گۆڤارێکیش بە ناوی (شیعر)ـەوە دەربکات؟

لە نامەیەکتدا بەوە تانەت لێ داوم، گوایە وەستای ناوهێنانم، بەو مانایەی لە گفتوگۆکانمدا ناوی نووسەرانی خۆمان بە پۆزەتیڤ دەهێنم، کە ڕاستییەکەی من لەم ڕوانگەیەوە لە کاری هەر نووسەرێک دەڕوانم. ناوهێنانی نووسەران بە نەگەتیڤ تەنیا لەو کەلتوورانەدا بایەخی گەورەی هەیە، کە هێشتا گرنگیی نووسینیان نەزانیوە و هەموو شتێک لە ڕێگەی دەنگەوە یەکلا دەکەنەوە، دەنا لە زۆر کەلتووردا لەسەر ئاستی میللییشدا نەماوە.

من خۆم هەم لە گفتوگۆ و هەم لە گوتاردا پۆزەتیڤانە ناوم هێناویت. ئەمەی کردوومە لای زۆر نووسەری لاو کاریگەریی باشی هەبووە، بەڵام بێگومان لای هەندێکیش بە شێوەی تر لێک دەدرێتەوە و کاریگەریی خراپی دەبێت. کاتێ بە کارێکی

ئەدەبی دەڵێم هیچ، ئەوا وەک گوتم پێوەندیی بە ڕوانینی خۆمەوە هەیە، کە نەمویستووە بایەخ بەو کارە بدەم. بە مانایەکی تر بایەخم بە ڕوانینی خۆم نەداوە، بگرە (بوون)ی خۆمم بە کەم زانیوە. هەر ئەوەیشە وای کردووە بە پرسیار، نەوەک بە بڕیار، ڕووبەڕووی نووسەران ببمەوە.

# ڕەخنەگری میللی لە ئاست پێوەری زۆرایەتی و کەمایەتیدا

بە پێویستی دەزانم هەر ئەو تەوەرەیەی پێشوو بە تەوەرەیەکی ترەوە ببەستمەوە، کە تەوەرەی زۆرایەتی و کەمایەتییە، بەوەی تۆ لە گوتاری یەکەمتدا بەوە تانەم لێ دەدەیت، گوایە خوێنەرم نییە و کتێبم نافرۆشرێت. ئەگەرچی ئەمە هەتا بڵێی سەیرە، کە ڕەخنەگرێک ناوی دەیان فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆز بهێنێت و ئەمەیش بۆچوونی بێت، کە ئەوانە نەک هەر سەر بە دنیای کەمایەتین، بەڵکوو شەڕی گەورەیان لە دژی ئەو تێگەیشتنە سواوە کردووە، کە لەسەر ئەوە دامەزراوە: ئەوەی زۆرایەتی پەسەندی دەکات، گرنگە و خاوەنی حەقیقەتی تەواوە.

ئەوەی گوایە بەرهەمێک باشە، چونکە جەماوەر قەبووڵی کردووە، بە لاتینی پێی دەگوترێت ( argumentum ad

(populum و به ئینگلیزی دەبێتە ( argument to the people)، کە ئەمە لە بواری بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا نەک هەر پەسەند ناکرێت، بەڵکوو بە تێگەیشتنی مێگەل دەزانرێت. جەماوەری زۆر وەک پێشتر گوتوومە هەمیشە لەسەر چەمکە زەقەکانی وەک ئایین، نەتەوە، نیشتمان، چین و هیی تر کۆکن، چونکە ئاسانن و دڵنیاییان لێ وەردەگرن. پێشتر لە گوتاری (زۆرایەتی و جاگلەر، هەوڵێک بۆ لێکدانەوەی سێکوچکەی ڕۆشنبیر، دەستەڵات و زۆرایەتی)دا لێوەی دواوم.([١٥٦])

یەکێک لە خەسڵەتەکانی جەماوەر، یاخود مێگەل (بە مانا نیتشەییەکەی) بایەخدانە بە دیار لەسەر حیسابی نادیار. لای جەماوەر ئەوە گرنگە بەردەوام بتبینێت و لە بەرچاوی بیت، چونکە لەم ڕێگەیەوە هەست بەوە دەکات تۆ بەشێکی دانەبڕاوی ئەویت. ئەو مادام دەرەوەی شت دەبینێت، نەوەک ناوەوەی، ئەوا ژمارەی دەرکەوتنەکان دەکاتە پێوەر بۆ چاکی و خراپی. بەم شێوەیە لای ئەو نووسەری میللی گرنگە، چونکە بەردەوام دەردەکەوێت و لەگەڵیەتی. نادیار لای ئەودا هیچ بایەخی نییە، چونکە ئەو تەنیا لە ڕێی پرسیارەوە بە نادیار دەگات، کە پرسیار لای ئەودا هەر خۆی بەشێکە لە نادیار. بەم شێوەیە لە هەڵبژاردنیشدا ئەو حزبانە دەیبەنەوە، کە زۆر دەرکەوتوون و هوتافیان زۆر کێشاوە، بەڵام پڕۆژەیان چییە؟

---

[١٥٦] http://hemin.dk/files/pdf/KKS_majority.pdf

ئەوە بایەخی نییە. سەیر نییە چ نووسەری میللی و چ سیاسەتمەدار هێندە پەرۆشی دەرکەوتن و فرێدانی قسەن. لە گوتاری (بێدەنگی وەک پرسیارێکی ئۆنتۆلۆجی)دا هەوڵم داوە بە وردی لەوە بدوێم.(١٥٧)

هەر کاتێ ڕێگەی ناتەقلیدی (unorthodox methods) دەگریت، ناتەوێت وەک ئەوانەی تر بیر بکەیتەوە و بنووسیت، ئەوە بەرهەمەکانت لای خوێنەری سادە پەسەند ناکرێن و لای ڕەخنەگری میللییش بەم شێوەیە دەکەونەوە، چونکە وەک بەردەوام گوترا ئەو ڕەخنەگرە میللییە هەر لە بنەڕەتەوە هەمان تێگەیشتنی خەڵکی بۆ چەمکەکان هەیە.

من پێشتریش گوتوومە ئەو جەماوەرەی بە شایەتیی ئەو جۆرە ڕۆشنبیرە توانای دروستکردنی قوتابخانەیەکی باشی نییە، لە دروستکردنی شەقامێکدا دەستەوستانە، نەخۆشخانەیەکی گرنگی بۆ دانەمەزراوە، کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی پێک نەهێناوە، کەچی هەر ئەو دواجار دەکرێتە حەکەم، ئاخۆ کێ نووسەری داهێنەرە و کێ فەشەلی هێناوە، کێیش ئیفلاسی کردووە. مرۆڤی خێڵەکی هەمیشە شانازی بە ژمارەوە دەکات. ئەو خێڵەی ئەندامی زۆر بێت، ئازایە و لە شەڕ دەیباتەوە. ئەمە ئەو تێگەیشتنەیە هاتووەتە ناو دنیای فیکری ئێمە. حزبی کوردی چ لە شاخ و چ لە شاردا شانازیی

---

١٥٧ http://www.hemin.dk/mla/node/٥٢٣

بە ژمارەوە کردووە و پەلاماری هەر هێزێکی تری داوە، کە ژمارەی کەمە. ڕوانین لە وازهێنانی نووسەر لە نووسین وەک ستیگما (Stigma)یەک، واتە وەک پەڵەیەک بە ناوچەوانەوە، شتێک نییە جگە لە دووبارەکردنەوە و پیرۆزیکردنی ئەو کەلتوورە خێڵەکییەی پێی وایە بەزین لە شەڕدا عەیبێکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییە. ئەوە هەمان پێوەرە بۆ جەنگی تەقلیدی، چ هیی خێڵ، چ هیی نەتەوە و نیشتمان.

ئەو ئەدەبەی بە قووڵی دەنووسرێت، ئەدەبێکە تەنانەت زۆرجار ناچێتە ناو ئیلێت (نوخبە)یشەوە، چونکە هێشتا ئەو ئامرازە فیکرییانە دەرنەکەوتوون، کە ڕەخنەی ئەدەبی بە پاڵپشتیان دەتوانێت هەم لێیان تێبگات و هەم کۆدەکانیان بکاتەوە. (جۆیس) لە سەردەمی خۆیدا نەدەخوێنرایەوە، چونکە سەر بە دنیای پۆستمۆدێرنیزمە و هێشتا فەلسەفەی پۆستمۆدێرنیزم گەشەی نەکردبوو و تەنیا لە هەندێک تێکستی فەلسەفیدا کاری پێ دەکرا، کە دواتر چووە ناو دنیای ڕەخنەی ئەدەبی و هونەرییەوە، بۆیە دەبینین ئەوە (جۆیس) نییە خەڵاتی نۆبێلی پێ دەدرێت، بەڵکوو (بیکیت)ی شاگردیەتی، چونکە وەک گوترا (جۆیس) هێشتا تەنانەت لای ئیلێت و لە ناوەندی ئەکادیمیایش بە نووسەرێکی گەورە نەدەزانرا، بەڵکوو دواتر کاتێ ڕەخنەدۆزەکان فۆکەسی گەورەیان لەسەر کرد، ئینجا چووە ئاستی خوێنەری ئاساییەوە. (هایدیگەر)، (فۆکۆ)،

(گادامێر)، (دێریدا)، (لاکان)، (دۆلۆز)، (بارت)، (یاکۆبسن)، (تۆدۆرۆڤ) و زۆری تر، لەپێش ئەوانیشەوە (شۆپێنهاوێر) و (نیتشە) ڕۆڵی بەرچاویان لەوەدا دی تێکست بە یەک ئاڕاستە و بە یەک لۆژیک نەخوێنرێتەوە. بە مانایەکی تر بەگژ ئەو میراتەدا چوونەوە، کە لە (دێکارت)ەوە عەقڵی کردبووە سێنتراڵ و لە ژێرسایەی ئەو سێنترالیزمەدا هەر جۆرە هونەر و ئەدەبێک دەخرایە پەراوێزەوە و بێنرخ دەکرا، کە لەگەڵ حوکمەکانی عەقڵدا ڕێک نەدەکەوت.

ڕەخنەی (عەلی حەرب) ئەوەیە، کە دەست بە لۆژیکەوە گیراوە و گۆڕانی ڕیشەیی بەسەردا نەهاتووە وەک لە بوارەکانی تری وەک فەلسەفە، زمان، شیعر، نیگار، ئەنترۆپۆلۆجی، سایکۆلۆجی، فیزیا و تێکڕای زانستە سروشتییەکانی تردا دەیبینین، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا پێی وا نییە لەم ڕووەوە هەوڵی گەورە نین، کە لەگەڵ (نیتشە)دا بە ڕاستی ئەو ڕەخنەیە بەرچاو دەکەوێت، بەوەی ویستوویەتی دامودەستگەی حەقیقەت تێک بشکێنێت. هەر لەم ڕووەوە ئاماژە بە کۆمەڵێک فیلۆسۆفی تر دەدات، لەوانە (هایدیگەر)، (ژیل دۆلۆز)، (فۆکۆ)، (دێریدا)، (ریچارد رۆرتی)، (جیانی ڤاتیمۆ) و زۆری تر، کە بە ڕەخنەدۆزانی مۆدێرنیتی ناسراون. ئینجا دەگاتە ئەوەی بڵێت: لێرەوەیە، کە سەخت دەبێت لەبارەی یەک لۆژیکەوە قسە بکرێت. بە مانایەکی تر دەبێت لەبارەی زیاتر لە لۆژیکەوە

بدوێین، ئەمەیش بەپێی نموونە و پێوەرەکان، یان بەپێی دیسکۆرس و پراکتیسەکان.(١٥٨)

کاری ئەدەبی و فیکری لە دنیای کوردیدا تاکوو ئەمڕۆیش بەو لۆژیکە دەخوێنرێنەوە، کە چەندیان لەبارەیەوە نووسراوە و چەند دانەیان لێ فرۆشراوە. نووسینی زۆر لەبارەی بەرهەمێکەوە، لە ناوەندێکی وەک هیی ئێمەدا، کە ڕەخنەی میللی دەستی بەسەردا گرتووە، نەک نیشانەی داهێنانی ئەو کارە نییە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە مانای سادەییی ئەو کارەیە، کە جەماوەر بە ئاسانی لێ تێگەیشتووە، یان لە ڕێگەی میدیاوە ناچار کراون بیکڕن، هەتا ئەگەر نەشیانخوێندبێتەوە. ئەمە نیشانەی داخراویی بیرکردنەوەی ڕەخنەگری میللییە، کە بە هەمان لۆژیکی جەماوەر کاری ئەدەبی و فیکری هەڵدەسەنگێنێت و پروپاگەندەی بۆ دەکات. نووسەر هەیە دوای سی ساڵ ئەزموون لە بواری ئەدەبی گێڕانەوەدا، هێشتا پێی وایە مادام لە شێوازی گێڕانەوەکەت ناگات، ئەوە تۆ نووسەرێکی خراپیت. ئەگەر لێ بپرسیت مەبەستت لە چەمکی گێڕانەوە چییە، چ وەڵامێکت دەداتەوە؟ هەر ئەوەی لە گفتوگۆکانیدا گوتوویەتی، کە بووەتە مایەی قاقالێدان. پێم وایە نووسەرە داهێنەرەکان ئەوانەن، کە لە سەردەمی خۆیاندا بە

---

[١٥٨] علی حرب، الماهية والعلاقة: نحو منطق تحويلي، المركز الثقافي العربي، الطبعة الاولى، ١٩٩٨، ص١٥-١٧

لاوە دەنرێن و لە سەردەمەکانی دواتردا بە هێزی گەورەترەوە دەردەکەونەوە.

(شۆپێنهاوێر) ساڵی ١٨٢٠ لە زانکۆی بەرلیندا لێکچەی فەلسەفەی دەگوتەوە. کاتێکی زانی وا هۆڵەکە چۆڵە و کەس گوێی لێ ناگرێت.([١٥٩]) (نیتشە) لە سەردەمی خۆیدا بە نووسەر نەدەزانرا، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا هیچ فیکرێ، بە چاوپۆشین لەوەی چ ئاڕاستەیەکی هەیە، نەیتوانیوە بە لاوەی بنێت، بەڵکوو هەر ڕاڤەکارێک ڕووبەڕووی بووەتەوە، کاتێ ویستوویەتی لەبارەی یەکێ لەو چەمکە گرنگانەی فیکر، ئەدەب، هونەر و هیی ترەوە بکۆڵێتەوە، تەنانەت وای لێ هاتووە لە کەلتووری هەژارەکانی وەک هیی (کورد)یشدا ئەگەر ناوی (نیتشە) نەهێنیت، بە نووسەرت نازانن. ([١٦٠]) (سلۆتەردایک) لە (ئینجیلی پێنجەمی نیتشە)دا دەنووسێت: (ڕێژەیەکی زۆر لە تالانکەر، هەلپەرست و هەڵپەکەر ئەرکی

---

[١٥٩] وفیق غریزي، شوبنهاور وفلسفة التشاؤم، دار الفارابي، بیروت-لبنان، الطبعة الاولی، ٢٠٠٨، ص٢٨

[١٦٠] باوەڕم بە دابەشکردنی کەلتوور بەسەر هەژار و دەوڵەمەندا نییە. لەم شوێنەدا مەبەستم بە داریکراوی کەلتووری ئەمڕۆیە، دروستتر مەبەستم دنیای نووسینی ئەمڕۆی خۆمانە. لێرەدا نرخێکی گەورە بۆ بەرهەمەکانی (شتراوس)، (دێریدا) و ئەوانەی تر دادەنێم، کە ئەو وەهمەیان تێک شکاند، گوایە کەلتوورێک هەیە لە کەلتوورێکی تر گەورەتر.

بایەخدان بە نیتشەیان لە ئەستۆ گرتووە و دوور لە ویستی نووسەر، ناوەکەیان کردووەتە مارکە).[161]

(نیتشە) چاک لۆژیکی مێگەلی ناسیوە، بۆیە لە (ئەوەیە مرۆڤ)دا نووسیویەتی: {(خۆشی لە هەموو قەدەغەکراوێک دەبینم)، لە ژێر ئەم نیشانەیەدا ڕۆژێک سەرکەوتن بۆ فەلسەفەکەم تۆمار دەکرێت. ئەوە تەنیا حەقیقەتە تاکوو ئەمڕۆ بە شێوەی جەوهەری ملکەچی بڤەیە}.[162]

ساڵی هەشتاوپێنج، کە تازە بە ڕاستی دەستم دابووە نووسینی ئەدەبی گێڕانەوە، دەمویست هەر شتێک بخوێنمەوە، کە لەو بارەیەوە دەنووسرێت. یەکێکیان گفتوگۆیەک بوو لەگەڵ ڕۆماننووسی فرانسی، (ئالان رۆب گریێ)دا. لەو گفتوگۆیەیدا دەڵێت دوو جۆر کتێب هەن: جۆری یەکەم، ئەوانەن، کە جەماوەر دروستیان دەکات. کتێبی کۆنسەمپشنی خێرا (استهلاک سریع)ن. واتە ئەوانەن، هەر خێرا و بە ئاسانی بە کار دەهێنرێن. دووەمیان، ئەو کتێبانەن جەماوەر دروست دەکەن، کە شوێنێکی بەرز لە مێژووی ئەدەبدا دەگرن. نموونەی (جۆیس)، (کافکا) و (فۆکنەر) دەهێنێتەوە. باوەڕی

---

[161] بيتر سلوتردايك، (الانجيل) الخامس لنيتشه، ترجمة: علي مصباح، منشورات الجمل، المانيا، ٢٠٠٣، ص١١٤

[162] فريدريش نيتشه، هذا هو الإنسان، عن الألمانية: علي مصباح، منشورات الجمل، المانيا، ٢٠٠٣، ص٩

وایە ئەو ئەدەبەی ئەمڕۆ جەماوەر بە لاوەی دەنێت، سبەی بۆی دەگەڕێتەوە.([١٦٣])

لە خۆم ڕادەبینم بڵێم ئەو (ڕاگەردان)ەی تۆ بە وڕێنەی دەزانیت، بێ ئەوەی یەک دێڕی لێ وەربگریت، سبەی وەک یەکێک لە داهێنانەکانی دنیای ئێمە دەخوێنرێتەوە، کە هەر ئێستا خوێنەری هۆشیار هەستی بەوە کردووە.([١٦٤])

هەر لەو ساڵەدا گوتارێکم لە ژێر ناونیشانی (بونیادی کورتەچیرۆکی نوێ)دا خوێندەوە، کە ڕەخنەدۆزێکی ئینگلیز نووسیویەتی و باس لەوە دەکات چیرۆکی نوێ بەوە تۆمەتبار دەکرێت، گوایە گرێچنی نییە، ڕووداوەکانی بێسەروبەرن، شتی گرنگ بە دەستەوە نادات و قسەی تری لەم بابەتە، وەک ئەوەی ئەمڕۆ خۆمان لە دەمی ڕەخنەگری میللییەوە دەیانبیستین. ئەو ڕەخنەدۆزە بە وردی هەموو ئەو تۆمەتانە

---

[١٦٣] الان روب غرييه يتحدث عن نفسه، مقابله اجراها: جاك هنريك، ترجمة: د. مهدي صالح حمادي، مجلة اسفار، بغداد، ١٩٨٥، عدد٢، ص٤٨

[١٦٤] هاوڕێیەکم لەگەڵ ئەوەیشدا سەرجەم شیعرەکان و هەندێک لە چیرۆکەکانی (ڕاگەردان)ی خوێندبووەوە و زۆر لای جوان بوون، بگرە گەلێ سەرنجی قووڵی لەم ڕووەوە بە دەست هێنابوو، بەڵام لەبارەی پێشەکییەکەوە سەرنجی هەبوو، گوایە لەو ئاستەدا نییە، کە من پێشتر لە نووسینەکانی ترمدا پێشانم داوە. دوای ئەوەی لەگەڵی کەوتمە گفتوگۆ، دروستتر دوای ئەوەی لە ڕێگەی ئەو گفتوگۆیەوە پێیم گوت لە شێوەی بایۆگرافیادا نووسیومە، بۆچوونەکەی گۆڕا، چونکە ئەو لە بنەڕەتەوە وا ڕاهاتبوو لە کاری ئەدەبی و هونەری بکۆڵێتەوە و کەناڵی تریان تێدا بکاتەوە، وەک ئەوەی فەلسەفە لەم سەدوپەنجا ساڵەی ڕابوردوودا کردوویەتی، ئەوەک بە دێڕێک دووان بیسڕێتەوە و دایبخات.

لەسەر چیرۆک لا دەبات.[165] هەموو کاتێ شێوازی نوێ لەلایەن ڕەخنەگری سادەوە دژایەتی کراوە، بەڵام دواتر خوێنەری خۆی دۆزیوەتەوە. ئەوەی لێرەدا کاریگەریی نەماوە، بڕیارەکانی ڕەخنەگری میللین.

ئەو جووتە پێڵاوەی (ڤان گوخ)ی هونەرمەند، کە لای (هایدیگەر)، (دێریدا) و زۆری تردا دەبێتە یەکێک لە داهێنانە گەورەکان، لە سەردەمی خۆیدا سەرنجی کەسی ڕانەکێشاوە. ئەو لە ژیانیدا تەنیا یەک تابلۆی فرۆشتووە.[166] هەر (ئالان رۆب گرێ) لەو گفتوگۆیەیدا دەڵێت تابلۆکانی (ڤان گوخ)، کە ئەمڕۆ لە ژووری ماڵاندا هەڵواسراون، کاتی خۆی کەس سەیری نەدەکردن.[167]

(ئێمبێرتۆ ئیکۆ) لە کتێبی (بەرهەمی کراوە)دا، کە لە ساڵی ١٩٥٨ نووسیویەتی، بایەخێکی گەورە بە بەرهەمی (جۆیس) دەدات. (یۆلسیس) بە (جیهانی ئاڵۆز و بێسنوور) ناو دەبات، بگرە دەڵێ شارێکە هەمیشە بۆی دەگەڕێینەوە، تاکوو سیمایەک

---

[165] ای. ال. بادر، بناء القصة القصيرة الحديثة، ترجمة: عبدالواحد محمد، مجلة الاقلام، عدد٢، سنة١٩٨٥، ص٤٢_٤٧

[166] Lisa Marder, The Lore: Van Gogh Sold Only One Painting During His Life:لە نێت وەرگیراوە. ئەمە لینکیەتی.

https://www.thoughtco.com/van-gogh-sold-only-one-painting-٤٠٥٠٠٠٨

[167] الان روب غرييه يتحدث عن نفسه، مقابله اجراها: جاك هنريك، ترجمة: د. مهدي صالح حمادي، مجلة اسفار، بغداد، ١٩٨٥، عدد٢، ص٤٨

ببینین، له خه‌ڵکێک بگه‌ین، پێوه‌ندی و ئاڕاسته‌ی به‌رژه‌وه‌ندی دابمه‌زرێنین.(١٦٨)

هه‌ر به گشتی (ئیکۆ) له‌م کتێبه و ئه‌وانه‌ی تریدا بایه‌خی گه‌وره به‌وه ده‌دات چه‌مکی ئه‌ده‌ب و هونه‌ر زیاتر بکاته‌وه و به‌رده‌وام پێ له‌سه‌ر ئه‌وه داده‌گرێت، که کرانه‌وه واته ده‌رکه‌وتنی ڕێگه‌ی جیاواز بۆ خوێندنه‌وه و لێکدانه‌وه. ده‌یه‌وێت له ڕێگه‌ی به‌رهه‌مه په‌راوێزخراوه‌کانی (جۆیس)ـه‌وه سیماکانی (به‌رهه‌می کراوه) وه‌ک چه‌مکێکی ئه‌ده‌بی و ئێستاتیکی بناسێنێت. هه‌وڵه‌که‌ی له‌پێناوی پێناسه‌یه‌کدایه بۆ شیعریه‌تی (به‌رهه‌می کراوه) و بۆ ده‌رخستنی ڕه‌گی مێژوویی، بواره‌کان و ئامانجه‌کانی، که (جۆیس) پێی ده‌دات.(١٦٩)

له دنیای کوردیدا، که هێشتا ڕه‌خنه‌ی میللی زاڵه، به‌وه‌ی ئه‌ده‌بی دامووده‌ستگه سیاسی و کۆمه‌ڵایه‌تییه‌کانه، ده‌ستی به‌سه‌ر میدیادا گرتووه و به‌و توانا ماددییه‌ی هه‌یه‌تی، به‌گژ هه‌ر ده‌نگێکدا ده‌چێته‌وه، که تێگه‌یشتنی باوی تێ په‌ڕاندووه. هه‌وڵ ده‌دات نه‌ک بیخاته په‌راوێزه‌وه، به‌ڵکوو مه‌به‌ستیه‌تی به ته‌واوی بیسڕێته‌وه، ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ ئه‌و لۆژیک و قاڵبه‌دا ڕێک نه‌که‌وێت، که ڕه‌خنه‌گری میللی له سنووری توانای خۆیدا به ده‌ستی هێناون.

---

(١٦٨) امبرطو ايكو، الأثر المفتوح، ترجمة: عبد الرحمن بو علي، دار الحوار لـلنشر والتوزيع، الطبعة الثانية، سورية، ٢٠٠١، ص٢٤

(١٦٩) هه‌مان سه‌رچاوه، ل٥٣

پێشتر گوتوومە ڕۆمان ناتوانێت ڕوون بێت، بەوەی ڕووبەڕووی ئەو دنیایە بووەتەوە، کە فیلۆسۆفانیش ڕووبەڕووی بوونەتەوە. (کۆندێرا) پێی وایە ئەو مرۆڤەی (دێکارت) پێشتر پلەی تا پلەی گەورە و خاوەنی سروشت بەرز کردبووەوە، وای لێ هات لە چاو هێزەکانی تەکنیک، سیاسەت و مێژوو ببێتە شتێکی کەم، کە تێی بپەڕێنن، بەسەریدا زاڵ ببن و بیکەنە کۆیلە. لێرەوە ئاماژە بە ڕۆڵی هەردوو فیلۆسۆفی گەورە (هوسێرل) و (هایدیگەر) دەدات، بەوەی پەنهانی (غموض)ی ئەو ماوەیەیان ئاشکرا کردووە، بەڵام پێی وایە ئەو پەنهانییە ناتوانێت لە نرخی ئەو چوار سەدەیەی دوایی کەم بکاتەوە، کە هەست دەکات بەو سیفەتەی ڕۆماننووسە، نەوەک فیلۆسۆف پێوەندیی پێوە هەیە. دەڵێت: (لای من دامەزرێنەری سەردەمی نوێ، تەنیا دێکارت نییە، بەڵکوو سێرڤانتسیشە).([170]) (کۆندێرا) دەیەوێت بڵێت ئەوەی ڕۆماننووس لە چاوی خۆیەوە دەیبینێت، هەمان ئەو دنیایەیە، کە فیلۆسۆفیش دەیبینێت، بۆیە ئەوەی (سێرڤانتس)ی ڕۆماننووس، نووسەری (دۆنکیشۆت) لە ڕووی ئێستاتیکاوە بەرهەمی هێناوە، کەمتر نییە لەوەی (دێکارت)ی فیلۆسۆف لە ڕووی فەلسەفییەوە پێی گەیشتووە. بەم شێوەیە دەکرێت بڵێین ئەوەی (هایدیگەر) لەو سەردەمەدا خەریکی بووە، هەمان

---

[170] میلان كونديرا، فن الرواية، ترجمة: خالد بلقاسم، المركز الثقافي العربي، المغرب، ٢٠١٧، ص١٢

ئەوەیە نووسەری ئەدەب لە ڕێگەی ئەدەبەوە ڕووبەڕووی بوونەتەوە. نووسەری وەک (ساموێل ریجاردسۆن)، (بەلزاک)، (فلۆبێر)، (تۆلستۆی)، (پرۆست) و (جۆیس) بە نموونە دەهێنێتەوە.([171])

بەوەدا ئەدەب بە هەمان شێوەی فەلسەفە ڕووبەڕووی دنیایەکی ئاڵۆز دەبێتەوە و دەیەوێت قوڵایی و دژایەتییەکانی ئەو دنیایە ئاشکرا بکات، ئەوا ناکرێت ڕوون بێت و خوێنەر بە ئاسانی لێی تێبگات. (هایدیگەر) پێی وایە ئەوەی شاعیر دەیڵێت و ئەوەی بیرمەند دەیڵێت، هەرگیز وەک یەک نین، بەڵام هەردووکیان دەتوانن یەک شت بڵێن بە چۆنییەتیی جیاواز.([172]) لەگەڵ ئەوەیشدا پێی وایە بۆشاییی گەورە لەنێوانیاندا هەیە.

من لە پێشەکیی (ڕاگەردان)دا نووسیومە:

{(داڤید هێربێرت لۆرانس) لە سەرەتای ڕۆمانی (دۆستی لەیدی چاتەرلی)دا دەڵێت: (سەردەمەکەمان لە جەوهەردا تراجیدییە، بۆیە نابێت بە تراجیدی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین). منیش باوەڕم وایە وەکوو چۆن تراجیدیا ڕێگەیەکە بۆ بینینی دنیا، ئەوا کۆمێدیایش ڕێگەیەکی دیکەیە و هەردووکیشیان لە بنەڕەتدا یەکێکن. ئەگەر تراجیدیا لە سەردەمی زوودا، بەتایبەتی لای

---

[171] هەمان سەرچاوە، ل١٣

[172] مارتن هیدجر، التقنیة_الحقیقة_ الوجود، ترجمة: محمد سبیلا و عبد الهادي مفتاح، المرکز الثقافي العربی، الدار البیضاء، ط١، ١٩٩٥، ص١٩٨

گریکەکان لە ململانێی نێوان مرۆڤ و خواوەنددا ڕەنگی دەدایەوە وەک لە (ئۆدیپ) و (سیزیف)دا دەیبینین، ئەوا لە ڕۆماندا، کە بەرهەمی دنیای نوێیە، لە ململانێی تاک جارێک لەگەڵ خودی خۆی و جارێکی تر لەگەڵ کۆمەڵگەدا دەردەکەوێت. مرۆڤی مۆدێرن، کە غەرقی نیگەرانی، دڵەڕاوکێ، تەنیایی و نامۆییە، ئەو مرۆڤەیە، کە ڕۆماننووس ڕووبەڕووی دەبێتەوە، هەموو خەسڵەتەکانی تراجیدیای لە خۆیدا هەڵگرتووە. مادام ڕۆمان دەتوانێت فرەدەنگی بهێنێتە کایەوە، ئەوا دەبێتە زەمینەیەک بۆ دەرخستنی ئەو خەسڵەتانە. (نیتشە)، کە تا سەر ئێسقان بە تراجیدیای گریکی سەرسامە، لە کتێبی (لەدایکبوونی تراجیدیا)دا پێی وایە تراجیدیا نەک هەر ڕێگەی بەرگرییە لە مەرگ، بەڵکوو سەرچاوەی ژیانی ئەبەدییە و ئاڕاستەیە بۆ ئاسۆ نەزانراوەکان، بەوەی وامان لێ دەکات چێژ لە ئازار ببینین. دەکرێت بڵێین تراجیدیا شوناسی سۆپەرمانی (نیتشە)یە. واتە تراجیدیا ئەو ڕێگەیەیە، کە سۆپەرمان خۆی پێ لە کەسانی ئاسایی جیا دەکاتەوە.

ئەگەر (شۆپێنهاوێر) و (نیتشە) لەبارەی چەمکی تراجیدیاوە بۆچوونی جیاوازیان هەبێت، ئەوا لەوەدا یەک دەگرنەوە، کە تراجیدیا بزوێنەری ئیرادەی مرۆڤە. هەموو قووڵبوونەوەیەک لە بیرکردنەوەدا قووڵبوونەوەیە لە تراجیدیادا، بگرە بیرکردنەوە هەر خۆی پرۆسەسێکی تراجیدییە. ڕۆمانە هەر

گرنگەکانی دنیا ئەوانەن، کە بە هۆشیارییەوە مامەڵەیان لەگەڵ تراجیدیادا کردووە. تراجیدیا لای من وێنەیەک نییە لە دەرەوە هاتبێت، بەڵکوو خودی ڕاستەقینەی خۆمە و بووەتە زمان و بیرکردنەوەم. بە بێ تراجیدیا ناتوانم نە خودی خۆم و نە دەرەوەیش هەست پێ بکەم. هیچ کارەکتەرێکم نییە بە تراجیدیا لە دایک نەبووبێت، بە تراجیدیا پێوەندیی بە دنیاوە نەکات و بە تراجیدیا لە کات و شوێن نەڕوانێت.}

(کۆندێرا) پێی وایە مرۆڤ خەون بە دنیایەکەوە دەبینێت، چاکە و خراپە بە ڕوونی لە یەکتر جیاواز بن، چونکە مرۆڤ لە ناوەوەیدا ئارەزوویەکی زگماکی و گەرمی هەڵگرتووە پێش تێگەیشتن، بڕیار بدات. هەر لەسەر بنەمای ئەو ئارەزووەیشدا ئایین و ئایدیۆلۆجییەکان دامەزراون، بۆیە ئەوانە لەگەڵ ڕۆماندا ڕێک ناکەون. پێی وایە ئەوانە بەوەدا دۆگمایین و خاوەنی چەمکی ڕەهان، بۆیە دەیانەوێت یەک لەو دوو لایەنە لەسەر هەق بێت.[١٧٣]

واتە ئەو تێگەیشتنە سواوە هەمیشە دەیەوێت ڕۆمان بۆ شتی سادە کورت بکاتەوە، تاکوو بە چاک، یان بە خراپ حوکمی لەسەر بدات، لە کاتێکدا نووسەری ئەدەبی بە هەمان شێوەی فیلۆسۆفان لە دژی ئەو باوەڕەدا وەستاونەتەوە. لای ئێمە ئەوە

---

[١٧٣] ميلان كونديرا، فن الرواية، ترجمة: خالد بلقاسم، المركز الثقافي العربي، المغرب، ٢٠١٧، ص١٥

ڕەخنەی میللییە کار بۆ ئەو ئاسانکارییە دەکات و ڕەخنەگری میللییە هەر ڕۆمانێک بە خراپ دەزانێت، ئەگەر بە ڕوونی ئەوە دەرنەخات کێ لەسەر هەقە و کێ زۆردار.

بە باوەڕی (کۆندێرا) ڕۆمانیش وەک سەرجەم بوارەکانی تری کەلتوور کەوتووەتە دەست ڕاگەیاندنەوە. دامودەستگەی ڕاگەیاندن ڕۆڵی بەرچاو لەوەدا دەبینێت چۆن هەندێک کاری سادە لای خوێنەر گەورە بکەن و ڕەواجی پێ بدەن، تەنیا لەبەر ئەوەی لای خەڵک خۆشەویستن.([١٧٤]) ئاماژە بەو گوتەیەی (گۆستاڤ فلۆبێر) دەدات: (ڕۆماننووس، کەسێکە لە پشت داهێنانەکەیەوە خۆی دەشارێتەوە) و دەڵێت خۆی لە پشت داهێنانەکەی دەشارێتەوە، واتە نایەوێت ببێتە کەسێکی گشتی. پێی وایە ئەمڕۆ کارێکی وا ئاسان نییە، مادام هەموو شتێک دەبێت بە دەستگەکانی ڕاگەیاندندا تێ بپەڕێت. ئەمە ڕێک پێچەوانەی بۆچوونی (فلۆبێر)ـە، کە داهێنان خۆی لە پشت نووسەرەکەی دەشارێتەوە. ئەو سەرنجەی (فلۆبێر)م وا لا دەردەکەوێت، وەک بیەوێ بڵێ کاتێ ڕۆماننووس ڕۆڵی کەسی گشتی دەبینێت، داهێنانەکەی دەکەوێتە مەترسی، بەوەی تەنیا دەبێتە پاشکۆی هەڵسوکەوت، هەڵوێست و گوتەکانی.([١٧٥])

---

[١٧٤] هەمان سەرچاوە، ل٢٦

[١٧٥] هەمان سەرچاوە، ل ١٧٩و١٨٠

ئایا ئەوە لەسەر من جێبەجێ دەبێت؟ یەکێکم لەوانەی زۆرکەم لە تیڤییەکان دەرکەوتوون، ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەندامی ستافی ڕۆژنامەیەک، یان گۆڤارێک نەبووم، تەنانەت ئەکاونتی فەیسبووکم نزیکەی دە ساڵ لەمەوبەر داخست. با یەک لەو نووسەرانە بە هاوڕێ نزیکەکانیشمەوە بێت و بڵێ جارێک داوام لێ کرد لەبارەی بەرهەمێکمەوە بنووسێت! ئەمانە بۆ ئەوە ناڵێم بەرگری لە خۆم بکەم، لە کاتێکدا پێویستم بەوە هەر نییە.

نووسەر هەیە ئەگەر چیرۆکێکی، یان شیعرێکی بۆ زمانێکی تر وەربگێڕن، سەرجەم میدیاکانی لێ ئاگادار دەکاتەوە، کە هیچ دژی نیم و بە خراپی نازانم، بەڵام من وەرگێڕێک، کە پێشتر ناویم نەبیستبوو، سەرجەم بەرهەمەکانمی بۆ فارسی وەرگێڕاوە و بە شایەتیی ڕەخنەگرە بەتواناکانی ئەو زمانە ڕۆمانی (کازینۆی منداڵان)م، کە ئەمساڵ لە دەستگەیەکی چاپەمەنیی زۆر باشدا چاپ کراوە؛ شێوازێکی نوێیە لە هونەری ڕۆماندا، ئایا هاتم بە کەسە نزیکەکانیشمی بڵێم؟ ئەرێ ئەو دەستگەیەی پێشتر ڕۆمانەکەی بە کوردی چاپ کردووە، وەک هەواڵیش ئەمەی بە خوێنەر گەیاندووە؟ نەخێر. گلەییی لێ دەکەم؟ نەء. هەست ناکەم کارێکی خراپی کردووە. لە هیچ میدیایەکی کوردیدا باسی ئەوە کراوە؟ نەمزانیوە.

دووبارەی دەکەمەوە نە خۆم هەرگیز ویستوومە کەمترین کار بۆ ناساندنی بەرهەمەکانم بکەم و نە میدیاکانیش بایەخیان بە ناوم داوە. یەک دەنک گلەییشم نییە. تۆ نەبوویتایە، ئەوەندەیشم نەدەگوت.

بە دەگمەن خوێنەری ئێمە گلەیی لە فیلۆسۆف دەکات، کاتێ بە ئاسانی لە بۆچوونەکانی ناگات، یان هەر لێیان تێناگات، بەڵام ئەو گلەییە ڕووبەڕووی نووسەری ئەدەبی دەکرێتەوە، ئەگەر بەرهەمەکانی ڕوون نەبن، چونکە هێشتا ئەو وێنەیەی لا ماوە، کە ئەدەب قسەی خەڵک دەکات و بۆ خەڵکیشی دەکات.

ئەو تێگەیشتنە سادە و کرێسپەی، کە ڕەخنەگری میللی ڕەواجی پێ دەدات، لانی کەم لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەهەمەوە لە کەڵک کەوتووە. لەگەڵ دەرکەوتنی تیۆرییەکانی زمان، کە لە بەرهەمەکانی (فردیناند دی سۆسیۆر)، (لیڤی شتراوس) و زۆری تردا بەرجەستە دەبن، لەپاڵ دەرکەوتنی کۆمەڵێک قوتابخانەی تری زمانەوانی لەوانە (قوتابخانەی پراگ)ی (رۆمان جاکۆبسن)، (قوتابخانەی کۆپنهاگن)ی (لویس هێلمسلێڤ)، قوتابخانەی (فێرت: Firth)ی (جۆن فێرت)، قوتابخانەی زمانەوانیی ئەمەریکیی (ئێدوارد ساپێر) و ئەوانەی تردا، ئەدەب و هونەر گۆڕانی گەورەیان بەسەردا هات.

ئەگەرچی زمان هەر لە فەلسەفەی یۆنانییەوە بایەخی خۆی بەسەر فیلۆسۆفاندا سەپاندووە، بە ڕادەیەک دەکرت بگوترێت لینگویستیک و فەلسەفە پێکەوە چاویان هەڵهێناوە و گەشەیان کردووە، بەڵام وەک گوترا لە سەدەی بیستەمەوە ئەو بایەخە زۆر گەورەتر دەبێت. دەکرێت بگوترێت لە سەردەمی فەلسەفەی کرانەوەدا، کە بە ڕاستی لە (نیتشە)وە دەست پێ دەکات و بە (هایدیگەر)، (گادامێر)، (فۆکۆ)، (دێریدا) و زۆری تردا تێدەپەڕێت، زمان بە هێزێکی گەورەوە بەگژ هەموو داخراوێکدا چووەتەوە و لە هەر دیسکۆرسێکدا کۆمەڵێک کەناڵی گوتن و دەربڕینی هێناوەتە دی.

ئەو هەوڵانە ئەوەیان دەرخست، کە ناکرێت زمان تەنیا ئەرکی دیاریکراوی گەیاندن و جوانکاریی هەبێت، بەڵکوو پێویستە لەپێناوی خۆیدا بایەخی پێ بدرێت، نەوەک لەپێناوی شتی تردا. وای لێ هات زمان نوێنەری هەر کارێکی ئەدەبی، هونەری، فەلسەفی و هیی دیکە بێت و هەر لەگەڵ ئەو نوێنەرەیشدا مامەڵە بکرێت، بەوەی هەم قسەکەری خۆی و هەم هیی سەرجەم لایەنەکانی تری هەر کارێکیشە. ئەوە دنیای دروست کردووە و هەر ئەویشە دەتوانێت دایەلۆگ لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا بکات. (کلود لیڤی شتراوس)، لە کتێبی (ئەنترۆپۆلۆجیای بونیادگەری)دا لەو بەشەی ناوی ناوە (ڕاڤەی بونیادگەرانە لە زمانەوانی و ئەنترۆپۆلۆجیا: Structural Analysis in

(Linguistics and in Anthropology)، دەڵێت: (زمان لەناو زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا شوێنێکی تایبەت داگیر دەکات، کە هیچ مشتومڕ هەڵناگرێت سەر بەو زانستەیە. هەر تەنیا زانستێکی کۆمەڵایەتی نییە وەک ئەوانەی تر، بەڵکوو زانستێکە گەورەترین پێشکەوتنی هێناوەتە کایەوە، بگرە تاکە زانستێکە بە ڕاستی بیەوێت خۆی بە زانست بزانێت، بەوەی لە لایەک میتۆدی ئەزموونگەری (empirical method)ی داهێناوە و لە لایەکی تریش تێگەیشتنی دەیتا پێشکەشکراوەکانی هێناوەتە گۆڕێ بۆ لێکۆڵینەوەیان.([١٧٦])

ئەوەیش سەیر نییە، کە هەتا بایەخی فەلسەفە بۆ زمان گەورەتر بووبێت، کرانەوەییی زیاتری بە خۆوە دیوە و ئەو سێنتراڵە پتر تێک شکاوە، کە هەمیشە وا خۆی دەرخستووە خاوەنی تاقەزمانە و هەموو زمانەکانی تری بە لۆکاڵ زانیوە. هەر لێرەدا بۆ نموونە فەلسەفەی (دێریدا) چاو هەڵدەهێنێت، کە سێنترالیزم بە هەموو شێوەکانیەوە دەکاتە وەهمێک و بەگژ پایەکانیدا دەچێتەوە. لەم ڕوانگەیەوە بایەخ بەو کەلتوور و زمانانەی تریش دەدات، کە ئەو سێنترالیزمە بە نەبووی دەزانین، یان وەک لۆکاڵ لێی دەڕوانین. پێشتریش (شتراوس)

---

[١٧٦] Claude Levil-Strauss, Structural Anthropology, Translated from the French by Claire Jacobson and Brooke Grundfest Schoepf, BASIC BOOKS, In c., Publishers, New York, ١٩٦٣, pp٣١

لە ڕووی ئەنترۆپۆلۆجییەوە ڕێگاردی بۆ ئەو زمان و کەلتوورانە گەڕاندبووەوە. ئەمە باسی سەرەکیی ئێستامان نییە و لە گفتوگۆکانیشمدا کەموزۆر لێیانەوە دواوم.

لێرەدا تەنیا بە کورتی ئاماژە بەوە دەدەم، کە لای خۆیشمان هەتا نووسەر زیاتر ئاشنای ئەو کەلتوورە فەلسەفییانە بووبێت، کە بە ئاراستەی کرانەوەدا کاریان کردووە، وەک لە سەرەوە هەندێک نموونەمان لێیان هێنایەوە، ئەوا زیاتر لە کەلتووری داخستن و بڕیاردان دوور کەوتووەتەوە و پتر بایەخی بە ڕاڤە و وردکردنەوە داوە. دەکرێت بڵێم دوو سێ دەنگی گرنگ لەو نووسەرە لاوانە، کە بە تێگەیشتنێکی قووڵترەوە هاتوون، لە سەرەتاوە ئاستی ڕەخنەی میللییان جێ هێشتووە، بگرە هەر پێیشیدا تێ نەپەڕیون.

لای ئێمە ئەگەرچی لەدوای ڕاپەڕینەوە بایەخی زمان زانرا، بەڵام نەگەیشتە ئەوەی ئەو زانینە گەورە بکرێت و بخرێتە ئاستی تیۆری و پراکتیکەوە. هێشتا نکووڵی لەوە ناکرێت ئەو هەوڵانە گرنگ بوون و تاکوو ئەمڕۆیش هێزی خۆیان تەواو لە دەست نەداوە. ئێمە بەوەدا خاوەنی کەلتوورێکی هەژارین لە بواری نووسیندا، بۆیە هێشتا ئەو تێگەیشتنە زاڵە، کە نووسین بە گرنگ نازانێت. ئەمە وای کردووە زمان وەک پێویست بایەخی نەبێت. (دێریدا) پێی وایە زمان یەک ڕۆژ بوونی

مەبەستم نییە بە وردی لەبارەی زمانەوە بدویم، کە پێشتر لە گفتوگۆکانمدا لێوەی دواوم([179])، بەلام هێندە دەڵێم کاری ڕەخنە، دروستتر کاری ڕاڤە ئەوەیە بایەخی زمان لە بەرچاو بگرێت و لە ڕێگەی پرسیارەوە بەدوای ئەو ڕووبەرە شاراوانەدا بگەڕێت، کە دیوی ناوەوەی هەر تێکستێک پێک دەهێنن. لەو کارە ئەدەبی و فیکرییانەی زمان بایەخی پێ دراوە و ئاستی تێگەیشتنی باویان بڕیوە، ئەوا تێگەیشتنیان لای جەماوەر سەختە، بۆیە سەیر نییە ئەگەر ئەو بەرهەمانە لە ئاستی میللیدا ڕەواجیان نەبێت و نەخوێنرێنەوە. ئەگەر یەکێ لە کتێبەکانی (هایدیگەر) و گوتاری یەکێ لەو نووسەرانەی جوێن بە حزبەکان دەدەن، یان پێیاندا هەڵدەڵێن، بخەیتە دەنگدانەوە، کامیان زیاتر دەهێنێت؟ وەلامەکەی ئاسانە، کە گوتاری ئەو نووسەرە زۆر زیاتر دەنگی پێ دەدرێت، چونکە قسەی ناو دڵی خەڵکێکی زۆر دەکات. واتە ئەو شتانە دەڵێت، کە خەڵک هەر خۆیشیان دەیزانن، بگرە هیی خۆیانە. وەک بەردەوام پێی لەسەر داگیرا بێئاگاییی ئەو ڕەخنەگرە میللییە لە تیۆرییە ئەدەبییەکان و لە بوارەکانی وەک فەلسەفە و ئەوانەی تردا فاکتەرێکی سەرەکییە لەوەی بەرهەمی داهێنەرانە لە ژێرزەمینە تاریکەکاندا ژیان بە سەر ببات و ئەدەبێکی ڕووکەشی سادەیش وەک داهێنانی گەورە سەیر بکرێت.

---

[179] http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٠/٣/karwan_bakhtyar.htm

وا ڕێک کەوتووە زۆربەی ئەو فیلۆسۆفانەی لە گوتارەکانتدا ناوت هێناون، سەر بە فەلسەفەی کرانەوەن و بایەخی گەورەیان بە زمان داوە، بەڵام ئایا سەیر نییە هێندە لەگەڵ تەسککردنەوەی زماندایت؟ ئایا سەیر نییە ئاوا شتەکان دادەخەیت و بەو ڕەهاییە بەرهەمی نووسەران دەسڕیتەوە؟

# ئاوڕدانەوەیەکی تر لە چەمکی وڕێنە

تۆ خۆتت وەک ڕەخنەگری ئەدەبی ناساندووە، کەچی بۆ ئەوەی نرخی کتێبێک کەم بکەیتەوە، بە وڕێنەی دەزانیت، دیسان پێوەندیی بەوەوە هەیە، کە وەک پێویست ئاگات لە بوارەکەت نییە، چونکە لانی کەم لە (فرۆید)ـەوە وڕێنە و هەلوەسەیشن دەبنە بابەتی گرنگی دەروونشیکاری، کە هەر خێرا ئەو تێگەیشتنە نوێیە لە ئەدەبدا ڕەنگ دەداتەوە. بە دەگمەن سایکۆلۆجیستێک هەیە بە شێوازی خۆی ڕووبەڕووی ئەو چەمکانە نەبووبێتەوە. کاتێک دەگاتە لای (فۆکۆ) گۆڕانێکی گەورەتری بەسەردا دێت. ئەگەر (فۆکۆ) پێی وایە ناوەرۆکی نەخۆشی کۆی سەرجەم کاردانەوەی ڕاکردن و بەرگرییە، کە بە هۆیەوە نەخۆش بۆ ئەو دۆخەی خۆی تێیدا دەبینێتەوە، وەڵامدانەوەی دەبێت، ئەوا (پیر جاسیرم: Pierre Jacerme) لە هەمان ڕایەڵدا ڕوونی دەکاتەوە، کە سایکۆسیس (ذهان)(*) ململانێی دەروونی دەردەبڕێت، هاوسەنگییەک لەنێوان ویست و بەرگریدا پێک دەهێنێت، بنەمای خۆی لە منداڵیی نەخۆشدا دەدۆزێتەوە. سایکۆسیس بەر لە هەرچی دابڕانی نێوان (من) و

واقیعه، (من)ی له ژێر دەستەڵاتی غەریزەدا جێ هێشتووه. بریتییه له بنیاتنانەوەی ورێنەیی (الذهانیة: delirious) بۆ واقیعێکی هاوڕێکی ئەو غەریزانه. دواجار ڕێگەی بەرگرییه بەتایبەت دژی واقیعێک، نەخۆش تێیدا دەژی، که بەرگەی ناگیرێت.([180])

ئەگەر ئەمەت له سەرەتا و ناوەڕاستی هەشتاکان له (ئامادەییی ڕزگاری)دا بگوتایه، که خۆم یەکێک بووم له قوتابییەکانی ئەو قوتابخانەیه، ئەوا هەر خێرا یەکێکیان کتێبەکانی (فرۆید)ی دەهێنا، بەتایبەتی کتێبی (ورێنه و خەون له هونەردا)، تاکوو پێشانت بدات ئەو سایکۆلۆجیسته لەو بارەیەوه چیی گوتووه. به دەگمەن خوێنەری جیدی هەبوو ئەم کتێبەی نەخوێندبێتەوه، یان لانی کەم چەند شتێکی لەبارەیەوه گوێ لێ نەبووبێت. له خۆم ڕادەبینم بڵێم تۆ وەک ئەو قوتابییانه (فرۆید) و بەشێک له بەرهەمەکانیت بناسیایه، ئەو قسەیەت نەدەکرد. ئێستایش لانی کەم سێ لەو هاوڕێیانەم ماون، که نووسەر نین، بەڵام لێیان ڕادەبینم لەبارەی ورێنەوه ناوی کۆمەڵێک سەرچاوەت پێ بڵێن و پێناسەیەکی وردی ئەو چەمکەت بۆ بکەن.

---

* سایکۆسیس (ذهان: psychosis) دۆخێکی تێکچوونی عەقڵییه، که نەخۆش پێوەندیی به دنیای دەرەوه کەم دەبێتەوه، یان هەر نایمێنێت. ورێنەو هەڵوەسه له نیشانەکانی ئەو دۆخەن.

[180] محمد امنصور، السرد والجنون، لعبة التمثلات القصوی، کتاب الفقدان لمحمد اسلیم ، مجلة نقد وفیکر، عدد٥٣، سنة٢٠٠٣، ص٦٠

ساڵی هەشتاوپێنج، کە چیرۆکی (خێو)م نووسی، ئیلهامم لە ڕووداوێکی ڕاستەقینە وەرگرت، بەڵام ئەوەی کۆمەکی کردم، ئەو کتێبە بوو، بەتایبەتی ئەم پەرەگرافە: {باوەڕبوون بە ڕۆح و تارماییەکان (الارواح والاشباح)، کە زۆربەی خاڵی جەختکردنەوەی خۆیان لە ئایینەکان وەردەگرن، لانی کەم لە منداڵیدا نیگەرانمان دەکەن، دەڵێم بڵێسەی ئەو باوەڕە، تەنانەت لای خەڵکی ڕۆشنبیریش خامۆش نابێتەوە، زۆربەیان هۆشیارن، کە باوڕەیشیان وایە نێکرۆمانسی (استحضار الارواح) هەڵسوکەوتێکە لەگەڵ عەقڵدا دێتەوە، تەنانەت ڕووناکبیر و ئاتائیستەکانیش لە کاتی تەنگانەدا بۆی دەگەڕێنەوە}.([١٨١])

من لەو کاتەوە ئەو کتێبەم نەبینیوەتەوە، بەڵام هەر هێندە ئەوەم خوێندەوە تۆ چەمکی ورێنە بێنرخ دەکەیت و بە زمانی میللی لێوەی دەدوێت، بگرە لێوەی نادوێیت، بەڵکوو هەر بە لاوەی دەنێیت؛ بە بیرم هاتەوە و خێرا بۆی گەڕامەوە.

(فرۆید) پێی وایە شاعیر و ڕۆماننووسان لە سەردەمە زووەکانەوە خەریکی ڕاڤەکردنی خەون بوونە، کە لە ڕێگەی خەونی کارەکتەرەکانیانەوە وێنەی دۆخە دەروونییەکانیان

---

[١٨١] سیغموند فروید، الهذیان والاحلام في الفن، ترجمة: جورج طرابیشي، دار الطلیعة بیروت، الطبعة الاولی، ١٩٧٨، ص٨٠و٨١

کێشاوە. خەون بەرهەمی فانتازیای نووسەرانە، کە دەیدەنە پاڵ کارەکتەرەکانیانەوە.(١٨٢)

لەم ڕووەوە ڕۆمانی (گرادیڤا: Gradiva)ی (ویلیەم جێنسن) بە نموونە دەهێنێتەوە، کە کارەکتەرەکەی شوێنەوارناسێکی لاوە. لە ڕۆما پەیکەرێکی بچووک دەدۆزێتەوە و زۆری بە دڵ دەبێت، بۆیە دانەیەکی تری ڕێک وەک خۆی لە قاڵبێک دادەڕێژێت، بەو مەبەستەی لە ئۆفیسەکەی لە ئەڵمانیا هەڵیبواسێت و لێی بکۆڵێتەوە. ئەو پەیکەرە کچێکی گەنجی سەرنجڕاکێش دەنوێنێت، کاتێ هەنگاو دەنێت، کەمێک چمکی کراسی هەڵدەبڕێت، کە شاقەلی زۆری تێدان. قاچێکی بە زەوییەوە چەسپ کردووە و خەریکە ئەوەی تریان هەڵدەبڕێت، تەنیا پەنجەگەورەی لەسەر زەوی ماوە، لە کاتێکدا پێڵاوەکە، کە لێی بەرز بووەتەوە، بە شێوەی ستوونی دەردەکەوێت. وا دەچێتە خەیاڵەوە ئەو ڕۆیشتنە ئاسایی نییە (باو نییە)، کە لەوپەڕی لەشسووکیدایە. ئەوەیشە سەرنجی هونەرمەندە پەیکەرسازەکەی ڕاکێشاوە، هەر ئەوەیشە دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو نەوە و سەدەیە، شوێنەوارناسەکەی دیل کردووە. بایەخی کارەکتەری ڕۆمانە کورتەکەی بەردەستمان ڕووداوێکی سایکۆلۆجییە.(١٨٣)

---

١٨٢ هەمان سەرچاوە، ل٧

١٨٣ هەمان سەرچاوە، ل٩و١٠

(فرۆید) لەو ڕێگەیەوە دەیەوێت بڵێت نووسەرانی ئەدەب و هونەر، بگرە ئەفسانەی میللییش لە بواری لێکۆڵینەوەی دەروونی مرۆڤدا دەستپێشخەرن و لەپێش سایکۆلۆجیستەکانەوە دەستیان بۆ بردووە.

ئەمجارەیان دەنووسێت: {ڕۆماننووس زۆرجار ناو لە دۆخی (نۆربێرت هانۆڵد) دەنێت وڕێنە. ئێمە خۆمان پاساوێکمان نییە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ناونانە. دەکرێت دوو خەسڵەتی سەرەکی بۆ وڕێنە دەستنیشان بکەین، دوو خەسڵەت، کە هەموو وەسفەکانیان قەبووڵ ناکرێن، بەڵام دەرفەتمان دەدەن بە ڕوونی و بە وردی سەرجەم پەشێوییەکان (Disorders) بناسێنین: یەکەم، وڕێنە سەر بەو دەستە نەخۆشییەیە، کە کاریگەریی ڕاستەوخۆیان لەسەر لەشدا نییە، بەڵکوو تەنیا لە ڕێگەی نیشانەی سایکۆلۆجییەوە دەردەکەون. دووەم، وڕێنە دەبێتە شەبەنگ (فانتاسم: Fantasm) (*) و سەربەخۆیی خۆی دەستێنێت، کە دەبێتە بڕیاردەری هەڵسوکەوتی تاک.([١٨٤])

(فرۆید) لەو کتێبەدا چەمکی وڕێنە بە کۆمەڵێک چەمکی تری وەک ئایرۆسی، پارانۆیا، هەلوەسە، چەپاندن، سەرکوتکردن،

---

* لە بەرانبەر وشەی (استیهام)ی عەرەبی (شەبەنگ)م داناوە، بەڵام بەو مەبەستەی ماناکەی ڕوونتر بێت، بە پێویستم زانیوە وشەی (Fantasm)ی ئینگلیزییشی لە تەنیشت دابنێم، کە بە مانای تارمایی و خەیاڵپڵاو دێت.

[١٨٤] هەمان سەرچاوە، ل٥٠

لەبیدۆ و هیی تر پێوەست دەکات و هەوڵی دۆزینەوەی ڕایەڵی نێوانیان دەدات.

پێی وایە خەون و وڕێنە لە یەک سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێن، کە چەپاندنە، بگرە دەکرێت بڵێین خەون وڕێنەیەکی فیزیۆلۆجیی مرۆڤی ساغە (الانسان السوي).([١٨٥]) دواجار هەموو پەشێوییە هاوشێوەکانی وڕێنە لای (هانۆڵد)دا بۆ سەرکوتکردنی ژیانی غەریزە، دروستتر بۆ سەرکوتکردنی ژیانی غەریزەی سێکسی دەگەڕێنەوە.([١٨٦])

(ژۆلیا کریستیڤا) پێی وایە کێشەیەکی ئاڵۆز لە پێوەندیی نێوان دەروونشیکاری و زماندا هەیە... دەروونشیکاری بابەتی خۆی لە قسەی نەخۆشدا دەدۆزێتەوە. لەوەیش زیاتر هیچ ڕێگەی تری نەدۆزیوەتەوە بۆ دەرخستنی میکانیزمی کاری هەست (شعور: ئاگایی)، یان نەست (لاشعور: نائاگایی)ی خود، جگە لە قسە، جگە لە بونیاد و یاساکانی. لێرەوەیە دەروونشیکاری دۆخی خود ئاشکرا دەکات.([١٨٧])

خەون، کە (فرۆید) لێکی دەداتەوە، بەر لە هەرچی بە سیستەمێکی زمانەوانی دادەنرێت، کە پێویستە کۆدەکانی

---

[١٨٥]هەمان سەرچاوە، ل٧٠

١٨٦ [١٨٦]هەمان سەرچاوە، ل١٠٢

[١٨٧]جولیا کریستیفا، التحلیل النفسي والـلغة، ترجمة: د. زیاد عزالدین عوف، مجلة الاداب العالمیة، سوریە، العدد١٣٦، سنة٢٠٠٨، ص١٤

بکرێنەوە، بەڵکوو ئەوە جۆرێکە لەو نووسینەی، کە یاساکانی وەک هیی هایرۆگلۆفی وان، واتە لە شێوەی وێنەدان.([188])

ورێنە ئیلەمێنتە سەرەکییەکەی خەونە، لە کاتێکدا خەون لای (ریکۆر) تێکستە و ڕاڤەکردنی خەون هێرمۆنتیکایە، بەوەی هەموو ڕەگەزەکانی هێرمۆنتیکا لە خۆی دەگرێت. خەون تێکستێکە پڕ لە وێنەی سیمبۆڵی. ڕاڤەکاری خەون شێوازێکی ڕاڤەکاری دەگرێتە بەر، تاکوو خەون لێک بداتەوە و مانا شاراوەکانی بخاتە ڕوو.([189])

ئەو نەخۆشییانەی لە واقیعدا وەک خاڵی لاواز و کرێسپ دەردەکەون، لە ئەدەب و هونەردا دەبنە هێزی گەورەی داهێنان. داهێنەر لە ڕێگەی ئەو دۆخە دەروونییانەوە دنیایەکی تر دروست دەکات، کە سیماکانی ئەو دنیایە تەواو لەوانە جیاوازن، پێشتر واقیع پێشانی داوین، چونکوو واقیع بەپێی سیستێمێکی دیاریکراو خۆی دەردەخات، کە ئەو سیستێمە دەیەوێت هەموو شتێک ڕێک بێت. بەم شێوەیە ناڕێکی هەمیشە دەشاررێتەوە، بگرە هەوڵی سەرکوتکردنی دەدرێت. لێرەوەیە شێت لە کۆمەڵگە جودا دەکرێتەوە، چونکە شێتی دژی سیستێمە. زمانەکەیشی ئەو شتەیە، کە لە ڕێکی لای داوە، بۆیە دەبێت سەرکوت بکرێت. ئەدەبی داهێنەر کاتێ دروست دەبێت،

---

[188] هەمان سەرچاوە، ل١٥

[189] د. عادل مصطفى، فهم الفهم، مدخل الى الهرمنيوطيقا، نظرية التأويل من افلاطون الى جادامر، رؤيه لـلنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعة الاولى، ٢٠٠٧، ص٧٧

که زمانێکی تر دادەهێنێت. ئەو زمانە نەک هەر ڕێک نییە، بەڵکوو توانای ئەوەی هەیە بەگژ ڕێکییشدا بچێتەوە، بۆیە وڕێنە مانای تێکشکاندنی سیستێمی زمانی واقیع و کردنەوەی ڕووبەری بێسنوورە لە بەردەمی ئەو زمانەی دوای ئەو تێکشکانە هاتووەتە دی.

ئەگەر زمانی مرۆڤی ساغ، ئەو مرۆڤەی بەپێی سیستێمی دیارکراوی زمان دەدوێت، زمانی ئاگاییە، بەوەی دەبێت هەمیشە ئاگای لەوە بێت پێڕۆیی یاساکانی زمان بکات، بە مانایەکی تر لە دابونەریتی کۆمەڵگە لا نەدات، ئەوا زمانی نەخۆش (نەخۆش بەو مانایە نا، کە نیتشە وەسفی دەکات، بەڵکوو بە مانا پارادۆکسەکەی) زمانی نائاگاییە، زمانێکە لە سنوورێکی دیاریکراودا نەماوەتەوە و لەوە دەرچووە بەپێی یاسا دیاریکراوەکانی زمان بدوێت، بەڵکوو گەیشتووەتە دەرەوەی سیستێم و ئازادانە خۆی دەردەبڕێت. ئەو زمانە جیاوازییەک لەنێوان خەون و واقیعدا ناهێڵێت، بگرە هەردووکیان دەکاتە یەک، بەو مانایەی هیچ یاسایەک خۆی بەسەردا نەسەپێنێت. بەم شێوەیە ئەدەب هێزی خۆی لە گێڕانەوەی ڕێگارد بۆ ئەو شتانە وەردەگرێت، کە سیستێم بە لاوەیان دەنێت، دەیانشارێتەوە، یان دەیەوێت بیانسڕێتەوە، بۆیە ئەدەب تەنیا کاتێ دەتوانێت داهێنەر بێت، کە ئاڕاستەی پێچەوانەی تێگەیشتنی خەڵک و هێی دامودەستگەکان دەگرێت.

لای من شتێکی سەیر و ڕێکەوت نییە، کە زمانی شێت، لە سەردەمی فەلسەفەی کرانەوە و تێپەڕاندندا بایەخی گەورەی پێ دەدرێت، بایەخێک هەرگیز پێشتر نەبووە و نەناسراوە، بەتایبەتی لای (فۆکۆ)دا. ئەگەر پێویست بکات، وەک باسێکی سەربەخۆ بۆ ئەمە دەگەڕێمەوە. دەتەوێت بیەکەینە تەوەرەیەکی گفتوگۆکەمان؟

ئەو ئەدەبەی دڵی زۆرایەتی ڕازی دەکات، ئەدەبێکی پەسەندکراوە لە ئاستی میللیدا، بەڵام بەوەدا هەمان دیدگە و گوتەی خەڵک لە خۆی دەگرێت، لە چوارچێوەی قۆناغێکی دیاریکراویی مێژووییدا دەمێنێتەوە. ڕەخنەگری میللی بەوەی لە سەرچاوەکانی زانین بێئاگایە، تەنیا سەری لەو ڕووداوانە دەردەچێت، کە زەقن، بۆیە کاتێ نووسەرێک باس لە نهێنیی دنیا بکات و بەر ئەو شتانە بکەوێت، کە لای خەڵک نەناسراون، ئەوا سەری لێ تێک دەچێت و لەوە زیاتر نادۆزێتەوە بڵێت ئەوە وڕێنەیە. نووسەرە داهێنەرەکان هەمیشە بەدوای ئەو شتانەدا گەڕاون، کە پەراوێز خراون. بۆ نموونە (فۆکۆ) لە ڕووداوی گەورەی مێژوویی زیاتر بایەخ بە ڕووداوی کەمبایەخ دەدات.[١٩٠]

---

[١٩٠] تشارلز ليموت، حقل فوكو، ترجمة: خالدة حامد، مجلة الاداب الاجنبية، سوريه، عدد١٠٩، سنة٢٠٠٢، ص٣٢

(کریستیڤا) دەنووسێت: {لەپێناوی تێگەیشتن لە ژیانی سایکۆلۆجی بە شێوەی چاک، پێویستە واز لەوە بهێنن هێندە زیادەڕۆیی لە گرنگیپێدانی ئاگاییدا بکەین. پێویستە قووڵایی هەموو ژیانی سایکۆلۆجی لە نەستدا ببینین. نەست کە لە بازنەیەکی گەورە دەچێت دەوری هەستی دابێت، بەوەی بازنەیەکی بچووکە، ناتوانین هیچ ڕووداوێکی هەستی (واقعة شعورية)ی تێدا ببینین، بەبێ قۆناغی نەستیی پێشووی، لە کاتێکدا نەست هەرچۆنێ بێت دەتوانێت قۆناغی هەست تێ بپەڕێنێت و بەهایەکی سایکۆلۆجی بە دەست بهێنێت}.([١٩١])

مانای وایە نائاگایی لە ئاگایی گەورەترە و چالاکتریشە، چونکە قووڵاییی ژیانی سایکۆلۆجییە. دەکرێت بڵێین وڕێنە، کە ئێرە سەرچاوەکەیەتی، لانی کەم لە ئەدەبدا شتێکی بێنرخ نییە وەک تۆی ڕەخنەگری ئێمە بە زمانی میللی و بە دوو وشەی سادە یەکلات کردووەتەوە. دوای ئەوە (کریستیڤا) دەڵێت: (هیچ قسەیەک نییە، وەڵامدانەوەی نەبێت، هەتا ئەگەر لە بێدەنگی زیاتر بەر هیچی تر نەکەوێت. لێرەدا گوێگرێکی گریمانی هەیە). واتە مرۆڤ کاتێ دەدوێت، مەرج نییە ئەوەی لە بەرانبەریدایە خودێکی ڕاستەقینە بێت، بەڵکوو دەشێ گوێگرێک بێت، تەنیا لە خەیاڵی خۆیدا هەبێت. هەر خۆی گریمانی کردبێت. واتە مرۆڤ

---

[١٩١] جوليا كريستيفا، التحليل النفسي والـلغة، ترجمة: د. زياد عزالدين عوف، مجلة الاداب العالمية، سوريه، العدد١٣٦، سنة٢٠٠٨، ص١٤

بۆ ئەوانەی تر دەدوێت، کە دەشێ ئەو کەسە خۆی بێت.([192])
هەر لێرەوەیە ئاماژە بە بۆچوونی (جاک لاکان) دەدات، کە ئەو بوونەوەرە شتێک نییە جگە لەوەی خەیاڵ بەرهەمی هێناوە و دێپریڤەیشن (حرمان) هەڵسوورێنەریەتی.

تۆ نووسەر بیت، نەخێر، ڕەخنەگر بیت و دژی خەون بیت، بەو مانایەیش دژی نەبیت، کە بتەوێت ئاراستەیەکی تری نوێ بگریت و پێچەوانەی ئەوەی گوتراوە، لەبارەی خەونەوە بنووسیت، بەڵکوو بە دوو وشەی ڕۆژانە بیسرپێتەوە، ئەوا هەر ئەو گوتەیەتم بە بیر دێتەوە، کە دەڵێ: (نووسەری ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەنووسێت، کە لێنەکانی بوون و ژیانی لە ڕێگەی نووسینەوە پڕ بکاتەوە). هەر نووسەرانی ئەدەب و هونەر خۆیان دەزانن ئەو لێکۆڵینەوانەی (فرۆید) چەند کۆمەکی شێوازی نووسین دەکەن. ئەگەرچی تیۆریی ئەو کەوتووەتە بەر ڕەخنەی گەورە، وەک ئەوەی بۆ نموونە لە کتێبی (سەرمایەداری و شیزۆفرینا، ئەنتی ئۆدیپ)ی (دۆلۆز) و (گاتەری)دا دەیبینین، کە ئەمە سروشتی داهێنانی گەورەیە، بەڵام هەر ئەوەیش زیاتر هێزی پێ داوە. لە (ڕێگەکانی ژەهر) لەسەر زمانی کارەکتەرێکدا باس لەو کتێبە کراوە، کە تۆ بە بەرهەمێکی خراپی دەزانیت، گوایە جەماوەر زۆریان لێ نەکڕیوە.

---

[192] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە١٦

هەموو ڕێبازە ئەدەبییەکانی وەک ڕۆمانتیزم، سیمبۆڵیزم، دادائیزم، سوریالیزم و هیی تریش بایەخی گەورەیان بە خەون داوە و ورێنە یەکێک بووە لە ئێڵەمێنتە گرنگەکانیان. شاعیرانی وەک (بۆدلێر)، (رامبۆ)، (مالارمێ)، (پاوەند)، (ئیلیەت) و زۆری تر لە شیعردا بایەخیان بە خەون داوە و ئاستی واقیعیان تێ پەڕاندووە، تاکوو بگەنە ئاستی ورێنە و هەلوەسە. (ئەندرێ جیۆرج لێیمەن)ی ڕەخنەدۆز پێی وایە خەسڵەتی (رامبۆ) وەک شاعیرێک ئەوەیە، کە توانای دروستکردنی خەونی سەیر و سەمەرە (strange dreams)ی هەیە.(١٩٣)

ئەو خەونە سەیر و سەمەرانەی بە چی دروست کردوون؟ بە زمان. ئایا زمانی باوی ڕۆژانە دەتوانێت خەونی سەیر و سەمەرە دروست بکات؟ نەخێر، بەڵکوو ئەوە زمانی تێکشکاوە ئەو توانایەی هەیە، بۆیە زمانی ئەو شاعیرە واقیع تێ دەپەڕێنێت و دەگاتە ئاستی ورێنە و هەلوەسە.

کاری ئەدەب چییە جگە لە ڕۆچوون بە ناخی مرۆڤدا، تاکوو ئەو شتانە بدۆزێتەوە و دەریانببڕێت، کە لە هیچ کەناڵێکی تردا ناگوترێن؟ ئەگەر من مرۆڤ وا پیشان بدەمەوە وەک لە واقیعدا دەبینرێت، دەدوێت و هەڵسوکەوت دەکات، چیی تازەم هێناوەتە کایەوە؟ ئەو زمانەی لە ناوەوە بەری دەکەوێت، هەمان ئەو

[١٩٣] A. G. Lehmann, The Symbolist Aesthetic In France ١٨٨٥-١٨٩٥, Basil Blackwell, Oxford, ١٩٥٠, pp.٩٩

زمانە نییە، کە مرۆڤ لەپێناوی خۆگونجاندنی لەگەڵ دەوروبەردا ڕێکی دەخات. وەک پێشترا گوترا مرۆڤ زمانی ڕێک دەخات، نەبادا بکەوێتە بەر پەلامار، بۆیە وڕێنە زمانی مرۆڤی ئازادە، بەڵام وڕێنە بەو مانایە نا، کە کەلتووری میللی لێی دەڕوانێت. فیکری فەلسەفی بە درێژاییی تەمەنی خۆی دژی ئەو شتانە بووە، کە وا خۆیان پێشان داوە ڕێکن و لەسەر هیچ دژایەتییەکدا نەوەستاون، بۆیە ویستوویەتی ئەو پایانەیان تێک بشکێنێت. ئەدەبی داهێنەرانە تەنیا کاتێک چاو هەڵدەهێنێت، کە بەگژ ئەو ڕێکانەدا دەچێتەوە و ناڕێک پێشانیان دەداتەوە. لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا چیرۆکی (مام تایدی و پوورە ئەنتایدی)م نووسیوە، کە لە پێشەکیی کتێبی (ڕاگەردان)دا ئاماژەم پێ داوە. لەوێدا ئەو بیرۆکەیەم پراکتیزە کردووە.

وڕێنە تەنیا لە ڕێگەی وشەوە خۆی دەرنابڕێت، بەڵکوو لە وێنەیشدا دەردەکەوێت، بەتایبەتی لای هونەرمەندە سوریالییەکاندا. تابلۆی (جەختکردنەوەی یادەوەری: *The Persistence of Memory*)ی (سەلڤادۆر دالی) نموونەیەکی دیارە، کە تێیدا ڕووبەڕووی سیستێمی زەمەن دەبێتەوە، بەو مەبەستەی ئەو ڕێکییە تێک بشکێنێت، کە زەمەن دەیسەپێنێت و دەیەوێت هەموو شتێک بە یەک ئاڕاستەدا بجووڵێت. (دالی) بە هۆی گۆڕینی شێوەی بازنەیی بۆ

شێوەیەکی تر، کە نە چوارگۆشەیە، نە لاکێشە، نە شەشپاڵوویش، بەڵکوو هەر شێوە نییە، دروستتر ناشێوەیە، خود لە ژێر ڕکێفی زەمەن دەردەهێنێت و ئازادی دەکات. کاتژمێر لەوە دەردەچێت دەستنیشان بکرێت و بۆ مەبەستی دیارکراوی خوێندنەوەی میکانیکییانەی زەمەن بە کار بهێنرێت، بەڵکوو دەبێتە بوونێکی سەربەخۆ و لە دۆخی بابەتەوە دەردەچێت. ئەمە هێزی وڕێنەیە، کە لەم تابلۆیەدا دەردەکەوێت.

ڕۆماننووسان زیاتر لە شاعیران بایەخیان بە وڕێنە و هەلوەسەیشن داوە، کە ئەو بایەخە لای (دۆیستۆیڤسکی)دا بە ڕوونی دەردەکەوێت، تەنانەت ناوی (راسکۆلینکۆڤ)ی ڕۆمانی (تاوان و سزا)ی لە (دابەشبوون بۆ دوو، یان کەرتبوون: split in two or schismatic)، واتە لە شیزۆفرینیا وەرگرتووە.[194] (ڕاسکۆلینکۆڤ)ێک، کە کۆمەڵگە بە لاوەی دەنێت و وەک کێچ لێ دەڕوانێت، ڕێگەی ئەوەی لێ دەگرێت تەعبیر لە خۆی بکات، ئەوا لە ناوەوە لە ڕێی زمانەوە وردتر لە ڕێگەی وڕێنەوە دنیایەکی گەورە دادەمەزرێنێت. وڕێنە

---

[194] **Adrian Campbell , Crime and Punishment is ١٥٠ – and its politics are more relevant than ever.**

لە نێت وەرگیراوە. ئەمەیە لینکەکەی:

http://theconversation.com/crime-and-punishment-is-١٥٠-and-its-politics-are-more-relevant-than-ever-٦٩٢٥٩

بزوێنەری ڕۆمانی شەپۆلی هۆشە، کە پێشتر بە وردی لێیەوە دواوم.

یەکەم ئەزموونم لەگەڵ وڕێنەدا لە چیرۆکی (مردن لەسەر شێوازی شیعر)دا دەست پێ دەکات. چ لە ئامادەیی ڕزگاری و چ لە گەڕەکی ڕووناکی بە هۆی هەندێک هاوڕێوە سایکۆلۆجیا سەرنجی ڕاکێشام، کە پێشتر ڕقم لێی بوو. کاتێ لە بەشی مێژوو وەرگیرام، سایکۆلۆجیا بابەتێکی بنەڕەتی بوو. ئەو زانیارییە کەمەی لەو بارەیەوە پەیدام کردبوو، بە کەڵکم هات و زیاتر پەرەم پێ دا. هەر خێرا لەو چیرۆکەدا ڕەنگی دایەوە، کە ئێستایش نایشارمەوە زۆر سەخت بوو، بۆیە زووزوو لێی بێزار دەبووم و بۆی دەگەڕامەوە، کەچی دواجار هەر بە نیوەچڵی جێم هێشت، تاکوو دواتر لە دانمارک بۆی گەڕامەوە. یەکێکە لە چیرۆکەکانی کۆمەڵەی (سەدەی یەکەمی خەیاڵ). هەر لە دوای ئەو چیرۆکەوە تێکستی شانۆییی (ماڵێک لە بازاڕدا)م نووسی، کە وەک لە پێشەکیی کتێبی (ڕاگەردان)دا ئاماژەی پێ دراوە، ئەو ماڵە دەبێتە شوێنی کۆبوونەوەی مرۆڤی سەیر. لەو بەردەمەدا دوو پیاو بە یەک دەگەن و لە شێوەی وڕێنە دەدوێن، وەک ئەوەی لای (ئیستراگۆن) و (ڤلادیمێر)ی شانۆی (چاوەڕوانیی گۆدۆ)ی (بیکیت)دا ڕووبەڕووی دەبینەوە. ئەو زمانەی (بیکت) لێرەدا بە کاری

هێناوە، ورێنە و هەلوەسەیشنە. دەتەوێت لەو بارەیەوە گفتوگۆیەکی تایبەت بکەین؟

وەک گوترا پێشتر لە گفتوگۆکانمدا هەوڵم داوە بە وردی باسی ورێنە بکەم، کە بەتایبەتی لە ئەدەبی شەپۆلی هۆشدا بایەخی گەورەی هەیە، بۆیە لێرەدا زۆر مەبەستم نییە لەسەر ئەم لایەنە بوەستم. خۆ ئەگەر بزانم پێویست دەکات، ئەوا بە باسێکی سەربەخۆ بۆی دەگەڕێمەوە. ماوەتەوە بڵێین زمانی ئەدەبی و زمانی ڕەخنە جیاوازن. لە ئەدەبدا، کە دنیای ئاگایی و نائاگایی، ڕووبەری خەون و ریاڵ تێکەڵ دەبن، زمان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ بەر شت دەکەوێت و بە شێوەی ناڕاستەوخۆیش دەریاندەبڕێت، بۆیە میتافۆر، ریتۆریک و سیمبۆڵ ڕۆڵی گەورە دەبینن، لە کاتێکدا ڕەخنە زمانی ئاگاییە و ئاڵوگۆڕکردنی زمانی ئەدەبە بۆ ئاستێکی تری تێگەیشتن، بە مانای سادەکردنەوە نا، بەڵکوو بە مانای قووڵکردنەوەی ئەو زمانە.

لە ڕەخنەدا ڕەخنەگر ئەگەر بڵێت: (فلان شاعیر سادەیی دەستەمۆ دەکات)، یان بڵێت: (شوێنگەلێک کە ئەگەر ئەو وشەیەی تێدا نەبێت بەشێک لە جوانی و ئیستاتیکای شیعرەکە کەم دەبێتەوە)، یان بگاتە ئەوەی بنووسێت: (زمانی شیعریی فلان شاعیر دیاردەی ژیان وەردەگرێت و لە دەروونی خۆیەوە وشەی بۆ دەدۆزێتەوە)، ئەوە مایەی پێکەنینە، بگرە مایەی

قاقالێدانە، چونکە زمانی ڕەخنە بۆ لێکۆڵینەوەیە، بەڵام هەمان ئەو ڕستانە ئەگەر کارەکتەرێک بە هۆی ئەوەی لە ناوەوە بە دەست دۆخێکی دەروونییەوە دەناڵێنێت، بیانڵێت، زۆر ئاساییە، بگرە وەک گوترا ڕووبەڕووبوونەوەی سیستێمی زمانی کۆمەڵایەتییە، کە دەیەوێت ڕێک بێت و هەموو شتێک کۆنترۆڵ بکات.

دیارە دەزانیت ئەو ڕستە سەیرانەی خراونەتە نێوان دوو کەوانەوە، هیی خۆتن و منیش لەبارەیانەوە پرسیارم لێ کردوویت. هەردوو نامەکە ماون، کە دوو گوتار لە خۆیان دەگرن. ئایا ئەمانەی من لە خوێندنەوەیان دوور خستییەوە؟ لە نووسینیش؟ لە نووسینی شتی وا؟ پێت وایە هیچ خوێنەرێک لە نووسینی ئەم وشانە پەکی کەوتبێت؟ ئایا خۆت زانیت باسی چی دەکەیت؟ ئێستایش خۆشحاڵم دەبم، ئەگەر بێیتە دەنگ و بڵێی بەڵێ، ئەمانە داهێنانن. دەی، واز لە داهێنان دەهێنین و دەڵێین وەرە پێمان بڵێ ئەوانە چین، نووسیوتن؟

پێم ناڵێی (زمانی شیعریی فلان شاعیر دیاردەی ژیان وەردەگرێت) چییە؟ هەتا ئێستایش خۆت بە خاوەنی ڕستەی لەم شێوەیە دەزانیت؟

گۆرانیبێژێکی میللی ساڵی هەشتاوچوار گۆرانییەکی بۆ قادسیە گوت، کە ئاوا دەستی پێ دەکرد: (ئەوە بۆ چوار ساڵ دەچێ،

عێراقمان جەنگ دەگێڕێ، بە من ناڵێی ئەی دوژمن، ئێمە چۆن پێت ناوێرین؟ کورد و عارەب ڕاپەڕین، ڕاپەڕین دەڵێی شێرین). هەمووی دوو سێ مانگ پێشان درا، چونکە شەڕ لە چوار ساڵ تێپەڕی و گەیشتە هەشت. گۆرانییەکە خۆی هەر ئاستی زۆر لاواز بوو و ئەم خاڵەیش هێندەی تر لاوازی کردبوو. بۆ نموونە ئەوەیشی دەگوت: (لە کتاب و جەریدە، ناومان وا لە خاریجە). وڵات هەیە لەم گەردوونەدا ناوی لە خاریج نەبێت؟ گوتەکانی ڕەخنەگری میللی ڕێک وان. ئەگەر سبەی نووسەرێکی لاو، یان قوتابییەک بیەوێت دیزەرتەیشنێک لەبارەی هەر چەمکێکەوە بنووسێت، دەتوانێت سوود لە باسەکانی ئەو ڕەخنەگرە میللییانە ببینێت، کە بە زمانی ڕۆژانە وەسفیان کردوون؟ دەتوانێت کار بەو گوتانە بکات، کە ڕەخنەگرەکان بە دەمیاندا هاتوون و خۆیان نازانن مانایان چییە؟

نووسەرێک بنووسێت: (سادەیی و زمان دوو چەمکن، کە لەنێو ئەزموونی شیعری فڵان شاعیردا بە ڕوونی بەریان دەکەوین)، نابێت بە نووسینەکانیدا بچێتەوە، تاکوو بزانێت چیی گوتووە؟ واز لە چەمکی (سادەیی) بهێنە، کە هەر بوونی لەوێ نیشانەی بێئاگاییە، بەڵام لە چ شوێنێکدا بەر زمان ناکەوین؟ ئایا لە نووسینەکانی منی موفلیسیشدا بەر چەمکی زمان ناکەویت؟ ئەگەر وایە، ئەمە چ شتێکی گرنگە؟ گۆرانیبێژێکی تری میللی

ئەم گۆرانییەی بۆ قادسیە دەگوت: (بە ڕێ کەتییە، بە ڕێ کەتییە، بەرەو پێنجوێن بە ڕێ کەتییە. سوپای عێراق لە پێنجوێنە). بێگومان سوپای عێراق بە ڕێ کەوتووە، دەنا چۆن گەیشتووەتە ئەوێ؟ ئەمە چ داهێنانێکە؟ بەڵێ، خۆشیمان بێت و ترشیمان بێت بەر چەمکی زمان دەکەوین، چونکە هیچ شوێنێک نییە خاڵی لە زمان. ئەمانە لە کوێدا نووسراون؟ لە گوتارێکدا، کە ئەمە ناونیشانیەتی: **(کۆکردنەوەی دژەکان)**. باشە، من ئەگەر وەک خوێنەرێک دوای ئەوەی ئەم گوتارەتم خوێندەوە و ئەم شتە سەیرانەم تێدا بینی، بۆم نییە لەبارەیانەوە پرسیارت لێ بکەم؟ تۆ مادام وەک نووسەر خۆتت ناساندووە، هەر خوێنەرێک بۆی هەیە لەبارەی نووسینەکانتەوە لێت بپرسێت، کە ئەمە ئەلفوبێیە و هەموومان دەیزانین. ئەوە سیوپێنج ساڵە، نەخێر سیوشەشە، یەک نەخۆش نەهاتووەتە کلینیکەکەم گلەیی بکات، کە ئەو دەرمانەی بۆیم نووسیوە، خراپە و پێی چاک نەبووەتەوە. دەزانی بۆچی؟ چونکە نە دۆکتۆرم، نە کلینیکم هەیە و نە خۆیشمم وەک دۆکتۆر ناساندووە، بەڵام خوێنەر لەبارەی بەرهەمەکانمەوە پرسیاریان لێ کردووم، کە یەکێکیان تۆی ئازیزیت. من هاتووم لەبارەی ئەو چەمکەوە، کە تۆ فڕێت داوە و بەم زمانەی خەڵک وەسفیت کردووە، هەم لێم پرسیویت و هەم دوو گوتارم بۆ نووسیویت. ئایا ئەمە لە پڕۆژەی خوێندنەوە و نووسینی

کردیت؟ تواناکەتی کپ کردەوە؟ ئەمەی خوارەوە بەشێکی ئەو دوو نامەیەیە، کە لەو بارەیەوە بۆت نووسراون:

{ برای ئازیزم، کاک ئارام سدیق!

دوای سەڵاو و ڕێز!

ئەم ئێوارەیە گوتارێکی دیکەتم لە ژێر ناونیشانی (**کۆکردنەوەی دژەکان**)دا خوێندەوە، کە خوێندنەوەی شیعری (**کەس وەک تۆ بە دوامدا نەگەڕا...کەس وەک تۆ ونی نەکردم!**)ی (....)یە. من کاتێ هەر بەرهەمێکی نوێت دەخوێنمەوە، دەمەوێت بزانم چ گۆڕانێک بەسەر ئاستی مێتۆد و زماننتدا هاتووە، بۆیە لەم گوتارەیشتدا هەر بە دوای ئەو گۆڕانەدا گەڕام، کە بە داخەوە نەمبینی. هێندەی من وەک خوێنەرێکی بەردەوامی تۆ سەرنجم دابێت ئارەزووی گۆڕانت نییە. هەموو بەرهەمەکانت لە یەکتر دەچن، کە ئەمە خەسڵەتی ڕەخنەی میللییە. ئەگەر پێشتر چەند نامەیەکی لەم شێوەیەم بۆ نەناردبایت و بە وردی سەرنجی خۆمم لەبارەی بەرهەمەکانتەوە نەنووسیبووایە، ئەوا ڕێم بە خۆم نەدەدا ئەم چەند وشەیەت بۆ بنووسم، لە کاتێکدا من بەوە ناسراوم نووسەرە لاوەکان هان دەدەم و کۆمەکیان دەکەم. ئاستی ئەم بەرهەمەت ئەگەر لەوانەی پێشووت نزمتر نەبێت، ئەوا بە ڕوونی پێت دەڵێم لە ئاستی ئەواندایە. هەمان مێتۆد و هەمان زمانە، کە بێگومان ئەو دووانە پێوەندیی ئۆرگانییان پێکەوە هەیە، بەوەی مێتۆد جۆرێکی دیکەی بیرکردنەوەیە و بیرکردنەوەیش وەک زۆربەی ڕێبازە فەلسەفییەکان لەسەر کۆکن هاوکات و هاوواتای زمانە. (پێشتر لەو بارەیەوە دواوم ئەگەر حەزیشت کرد زیاترت بۆ بنووسم، ئاگادارم بکەرەوە). وەک پێی ڕاهاتوویت چەند گوتەیەک لێرە و لەوێ کۆ دەکەیتەوە و بە زۆر دەیانئاخنیتە ناو باسەکەتەوە، بێ ئەوەی لە

کۆنتێکستی ئەو گوتانە تێگەیشتبێتی. ناونیشانی گوتارەکەت (کۆکردنەوەی دژەکان)ـە، کە چەمکی دژەکان یەکێکە لە پرۆبلەماتیکەکانی فەلسەفە و لانی کەم لە فیلۆسۆفی ئەگریکی (هیراکلیتس)ـەوە دەست پێ دەکات، بەوەی پێی وایە گەردوون لەسەر ناکۆکیی دژەکان (Conflict of Opposites) وەستاوە، کە بە یەککگرتن و هاوئاهەنگیی ئەوانە کۆتاییی دێت. ئەو گەردوونەیش خولی سروشتیی خۆی هەیە و دوو هێز هەڵیدەسووڕێنن، خۆشەویستی و خەبات، کە هەموو شتەکان لە ئەنجامی ئەو دژایەتییەوە دێنە کایەوە، بۆ ئەوەی دوایی یەک بگرن. هەموو شتێک لەو گەردوونە لە بەردەوامییەکی هەڵقوڵاودایە و هیچ شتێک ناوەستێت، بۆیە تۆ ناتوانیت دوو جار قاچ وەک خۆی بخەیتە هەمان ڕووبارەوە. شەڕ دایکی هەموو شتەکانە، کە کۆیلە و سەرداری لێ دەکەوێتەوە. وەک دەبینین دواتر ئەو کۆنسێپتە لای (هیگڵ) سەر هەڵدەداتەوە. بەم شێوەیە چاکە و خراپە، ژیان و مەرگ، خەو و ئاگایی، لاوی و پیری، ئەو دژانەن، کە یەک دەگرن، مادام سەرچاوەی هەموویان ئاگرە. دەبێت لێرەدا ئاماژە بەوە بدەین، کە گەردوون لای ئەو فیلۆسۆفەدا واتە ئاگر و ئەو ئاگرەیش بەردەوامە و هەموو شتێک لە شێوەی دووانە دروست دەکات. بە هەرحاڵ چەمکی (یەککگرتنی دژەکان) ئەو چەمکەیە، کە (هیراکلیتس) دایدەهێنێت و ئێمە مەبەستمان نییە بچینە قووڵاییەوە، بەڵکوو دەمانەوێت سەرەداوی ئەو کۆنسێپتە دەستنیشان بکەین و بە دوایدا بڕۆین. ئەو کۆنسێپتە بە دینەکانیشدا تێدەپەڕێت. وەک (ویڵ دۆرانت) لە کتێبی (مێژووی شارستانەتی)دا دەڵێت ئەو ئاگرەی (هیراکلیتس) دایهێناوە بۆ لای (ستۆیزسیم) گوێزراوەتەوە و لەوێیشەوە گەیشتووەتە ئایینی مەسیحی. لە کەلتووری ئیسلامییشدا بەردەوام جێگای مشتومڕ بووە. دەتوانم دەیان نموونە بهێنمەوە. (مارسێل کۆنش) لە گوتارێکیدا بەراورد لەنێوان (هیراکلیتس) و

(بوودا)دا دەكات و پێی وایە هەمان كۆنسێپت، بەڵام بە شێوەیەكی دیكە لای (بوودا)یشدا دەبینێت، كە ئەویش دەڵێت (هەموو شت لە هەڵقوڵانە. هیچ نامێنێتەوە، هیچ شتێک وەک ساتی پێش خۆی نامێنێتەوە. ئێمە لە یەک ساتدا دەژین و دەمرین). لای (بلەیز پاسكال) ئەو كۆنسێپتە دەچێتە ئاستێكی ترەوە و پێی وایە مرۆڤ بۆیە مەزنە، چونكە ئەو دژایەتییانەی تێدایە و دەیەوێت ئەو دژانە پێكەوە كۆ بكاتەوە. ئەو مرۆڤە بە دوای بەختەوەریدا دەگەڕێت، بێ ئەوەی پێی بگات، بۆیە مرۆڤ ماندووە. بەم شێوەیە مرۆڤ لە بوونەوە بۆ عەدەم لە هاتوچۆدایە. واتە لەنێوان دژەكاندا دێت و دەچێت. مەبەستمان نییە زۆر لای (پاسكال)یش بمێنینەوە، بەڵكوو دەمانەوێت بزانین ئەو كۆنسێپتە چۆن بەردەوامیی هەیە. با لای (دیكارت) سەرنجی لێ بدەین، كە عەقڵ دەكاتە پێوەر بۆ بوونی هەموو شتێک و بۆ دژەكەیشی، هاوكات بۆ تێگەیشتن لە هەموو شتێک، كە مەرج نییە عەقڵ و لۆژیک هەر بگەنە حەقیقەت. لای (سۆرێن كیەكەرگۆرد)ی دانماركیدا، كە بە ڕەخنەگری (دیكارت) ناسراوە، مێتۆدێكی دیكەی جیاواز دەبینین، بەوەی بۆ چەسپاندنی حەقیقەت پێ لەسەر ئیلهام دادەگرێت. (كاک ئارامی بەڕێز ، پێشتریش لەبارەی ئیلهامەوە گفتوگۆمان كردووە، كە تۆ ئەو چەمكەشت هەر تا ئاستی زمانی ڕۆژانە دابەزاندووە). بە كورتی لای (كیەكەرگۆرد) بوون بریتییە لە ناكۆكیی نێوان دژەكان. هەر لێرەوە (كیەكەرگۆرد) ڕووبەڕووی (هیگڵ)یش دەبێتەوە و ئایدیالیزمی ئەو بە تەواوی ڕەت دەكاتەوە، ئەگەرچی پێ لەسەر كۆنسێپتی دژەكان دادەگرێت. جیاوازییەكەی خۆی لەوەدا دەردەخات، كە باوەڕی بە یەككگرتنی دژەكان نییە. (هیگڵ) پێی وایە خودەكان هەر دەبێت لە خۆیان بێنە دەرەوە و لەگەڵ یەكتردا بكەونە دژایەتییەوە، بەو مەبەستەی وەک بوونێكی هۆشیار و سەربەست، جیاواز لە هیی شتەكان، ددانیان پێدا بنرێت. لە ئەنجامی ئەو بەریەككەوتنەدا، دەبێت یەكێک لەو دووانە دەستبەرداری ئازادیی خۆی

ببێت و مل بۆ ئەوەی دیکەیان کەچ بکات، کە ئەو ملکەچییە ڕێگایە بۆ مانەوەی لە ژیاندا. (لەو گفتوگۆیەی '.... ' لەگەڵیدا کردووم، ئەمەم بە درێژی باس کردووە، کاک ئارامی ئازین). ئەمجارە (مارکس)مان هەیە، ڕووبەڕووی (هیگڵ) دەبێتەوە، بەوەی ئەو کۆنسێپتەی (هیگڵ) کە دەڵێت ئایدیا واقیع دەخوڵقێنێت، ئەو دەڵێت بە پێچەوانەوە ئایدیاکان ڕەنگدانەوەی واقیعن، کە ئەمە ڕەخنە نییە تەنیا لە (هیگڵ)، بەڵکوو لە تێکڕای فەلسەفەی ئایدیالیزم وەک لە کتێبی (ئایدیۆلۆجیای ئەڵمانی)دا جەختی لەسەر دەکاتەوە. سەرجەم فەلسەفەی ئایدیالیزمیش لەسەر دووانەی مادە و ڕۆح وەستاوە، کە دەمەوێت بڵێم سەرنج بدە ئەو چەمکەی تۆ وا دەزانیت هیی زمانی ڕۆژانەیە، چ قورساییەکی هەیە (بڕوانە ئەو گفتوگۆیەی دەنگەکان لەبارەی مارکسەوە لەگەڵی کردووم). (نیتشە)، کە بە (هیراکلیتس) سەرسامە و بە گەورەترین فیلۆسۆفی تراجیدیی دەزانێت، بەردەوام ڕووبەڕووی ئەو کۆنسێپتە بووەتەوە، بە تایبەتی لە هەردوو کتێبی (فەلسەفە لە سەردەمی تراجیدیای ئەگریکی) و (لە پشت چاکە و خراپەدا)دا پێیان لە سەر دادەگرێت. (جیل دۆلۆز) پێی وایە لۆجیکی هەر مانایەک لە پێوەندیی نێوان ئامادە و نائامادەدا دەردەکەوێت. خۆ (دێریدا) بەشێکی تەمەنی خۆی بۆ تەرخان دەکات. لەو دایەلۆگەی لەژێر ناوی (هەولێر و هەولێری لە کۆنکرێتبەندییەوە بۆ هەڵوەشاندنەوە)دا لەگەڵ هاوڕێی ئازیزم (.....)دا کردوومە بە وردی لێوەی دواوم، کە ئەو فیلۆسۆفە پێی وایە ئێمە هەمیشە لە ئاستی تێکستەکاندا ڕووبەڕووی دوالیزمە دژەکان (Binary Oppositions) دەبینەوە وەک ڕۆح/ جەستە، عەقڵ/ ناعەقڵ، قسە/ نووسین، گەرم/ سارد، ڕەش/ سپی، ژیان/ مردن، چاک/ خراپ، جوان/ ناشیرین و زۆری تر، کە مێتافیزیکا لەو ڕێگایەوە مانای پێشوەختی خۆی دەسەپێنێت، مانایەک، وا خۆی دەردەخات قەوارەیەکی یەکگرتوو (Coherent) و هاوڕێک

(Homogeneous)ی هەیە و بووەتە سێنترالّی عەقڵ، دواجار لە شێوەی حەقیقەتێکی نەگۆڕدا دەردەکەوێت. (دەکرێت گفتوگۆکە لە دەنگەکان بخوێنیتەوە). بە هەرحاڵ ئامانجی ئێمە ئەوە نییە بە وردی باس لە دژەکان و کۆکردنەوەی دژەکان بکەین، بەڵکوو دەمانەوێت بپرسین لە کاتێکدا ئەو چەمکە هێندە ئاڵۆز و کاریگەرە، تۆ چۆن بە زمانی ڕۆژانە باست لێوە کردووە؟ ئەمە خەسڵەتی ڕەخنەی میللییە، کە هەموو شتێک تا ئەو ئاستە سادە دەکاتەوە، کە سەری لێیان دەربچێت، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بڵێت چی خراپە و چی باش. بەڵێ، بۆ ئەوەی ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەکانی خۆی بخاتە ڕوو، وەک لێرەیشدا کردووتە. دێیت ئامۆژگاریی (.....) دەکەیت چۆن بنووسێت. ئەو شتانەی تۆ لەبارەی کۆکردنەوەی دژەکانەوە گوتووتن، کەس هەیە نەیانزانێت؟ تۆ چیی نوێت بە منی خوێنەر گوتووە؟}.

ئێستایش بە درەنگی نازانم ئەگەر تۆی ڕەخنەگر بتەوێت لەم بارەیەوە شتێکی نوێ بە منی خوێنەر بڵێیت. وا ڕاهاتوویت دوای ئەوەی گوتارەکانت لێرە و لەوێ بڵاو دەکرێنەوە، ئینجا کۆیان دەکەیتەوە و لە شێوەی کتێب دەیانخەیتەوە بەر چاوی خوێنەر. ئایا ئەمەت جارێکی تر لە کتێبدا بڵاو کردەوە؟ ئەگەر بڵاوت کردەوە، دەستکاریت کرد، یان وەک خۆیت دانایەوە؟ ئەگەر دەستکاریت کرد، ئاماژەت بەوە دا، چیی وای لێ کردیت ئەو دەستکارییەی بکەیت؟ ئەگەر وەک خۆیت دانایەوە، ئایا دوای ئەو سەرنجانەی من، هێشتا پێت وایە داهێنانە و پێویستە خوێنەر لە خوێندنەوەی بێبەش نەبێت؟ ئەوە چ خوێنەرێکە و لە چ ئاستێکدایە، کە ئەم وشانە دەخوێنێتەوە و لە

ڕەخنەگرەکەیشی ناپرسێت: من بە چی تێگەیشتوویت؟ ئەم شتانەم بۆ دەنووسیت؟ ئایا لە سەرتاپێی ئەم گوتارەتدا ڕستەیەک هەیە دوور و نزیک پێوەندیی بە ناونیشانی بابەتەکەوە هەبێت؟ ڕستەیەک هەیە توانای دروستکردنی دایەلۆگی لەگەڵ خوێنەرێکی بیرکەرەوەدا هەبێت؟ ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێک گوتاری هاوشێوەیدا چاپت کرد، بۆ کام دەستگەیەی چاپت نارد؟ ئایا ئەو دەستگەیە چۆن ئەوەی بەسەردا تێپەڕی و وەک فیکری ڕەخنەیی بە خوێنەری فرۆشت؟

# ڕەخنەگری میللی و پلەیجیریزم

ڕەخنەگری میللی بۆیە هێندە لە پرسیار دەترسێت، چونکە خۆی چاک دەناسێت و دەزانێت ئەو شتانەی بە ناوی فیکر و ڕەخنەوە دەیانڵێت، لە چەند وشەیەکی سادەی سواو زیاتر نین. ئەوەی ڕەخنەگری میللی دەیکات، پێی دەگوترێت پلەیجیریزم(Plagairism) ، واتە دزیی ئەدەبی. بەکورتی وەرگرتنی بیرۆکە، ڕستە، پەرەگراف و زۆری دیکەیە لە نووسەرانی تر، کە جاری وا هەیە وەک خۆی دەیان نووسێتەوە و جاری وا هەیە کەمێک ماکیاجیان دەکات.

تۆ خۆت لە هەندێک نووسینتدا پەنات بۆ کاری وا بردووە.

لە گوتاری یەکەمتدا نووسیوتە:

(من بڕوای تەواوم بەو تیۆرەی هایدگەر هەیە، کە مرۆڤ دەبێت بە نیگەرانییەوە بەردەوامی بە بوون و داهێنانەکانی خۆی بدات. مرۆڤ ئەگەر نائومێدی بیوەستێنێت ڕەنگە دواجار خۆکوشتن هەڵبژێریت).

مەبەستی سەرەکیم لە وەرگرتنی ئەم پەرەگرافە کورتەدا، تەنیا وەستانە لەسەر چەمکی (نیگەرانی)دا، کە دواتر پیشانت دەدەم لە کوێت هێناوە، بەڵام پێویستە سەرەتا ئەوە بڵێم چۆن تێکەڵی گوتەی میللیت کردووە. لە کوێ (هایدیگەر) ئەمەی گوتووە؟ ناوت ناوە (تیۆر)، کە ڕاستییەکەی وشەکە (تیۆری: theory)یە، بەڵام ئایا ئەمە تیۆریی ئەو فیلۆسۆفەیە؟ (مارتین هایدیگەر) ئەمەی گوتووە؟

**(من بڕوای تەواوم بەو تیۆرەی هایدگەر هەیە).**

بڕوای تەواوت بە چی هەیە؟ کام تیۆرە؟ بێگومان ئەگەر ئەمەی بگوتبایە، ئەو کاریگەرییە گەورەیەی لەسەر فیکری ڕەخنەیی جیهانیدا بە جێ نەدەهێشت. ئەمەم لە ئامادەیی لە وانەی داڕشتندا بۆ مامۆستای کوردی بنووسیایە، لە دە پێنجی نەدەدامێ. نووسەرێک لە هاوینی (٢٠١٧)دا نەک هەر گوتەیەکی وا بنووسێت، بەڵکوو بیداتە پاڵ یەکێ لە فیلۆسۆفە گەورەکانی دنیایش، دەبێت لە خۆم بپرسم ئەوە واقیعی کەلتووریی کوردی چیی بەسەر هاتووە؟ ئەگەر من نا، بەڵکوو خوێنەرێکی تر لێت بپرسێت سەرچاوەکەی لە کوێیە، بۆی دەهێنیت؟ پەلاو (تەحەددا)ت دەکەم، ئەگەر بتوانیت. بێگومان ئەو سەرچاوەیە بە کەسمان نایەت، چونکە (هایدیگەر) و ئەوە زۆر لە یەکتر دوورن. کاتێ دەڵێم سەرچاوەکەی بە کەسمان نایەت، مەبەستم ئەوەیە لە فەلسەفەدا شتی وا نادۆزینەوە، دەنا ڕۆژانە

له گه‌ڕه‌ک، له ده‌می خه‌ڵکه‌وه ده‌یبیستین. ئایا (نیگه‌رانی) لای (هایدیگه‌ر)دا تیۆره، یان با بڵێین تیۆرییه؟ ئه‌رێ به گشتی ده‌کرێت ناو له فه‌لسه‌فه‌ی ئه‌و فیلۆسۆفه بنێین تیۆری؟ له لاپه‌ڕه‌کانی سه‌ره‌تادا ئه‌وه‌مان گوت، که چۆن (گادامێر) له کتێبی (ڕێگه‌کانی هایدیگه‌ر)دا ئه‌وه ڕوون ده‌کاته‌وه، بۆچی ئه‌و فیلۆسۆفه دواجار، کاتێ ویستوویه‌تی پێشه‌کییه‌ک بۆ کۆبه‌رهه‌می خۆی بنووسێت، وای به پێویست زانیوه ناوی (ڕێگه‌کان) هه‌ڵبژێرێت، نه‌وه‌ک (کاره‌کان). ئایا (هایدیگه‌ر)ێک نه‌یه‌وێت ناو له به‌رهه‌مه‌کانی بنێت، (کاره‌کان)، به‌ڵکوو سوور بێت له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی (ڕێگه‌کان) بکاته درووشم، ڕێگه ده‌دات چه‌مکی (نیگه‌رانی) به تیۆری بزانرێت؟ ئه‌مانه هه‌ر پرسیارن و هاوکات ئاڕاسته‌ی خۆیشمن، که هیوادارم تۆ له لای خۆته‌وه به‌دواداچوونیان بۆ بکه‌یت. پێویسته وه‌ڵامی تۆ به یه‌قینی (به‌ڵێ) بێت، ده‌نا چۆن باوه‌ڕی ته‌واوت پێیه‌تی؟

سه‌رنج بده کاتێ له‌سه‌ر وشه ده‌وه‌ستین، چۆن سڵ له‌وه ده‌که‌ینه‌وه بڕیار بده‌ین، به‌ڵکوو ده‌بێت به وریاییه‌وه بنووسین، بۆیه نووسه‌ره داهێنه‌ره‌کان به گشتی به‌رهه‌میان زۆر نییه، له کاتێکدا ڕه‌خنه‌گری میللیی ئێمه وه‌ک به‌رده‌وام پێی له‌سه‌ر داگیرا له‌به‌ر ئه‌وه هێنده ده‌نووسێت، چونکه زمان لای ئه‌ودا زۆر بێبه‌هایه. تۆ له‌م دوو دوو گوتاره‌تدا له‌سه‌ر وشه نه‌وه‌ستاویت و بایه‌خت به زمان نه‌داوه. من به‌پێی ئه‌و

تێگەیشتنە سەرەتاییەی لە خوێندنەوەی هەندێک کاری ئەو فیلۆسۆفەوە بە دەستم هێناوە، پێم وایە ناکرێت (نیگەرانی) بە تیۆری بزانرێت، بەڵام دڵنیا نیم و پێویستە لێی بکۆڵمەوە، بۆیە لەم بارەیەوە، واتە لەبارەی ئەوەی ئاخۆ تیۆرییە، یان نا، یەک وشە نانووسم. هێندەم لا ڕوونە ئەو گوتەیەی گوایە تیۆریی ئەوە، زۆر لێی دوورە. تۆ چۆن بەو باوەڕە تەواوە گەیشتوویت؟ چۆن هەر لەبەر ئەوەی بەو باوەڕە تەواوەیش گەیشتوویت، ڕێگە بە خۆت دەدەیت بە نووسەرێک بڵێیت موفلیسە و هیچی پێ نەماوە؟ لە بیرت نەچێت من ڕازیم بەوەی موفلیسم! لانی کەم ئیفلاسی ڕێم لێ دەگرێت ئەمە بنووسم، کە تۆ نووسیوتە. بزانە هەر بۆ خۆشی چ قەرەباڵغییەکی سەیرت دروست کردووە! تیۆرییە، یان تیۆری نییە؟ ئەگەر وەڵامی ئەمەت دایەوە، کە من خۆم وەک گوتم ناتوانم وەڵامی بدەمەوە، ئینجا دەگەیتە ئەوەی پێمان بڵێیت تیۆرییەکە چییە، کە باوەڕی تەواوت پێیەتی؟ بینیمان تیۆرییەکە هەر بوونی نییە و بۆی هەڵبەستراوە. لە خوارەوەیش زیاتری لەسەر دەوەستین:

یەکێ نەزانێت، دەڵێ (هایدیگەر) قەشە بووە و بە خەڵکی گوتووە ئەی بڕوادارانی ئازیز، نەکەن خۆتان بکوژن!

بۆ تۆ خۆکوشتن بە چی تێگەیشتوویت؟ مەگەر زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگەیش هەر ئەو بۆچوونەیان لەبارەی

خۆکوشتنەوە نییە؟ تۆی ڕەخنەگر لەم گوتارەتدا چیت بۆی زیاد کردووە و داهێنانەکەت کامەیە؟ ئەوە چ (هایدیگەر)ێکی ڕووکەشە و ماڵی لە کوێیە، وا لەگەڵ نیگەرانیدایە، بەڵام دژی خۆکوشتنە؟ (نیگەران بن، چونکە بەو نیگەرانییە بەردەوامی بە بوون و داهێنانی خۆتان ددەن، بەڵام نائومێد مەبن، چونکە دوور نییە دواجار خۆکوشتن هەڵبژێرن!)

ئەوە کێیە دەتوانێت لە یەک کاتدا نیگەران بێت، بەڵام هەست بە نائومێدی نەکات؟ ڕۆبۆتە، یان مرۆڤە؟ دەکرێت پێمان بڵێیت ئەو دۆخە چۆنە؟ ئەرێ تۆ خۆت ئەم حاڵەتەت هەیە؟ واتە نیگەرانیت، بەڵام هاوکات نائومێدیش نییت؟ چۆن؟ بە نیگەرانی بەردەوامی بە بوون و داهێنانەکانت دەدەیت، بەڵام نائومێدییش ناتوەستێنێت و خۆکوشتن هەڵنابژێریت؟ ئەم یارییە چییە بە وشەت کردووە؟ پێت وایە کەسێک هەیە، نەتوانێت ئەمە بکات؟ ئایا هەر بۆ ئەوەی بیسەلمێنیت من موفلیسم، هاتوویت ئەو هەموو زەحمەتەت کێشاوە؟ ئەرێ (هایدیگەر)ێکی وایش هەیە و لێی بێئاگاین؟ ئەگەر دانیشتووی یەکێ لەو گەڕەکانەی خۆمان بێت، چووختییەکان بەردەوام دەوری دەدەن و کاتی خۆش بە دەم گوێگرتن لە گوتەکانیەوە بە سەر دەبەن. دیسان دەیڵێمەوە ئەو چیرۆکە ساکارە چییە هەڵبەستراوە و دراوەتە پاڵ ئەو فیلۆسۆفەوە؟

ئایا هیچ پرسیارێکی بوونگەرایی (question existential) هەیە، خۆی لە مردن و خۆکوشتن نەدات، بگرە تێیان نەپەڕێنێت؟ ئەگەر خوێنەرێکی وریا یەکەمجار ناوی (هایدیگەر) ببیستێت، بە مەرجێ پێی بڵێن فیلۆسۆفێکی بوونگەرایە، ئەوا مەحاڵە ئەو قسەیە بکات، کە تۆ کردووتە، چونکە خێرا دەزانێت ئەو دووانە زۆر لە یەک دوورن. (جاک چۆرۆن)ی نووسەری بواری فەلسەفە لە کتێبی (مەرگ لە فیکری خۆرئاواییدا)دا بەشێکی زۆری بۆ ئەوە تەرخان کردووە، کە ئەو فیلۆسۆفە چۆن لە چەمکی مردن دەڕوانێت. لە شوێنێکدا دەنووسێت: {نیگەرانی لای (هایدیگەر)دا پێوەستە بە بوون لە دنیادا، بەو مانایەی بوونێکە بەرەو مەرگ. لە قووڵاییی بوونی مرۆڤایەتی (Dasein)ماندا هەڵدەقوڵێت، نەخێر، هەر خودی بوونی مرۆڤایەتیمانە. دواجار نیگەرانی شتێکی سایکۆلۆجی نییە}.([١٩٥])

ئەو کتێبە، کە لە ساڵی (١٩٦٣)دا بە ئینگلیزی و لە ساڵی (١٩٨٤)دا بە عەرەبی چاپ کراوە، یەکێکە لەو سەرچاوانەی خوێنەرە یاخییەکانی پێش ڕاپەڕین بە گرنگیان زانیوە، کە لەوانەی دەوروبەری خۆمدا نەمزانیوە کەسێکیان ئەمانەی گوتبن وا لەم گوتارەتدا نووسراون. زۆر بە قووڵی بیرۆکەی

---

[١٩٥] جاك شورون، الموت في الفيكر الغربي، ترجمة: كامل يوسف حسين، مراجعة: د. إمام عبدالفتاح إمام، عالم المعرفة، سلسلة كتب ثقافية شهرية يصدرها المجلس الوطني للثقافة والفنون والاداب- الكويت، ع٧٦، ١٩٨٤، ص٢٦٥

مەرگ ڕاڤە دەکات، کە لە فیلۆسۆفانی پێش (سۆکرات)ەوە تاکوو فیلۆسۆفانی وەک (سۆرێن کیەرکەگۆرد)، (شۆپێنهاوێر)، (نیتشە) و دواتریش دەگرێتەوە. هیوادارم چاوێکی پێدا بخشێنیت و لەگەڵ ئەو گوتەیەی خۆتدا بەراوردێکی بکەیت، تاکوو بزانیت چیت گوتووە. هەر وەک ئاماژەیەک هەمان نووسەر کتێبێکی تریشی بە ناوی (خۆکوشتن)ەوە نووسیوە. ئامادەم چ لەو کتێبانەی لەم نووسینەدا ناویان هاتووە و چ لە زۆر سەرچاوەی تردا پێشانت بدەم، کە خۆکوشتن لەسەر ئاستی سیمبۆڵدا لای (هایدیگەر) مانایەکی زۆر گەورەی هەیە. لەم خاڵە جەوهەرییەدا سەرجەم فیلۆسۆفانی وەک (شۆپێنهاوێر)، (نیتشە)، (فۆکۆ)، (بارت)، (دێریدا) و زۆری تر هاوبەشن. (هایدیگەر) لەگەڵ ئەوەیشدا بە (جۆرج زیمێل) سەرسامە، کە ڕاشکاوانە چەمکی مەرگی شی کردووەتەوە، کەچی لەوەدا سەرزەنشتی دەکات، مادام تەنیا وەک کێشەیەکی بایۆلۆجی، نەوەک بوونگەرایی، لێی دەڕوانێت.[١٩٦]

واتە مەرگ کێشەیەکی بوونگەراییە، بۆیە شتێک نییە لە دەرەوەی خۆمان، تاکوو لە کاتێکی دیاریکراودا پێی بگەین، یان بە مانایەکی تر وەک ئەوەی تۆ بە زمانی میللی وات دەرخستووە دەبێت ئاگامان لێی بێت هەڵینەبژێرن، بەڵکوو هەر

---

[١٩٦] هەمان سەرچاوە، ل٢٥٣

خۆی بەشێکی دانەبڕاوی نیگەرانییە. ڕێگە بە خۆم دەدەم بڵێم ئەو ئێمەی هەڵبژاردووە.

وەک بینیمان (هایدیگەر) پێی وایە نیگەرانی دۆخێکی سایکۆلۆجی نییە، تێپەڕ بێت، یاخود لە ماوەیەکی دیاریکراو بۆی هاتبێت و تا ماوەیەکی دیاریکراو لای بمێنێتەوە، بەڵکوو هەر خودی بوونمانە وەک ئەوەی مرۆڤین، تەنانەت بەوە ڕازی نییە مردن بە شتێکی بایۆلۆجی بزانرێت، مادام پێوەستە بە بوونمانەوە بە هەموو مانایەک.

من پرسیارێکی زۆر سادەت لێ دەکەم: نیگەرانی بۆ هەیە؟ ئایا لەبەر ئەوە نییە، کە مرۆڤ لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕووە؟ لە بیرتە (هایدیگەر) گوتی: (نیگەرانی پێوەستە بە بوون لە دنیادا، بەو مانایەی بوونێکە بەرەو مەرگ)؟ بەرەو چی؟ بەرەو مەرگ. کەواتە خۆکوشتن و نیگەرانی لە یەک جیاواز نین. لە بیریشتە لە لاپەڕەکانی پێشەوە هەر لای (هایدیگەر)دا بینیمان: (دۆخە ویژدانییەکانی فینۆمینۆلۆجیا هەر لە سەرەتای گەردوون و کاتدا دروست دەبن، کە نیگەرانی ناوەرۆکی ئەو پێوەندییەیە، بەوەی مرۆڤ هەست بە نیگەرانی دەکات، کاتێ دەزانێت هەر دەبێت لە ئەنجامدا ڕووبەڕووی مەرگ ببێتەوە، کە ئەو نیگەرانییە هەر خۆی خودی نیهلە).

ئەم گوتە ساکارەت (ڕەنگە دواجار خۆکوشتن هەڵبژێریت) لە ئاستی ئەمانەدا خۆی دەگرێت؟ ئەو (دواجار)ـە چییە بۆت داناوە؟ تۆ حەزت لەوەیە یاری بە وشە بکەیت، چ پێوەندیی بەو فیلۆسۆفەوە هەیە، کە بەشێکی زۆری ژیانی بۆ ئەوە تەرخان کردووە لە دژی زمانی ڕۆژانەدا بجەنگێت؟ بیستووتە، گوتوویانە: (ڕۆڵە شیرینەکانمان، زۆر ئاگاتان لە خۆتان بێت نائومێد مەبن و خۆتان مەکوژن!) بەڵام لە فەلسەفە بە گشتی و لای (هایدیگەر)دا بە تایبەتی شتەکە تەواو جیاوازە. دیارە من هیچ دژی ئەو بۆچوونەت نیم، بەو مانایەی تۆ ئازادیت چۆن بیر لەوە دەکەیتەوە، بەڵام من تەنیا ئەوە دەردەخەم، کە بۆچوونێکی وا لەو فیلۆسۆفە، بگرە لە هەر خوێنەرێک ئاگای لە ئەلفوبێی فیکریی ئەو فیلۆسۆفە هەبێت، زۆر دوورە.

ئێستا ئەم پرسیارانەت لێ دەکەم: ئایا بەپێی ڕوانینی (هایدیگەر) مردن ئەوەیە، کە یەکەمجار مرۆڤ لە کاتی نەمانیدا بۆی دێت، یان مردن هەر لە سەرەتاوە بەشێکە لە مرۆڤ؟ ئایا مردن ئەزموونێکە تەنیا لە ساتی سەرەمەرگدا ڕوو دەدات، یان هیی سەرتاپێی ژیانە؟ ئەمە بەشێکە لە ڕوانینی ئەو فیلۆسۆفە بۆ مەرگ، کە هەشت ساڵ لەمەوبەر نووسیومە و لێرەدا بۆتی دەڵێمەوە: (مردن ئەوە نییە یەکەمجار مرۆڤ لە کاتی نەمانیدا بۆی بێت، بەڵکوو مردن هەر لە سەرەتاوە بەشێکە لە مرۆڤ. ئەزموونێک نییە تەنیا لە ساتی سەرەمەرگدا ڕوو بدات، بەڵکوو

هیی سەرتاپێی ژیانە). ئەگەر وایە، خۆکوشتن لێرەدا چ بەهایەکی هەیە، تاکوو بیخەیتە ڕستەیەکی هێندە ساکارەوە و وامان پێشان بدەیت فەلسەفەی (هایدیگەر)ت خوێندووەتەوە؟

ئایا دەبێت هەر بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بە پەلاماردانی نووسەرێک بدەین، گوتەیەکی هێندە ساکار بۆ فیلۆسۆفێکی لە قەبارەی (هایدیگەر) دابتاشین؟ کاتێ نووسیت، هەرگیز بیرت لەوە نەکردەوە، کە دەشێ یەکێ لێت بپرسێت ئەمەت لە کوێ هێناوە؟ (هایدیگەر) کوا شتی وای گوتووە؟ تۆ لێرەدا دوو تۆمەتی زۆر سەیرت داونەتە پالْم: یەکەمیان نیگەرانیم نییە، تاکوو (بەردەوامی بە بوون و داهێنانەکانی) خۆم بدەم. دووەم، نائومێدی دەموەستێنێت و ڕەنگە دواجار خۆکوشتن هەڵبژێرم. باشە، تۆ جگە لەوەی ڕەخنە دەگریت، وەک ڕۆژنامەنووسیش خۆتت نەناساندووە؟ ژمارەی تەلەفۆن و ئەدرێسئیمەیلْمت لا نییە؟ بۆ نەهاتی ئەو دوو پرسیارەم لێ بکەیت، تاکوو ڕاستگۆیانە وەڵامت بدەمەوە؟ خۆ ئەودەم هیچ پێویستی بەوە نەدەکرد گوتارێکی وا بنووسیت و ناوی (هایدیگەر)ی تێدا بێنیت، بەڵکوو بۆ نموونە دەتنووسی: (ئەو ملشکاوە وەک خۆی دەڵێت لەبەر ئەو هۆکارانە وازی لە بڵاوکردنەوە هێناوە)، یان ڕەنگ بوو بتنووسیایە: (ڕەزاقورسێکی وا خۆ هەر نەیویست وەڵامی پرسیارەکانیشمان بداتەوە. برۆ، نەیەیتەوە، ناشیرین!).(LOL)

ئایا دەزانی ئەو قسەیەی تۆ ئەمڕۆ کردووتە، بە شێوەیەک لە شێوەکان هیی باوکم بوو؟ ئەویش لەوە دەترسا نائومێدی بموەستێنێت و خۆکوشتن هەڵببژێرم. زووزوو دەیگوت: (ئەگەر ڕۆژێک تەرمەکەتیان بۆ نەهێنامەوە، بزانە هیچم نەزانیوە!).

ئێی هێی! دوو سەردەمی جیاواز و یەک بۆچوون! لێرەدا یەک جیاوازیی بچووکیشتان هەیە: ئەو هەر چەند کتێبی پێ دەبینیم، وای پێ دەگوتم، بەڵام تۆ بڕوات وایە مادام وازم لە کتێب هێناوە، نائومێدی دەموەستێنێت و ڕەنگە خۆکوشتن هەڵببژێرم. (وازم لە کتێب نەهێناوە، بەڵکوو گوتوومە نووسین بڵاو ناکەمەوە). سوپاس بۆ خەمخۆریت، بەڵام بۆ من سوودی نییە، چونکە دەمێکە گوتوومە لەسەر شێوازی تایبەتی خۆم خۆم دەکوژم. بۆ نموونە ئەگەر لە کتێبی (ڕاگەردان)دا بۆی بگەڕێیت، دەیدۆزیتەوە.

لە (ئەفسانەی سیزیف)دا پێشانمان دا، کە خۆکوشتن لای (کامیۆ)دا خاوەنی چ قووڵاییەکە، لە کاتێکدا سەرجەم فیکری ئەو فیلۆسۆفەی لەسەر دامەزراوە. لێرەدا پێویست ناکات دووبارەی بکەمەوە، بەڵام دەکرێت هەر ئەم گوتەیە بخەینەوە بەر چاوی خۆمان: (تەنیا یەک کێشەی گرنگ هەیە لە فەلسەفەدا، کە ئەویش خۆکوشتنە). خۆ ئەگەر بتەوێت، ئامادەم یەک گوتاری سەربەخۆی بۆ تەرخان بکەم. پێشتریش هەر لە نامەدا بۆم نووسیویت. دەکرێت جارێکی تر بۆ ئەو نامەیە

بگەڕێیتەوە، کە لەبارەی (مەرگی نووسەر)ەوە بۆت نووسراوە. ئەگەرچی دەزانم بڕیاری تەواوت داوە نووسینی موفلیسان نەخوێنیتەوە و باوەڕی تەواویشت بەو تیۆرییەی خۆت هەیە، بەڵام ئەو داوایەت لێ دەکەم، کە چاوێکی پێدا بخشێنیت.

ئەوەی خوێنەری بەرهەمەکانی من بێت، دەزانێت چ ڕوانینێکم بۆ چەمکی خۆکوشتن هەیە، کە دەکرێت بڵێم هەر لە سەرەتاوە خاڵی هاوبەشی هەموویان بووە. ساڵی (١٩٩٥) لەناو شەمەندەفەردا هەواڵی خۆکوشتنی (دۆلۆز)ی فیلۆسۆفم خوێندەوە، کە یەکێکە لەوانەی (هایدیگەر)یان چاک ناسیوە. نەمزانیوە یەکێ پێی گوتبێت: (من بڕوای تەواوم بەو تیۆرەی هایدگەر هەیە، کە مرۆڤ دەبیت بە نیگەرانییەوە بەردەوامی بە بوون و داهێنانەکانی خۆی بدات. مرۆڤ ئەگەر نائومێدی بیوەستێنێت ڕەنگە دواجار خۆکوشتن هەڵبژێریت). تۆ زانیوتە یەکێ وای پێ گوتبێت؟ تا ئێستا ئەوەیشم بەر چاو نەکەوتووە نووسەرێک نووسیبێتی (دۆلۆز)ێک خۆی بکوژێت، بەرهەمەکانی شایانی خوێندنەوە نین، یان گوتبێتی داهێنەر نەبووە. حەز دەکەیت چەند کتێبی ئەو قەشە و مەلایانەت پێشان بدەم، کە باس لەوە دەکەن مرۆڤ چۆن بەسەر نیگەرانییەکانیدا زاڵ دەبێت و خۆی لە خۆکوشتن دوور دەگرێت؟ ئەو کتێبە بازرگانییانە چونکە بە زمانی جەماوەر نووسراون، ڕەواجی زۆریان هەیە.

گوتمان ڕەخنەگری میللی لەسەر شێوازی شامانەکان یاری بە وشە دەکات و دەیخاتە ناو ئەتمۆسفێرێکی سیحرییەوە. ئەوەتا تۆ نووسیوتە: (من بڕوای تەواوم بەو تیۆرەی هایدگەر هەیە). لێرەدا فۆکەس لەسەر بۆچوونی (هایدیگەر) نییە، بەڵکوو لەسەر ئەو باوەڕە تەواوەیە، کە بەو تیۆرییەت هەیە، لە کاتێکدا تیۆرییەکە هەر بوونی نییە، تاکوو نیوە، یان تەواو باوەڕت پێی بێت. وات پێشان داوە، کە دوای خوێندنەوەیەکی زۆر و چڕی ئەو تیۆرییە، ئینجا بەو باوەڕە تەواوە گەیشتوویت. کام تیۆرییە؟ ئەوەی هەڵبەستراوە؟

(باوەڕی تەواوم بەو شتە هەیە، کە نازانم چییە).

ئەمە چ داهێنانێکە؟ پێت وایە شتێکی نوێت گوتووە؟ نەخێر، ئەمە بۆچوونی بەشێکی زۆری خەڵکە. ئایا ئەو پیاوانەی لەسەر شەقامەکاندا تێزابیان بە لەشی ژناندا دەکرد، دەیانزانی ئەوەی باوەڕی تەواویان پێیەتی، چییە؟ مام کۆمۆنیستێک لە تورکیا بۆی دەرکەوت (لەنین) پیاوە و ژنی (مارکس) نییە، لە کاتێکدا بیست ساڵ زیاتر باوەڕی تەواوی بە کۆمۆنیزم هەبوو و لەپێناو سەرکەوتنیدا سنگی خۆی بەر گوللە دەدا. بە هۆی ئەو باوەڕە تەواوەیەوە تاڵی و سوێریی چەشتبوو و بە دەربەدەری دەژیا. ئەوانەی لەو هەرێمەی تۆدا بە باوەڕی تەواوەوە گیانی خۆیان فیدای ڕەنگێک دەکەن و بە باوەڕی تەواویشەوە لە دژی ڕەنگێکی تردا دەجەنگن، هەرگیز لەبارەی

ڕەنگەوە پرسیویانە؟ لەبارەی ئەو کەسانەوە پرسیویانە، کە خۆیان کردووەتە خاوەنی ئەو ڕەنگانە؟

ئەو باوەڕە تەواوەی چ لای تۆدا هەیە و چ لای بەشێکی زۆری ئەندامانی تری کۆمەڵگەیش وەک (ئەنتۆنی جیدینز: Anthony Giddens)ی کۆمەڵناس لە کتێبی (ژیان لە کۆمەڵگەی پۆستتراديشنەڵدا)دا پێی وایە لەو کەلەپوورەوە، یان لەو دابونەریتەوە ماوەتەوە، کە بە یادەوەرییەوە لکاوە. واتە ئەو باوەڕە هیی ئێستا نییە و ڕیشەی لە قووڵاییی مێژوودایە. لەم ڕووەوە ئاماژە بە (مۆریس هالبواچس: Maurice Halbwachs) دەدا، کە ئەو ناوی کۆیادەوەری ( collective memory)ی لێ ناوە. واتە ئەو مرۆڤە دەستی بەو حەقیقەتەوە گرتووە، کە لە نەوەکانی پێش خۆیەوە بەردەوام کەڵەکە بووە. (جیدینز) خۆی ئەمە بە ( formulaic notion of truth) ناو دەبات. واتە ڕوانینی تەقلیدییانە بۆ حەقیقەت. دەڵێت: {ئەو کەلەپوورە پاسەوانی هەن. دیارە کەلەپووریش پێچەوانەی عادەت هێزێکی پێوەندیدار (binding force)ی هەیە، کە خاوەنی ناوەڕۆکێکی جووتلایەنییانەی مۆراڵ و سۆزە}.([197])

---

[197] Anthony Giddens, Living in a post-traditional society. لە ئینتەرنێت وەرگیراوە، کە ئەو باسە لە لاپەڕە ٦٣ی کتێبەکەدایە
http://ls-tlss.ucl.ac.uk/course-materials/ANTH٣٠٢٠_٦٦٧٩٠.pdf

بەکورتی دەکرێت بڵێم (جیدینیز) پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە ئەو مرۆڤە کاتێ خۆی بەو کەلەپوورەوە دەبەستێتەوە و لەوێوە لە دنیا دەڕوانێت، ئەوا دەبێتە پاسەوانی و لەمەوە هەر شتێک دەداتە دواوە، ئەگەر لەگەڵ حەقیقەتەکەیدا نەیەتەوە، بەوەی هەم بە شتێکی مۆراڵیی دەزانێت و هەم وەک سۆزێکیش بۆ ئەو ڕابوردووە، بەرگریی لێ دەکات. ڕێک وەک ئەوەی لەو ڕێگەیەوە دڵسۆزی و وەفای خۆی بۆ باوک و باپیرانی دەرببڕێت. لای من سەیر نییە ڕەخنەگری میللی هێندە توند دەستی بەو کەلەپوورەوە گرتووە و بە زمانی ئەو کەلەپوورەیش لە دژی هەر نووسەرێکی داهێنەردا دەوەستێتەوە، کە ڕێگەیەکی جیاواز بگرێت.

ناوهێنانی فیلۆسۆف و چەمکەکانیشیان شێوازێکی تری بەرگرییە لەو حەقیقەتەی لە ڕێگەی یادەوەریی کۆوە، واتە لە داپیر و باپیرانیەوە، پێی گەیشتووە، لە کاتێکدا ئەوانە هێنراونەتە ئاستی ئەو کەلەپوورە و لە ناوەڕۆکی خۆیان بەتاڵ کراونەتەوە. وەک بەردەوام گوترا ڕەخنەگری میللی هەمان زمان و تێگەیشتنی ئەو نەنک و باپیرانەی هەن.

(باوەڕی تەواو) لەو کەلەپوورەدا هەیە، بەڵام لە فەلسەفەدا نەء، چونکە فیکری فەلسەفی هەر لە بنەڕەتەوە لەسەر تێکشکاندنی ئەو حەقیقەتە دامەزراوە، کە کەلەپوور ئەرکی پاراستنی بە پاسەوان و جەنگاوەرەکانی سپاردووە. جارێ بەر

له هەرچی (هایدیگەر) ئەو فیلۆسۆفە پێشەنگەیە، کە بەگژ مێژوویەکدا دەچێتەوە، تێیدا هەر لە (پلاتۆن) و (ئەریستۆ)وە تا دەگاتە سەردەمەکەی خۆی، سەرجەم ڕەهەندەکانی فیکر تەنیا لە ڕەهەندی راشنالیتی (عەقلانیەت)دا کورت کراونەتەوە. بە یەکێک لە گەورەترین ڕەخنەگرانی مۆدێرنیتی دادەنرێت، بۆیە لە فیکری ئەودا نەک هەر ئەو ڕەهاییە بوونی نییە، کە عەقڵ سەپاندوویەتی، بەڵکوو شەڕی گەورەیشی لە دژدا بەرپا کردووە. ئەمە لە فەلسەفەی ئەودا ئەلفوبێیە و هیچ هونەرێک لەوەدا نییە، کە من ئەوە دەزانم. ئەگەر پێویستی کرد، بە گوتارێکی سەربەخۆ بۆی دەگەڕێمەوە.

لێرەدا دەڵێم گوتەی (من بڕوای تەواوم بەو تیۆرەی هایدگەر هەیە) هەر لەگەڵ فیکری ئەودا زۆر ناڕێکە، بەڵکوو وەک گوترا هیی پیاوە ئایینییەکانە. هیی ئەو کەلەپوورەیە، کە وەک بینیمان (جیدینیز) ڕەخنەی لێ دەگرێت. لای (هایدیگەر)دا شتێک نییە بە ناوی (باوەڕی تەواو)، چونکە ئەوە تەنیا پێوەرەکانی عەقڵ و زانستن پاڵپشتی (باوەڕی تەواو) دەکەن، لە کاتێکدا ئەو فیلۆسۆفە ژیانی خۆی بۆ ڕەخنەگرتن لەوانە تەرخان کردووە، بەڵام ئەگەر پێت وایە هەیە، دەتوانیت پێشانمی بدەیت؟ باسکردنی (هایدیگەر) بە زمانی ڕۆژانەی خەڵک لەوە زیاتری لێ ناکەوێتەوە. کۆمیدیایە، کۆمیدیا! ئەوەی تۆ گوتووتە، وەک ئەوەیە من بڵێم:

(بڕوای تەواوم بەو تیۆرییەی عەلی مەردان هەیە، کە منداڵ دەبێت لە باخچەی ساوایاندا فێری بنەماکانی مەقام ببێت و بە جوانی بەردەوامی بە داهێنانەکانی خۆی بدات. منداڵ ئەگەر وا نەکات، ئەوە بە گەورەیی دەست لە خواردنی پیتزا ناپارێزێت).

ئەودەم کەسێ پێم دەڵێت: تۆ تەنیا هێندەت زانیوە (مەردان) مەقامزانە و مەقامی گوتووە، دەنا نە گوێت لە مەقامەکانی گرتووە و نە هیچی لەبارەیەوە دەزانیت. (مەردان) کەی و لە کوێ گوتوویەتی پیتزا خواردنێکی خراپە؟ ئەوەیشم لێ دەپرسێت: پیتزا چییەتی؟ ئایا ئەگەر پەنیرەکە بە جوانی بتوێتەوە و چاک شتەکان داپۆشێت، لێی خۆشتر هەیە؟ لێرەدا من یان دەبێت پێشانی بدەم، کە (مەردان) وای گوتووە و ئەمە تیۆریی ئەوە، یان دەبێت بڵێم ڕاست دەکەیت، پیتزا خۆشە. لێت ناشارمەوە دووەمیان هەڵدەبژێرم. (لێرەدا دووبارە لە وشەی تیۆری پارێز دەکەم). هیوادارم تۆ وەک من خۆت بە دەستەوە نەدەیت و پێمان بڵێیت ئەو تیۆرییەی (هایدیگەر) چییە و لە کام کتێبەیدا باس کراوە، کە باوەڕی تەواوت پێیەتی. ئەگەر نەتدۆزییەوە، چی بە خۆت دەڵێیت؟

ئێستا بۆ چەمکی (نیگەرانی) دەگەڕێینەوە، کە ڕەنگە تۆ لە منی موفلیس، یان لەو هاوڕێیانەمت وەرگرتبێت، کە پێت وایە بە خۆڕایی منیان کردووەتە نووسەر. ئایا لە ڕێگەی خوێندنەوەی بەرهەمەکانی (هایدیگەر)ەوە بەوە گەییشتیت، کە ئەو باس لە

نیگەرانی دەکات، یان لەو نووسینانەی ئێمەدا بەر چاوت کەوت و خستتە ناو زمانی میللییەوە؟ لە گوتارێکی خۆمدا چەند پەرەگرافێک وەردەگرم، تاکوو پێشانی بدەم حەوت ساڵ لە پێش تۆ چۆن باسی (نیگەرانی)م لای ئەو فیلۆسۆفەدا کردووە. دەمەوێت سەرنجیش بدەیت و بزانیت ئەو فیلۆسۆفەی پێت وایە ترسی لەوەیە خەڵک خۆیان بکوژن، چۆن لە مردنی ڕوانیوە.([198])

{مرۆڤ لای (هایدیگەر)، کە بە (دازاین DASEIN) ناو دەبرێت، بەشێکە لە دیاردەکانی (بوون). (دازاین) لای (هایدیگەر) مانایەکی زۆر تایبەتی هەیە، کە لە لایەک بۆچوونی (دێکارت) دەداتە دواوە، بەوەی ئەو پێی وابوو مرۆڤ (هۆشیارییە) و لە لایەکی تریش کۆنتێکستی ئەو وشەیە دەگۆڕێت. ئەگەر لە فەرهەنگدا بە مانای (شوێنی بوون) بێت، ئەوا لای ئەو دەبێتە (Being – there). بەم شێوەیە (دازاین) بریتییە لە گۆڕینی پرسیاری (مرۆڤ چییە؟) بۆ (مرۆڤ کێیە؟)، بۆیە پێی وایە (دازاین) لە خودی مرۆڤ ڕەسەنترە. ئەرکی (دازاین) ڕاڤەکردن و ڕێکخستنەوەی دنیایە، بەو مانایەی دنیا دەبێت لە ماسکەکانی دابماڵرێت و بە ڕوونی دەربکەوێت. ئەو بوونەوەرە لە دنیادا تەنیا لەگەڵ ئەوانی تردا پێوەندیی نییە، بەڵکوو لەگەڵ کۆمەڵێک شتی دیکەیشدا ئەو پێوەندییەی هەیە،

---

[198] http://hemin.dk/files/pdf/KKS_lebarey_gutary_IsmaelHemeAminewe.pdf

به ڕادەیەک ناتوانین مرۆڤ و ئەوانی تر بەبێ یەکتر بهێنینە بەر چاومان، بەڵام تەنیا مرۆڤ لە توانایدا هەیە لە (بوون)ی خۆی تێبگات، بەوەی تەنیا ئەو دەتوانێت لەبارەی (بوون)ـەوە پرسیار بکات. بەم پێیە بوونی مرۆڤ بە بوونی ئەوانی ترەوە بەندە، بەڵام دەشێ ئەو بوونە ڕاستی و ڕەسەن بێت و دەشێ ڕووکەش، یان ساختە بێت. بوونی ڕەسەن و ڕاستییش لەوەدا دەردەکەوێت، کە خود هەست بە (بوون)ی خۆی بکات وەک تاکێکی سەربەخۆ، لە کاتێکدا بوونی ڕووکەش و ساختە ئەوەیە لە خودی خۆی دادەبڕێت و لە پرۆسێسی (بەشتبوون Reification)دا دەبێتە بابەت و لە کۆمەڵدا دەتوێتەوە، کە ئەمە لای (نیتشە) بە (مێگەل Herd) ناو دەبرێت. بەم پێیە بوونی ڕەسەن و ڕاستەقینە لەگەڵ دڵەڕاوکێ و *__نیگەرانیدا__* هاوکاتە، بەوەی ئەو بوونە ناتوانێت لەگەڵ (ئێستا)ی خۆیدا بگونجێت و لە ئاستی (داهاتوو)یشدا هەست بە ترسێکی گەورە دەکات. ئەو ترسە ڕوویەکی دیکەی دڵەڕاوکێ و __نیگەرانییە__. بە مانایەکی تر ترسە لە مردن، کە دەیکاتە بوونەوەرێکی نامۆ، مادام عەدەم (Nihil) پێوەندیی نێوان واقیعی ئەو بوونەوەرە و (بوون) پێک دەهێنێت. عەدەم هەمیشە پرسیاری (هایدیگەر) بووە، بەوەی وەک لە لێکچەی (مێتافیزیک چییە؟)دا پێی وایە پرسیارێکە زانست نایەوێت خۆیی لێ نزیک بکاتەوە، بگرە بە لاوەی دەنێت، بەڵام لە ڕێگەی __نیگەرانی__ و دڵەڕاوکێوە هەستی

پێ دەکرێت.([199]) لێرەوەیە زەمەنیش بوونێکی بێسەرەتا و بێکۆتای هەیە. لەم شوێنەوە (هایدیگەر) دەستبەرداری ئەو بۆچوونە ڕۆژانەییە (Vulgar) دەبێت، بگرە بە تەواوی بە لاوەی دەنێت، کە زەمەن بۆ ڕابوردوو، ئێستا و داهاتوو دابەش دەکات، بەوەی ئەمەیان لەسەر جیاکردنەوەی میتافیزیکیانەی نێوان خود و بابەت دامەزراوە، کە ناوەرۆکێکی کرۆنۆلۆژییانەی هەیە و تەنیا بە یەک ئاڕاستەدا دەڕوات. بە بڕوای ئەو (ڕابردوو) بوونی نییە، بەڵکوو زەمەن لە (ئێستا)دا دەست پێ دەکات و هەموو ڕەهەندەکانی زەمەنیش لەوێوە سەر هەڵدەدەن. ئیتر (داهاتوو) بریتی نییە لەو کاتەی دەکەوێتە دوای (ئێستا)، وەک چۆن (ڕابردوو)یش ئەو کاتە نییە، کە لێی تێ پەڕیوین. ( لیلیان ئالوایس: Lilian Alweiss) لە (Heidegger and the concept of time: هایدیگەر و بیرۆکەی کات)دا دەڵێت: (پێچەوانەی فەلسەفەی باو، هایدیگەر پێی وایە کات مانای خۆی لە مردن (Mortal)، نەوەک لە نەمری (Eternity)ەوە وەردەگرێت).([200]) بەم پێیە زەمەن و مەرگ دوو شتی ناو یەک پێکهاتەن. یان با بڵێین بە بڕوای (هایدیگەر) (مردن ئەوە نییە یەکەمجار مرۆڤ لە کاتی نەمانیدا بۆی بێت، بەڵکوو مردن هەر لە سەرەتاوە بەشێکە لە مرۆڤ.

---

[199] http://evans-experientialism.freewebspace.com/heidegger٥a.htm

[200] http://www.naturalthinker.net/trl/texts/Heidegger,Martin/texts٪٢٠on٪٢٠Heidegger/Alweiss,٪٢٠Lilian٪٢٠-٪٢٠Heidegger٪٢٠On٪٢٠Time.pdf

ئەوە ئەزموونێک نییە تەنیا لە ساتی سەرەمەرگدا ڕوو بدات، بەڵکوو هیی سەرتاپێی ژیانە).[٢٠١] ترس وەک پێشتر گوتمان لای (هایدیگەر) حاڵەتێکی ئۆنتۆلۆجییە، دۆزینەوەی بوونی ڕەسەنە، بەوەی بوونی ڕەسەن و ڕاستەقینە لەگەڵ دڵەڕاوکێ و نیگەرانیدا هاوکاتە، مادام ئەو بوونە ناتوانێت لەگەڵ (ئێستا)ی خۆیدا بگونجێت و لە ئاستی (داهاتوو)یشدا هەست بە ترسێکی گەورە دەکات. بەم شێوەیە لای (هایدیگەر) ترس و نیگەرانی لە یەکتر جیاواز نین. لە لێکچەی (مێتافیزیک چییە؟)دا دەڵێت: (ئێمە لە نیگەرانیدا دەخولێینەوە، بە مانایەکی وردتر نیگەرانی وا دەکات ئێمە هەڵواسراو بمێنینەوە، چونکە ئەمە پاڵمان پێوە دەنێت لە گشت (Whole)، واتە لە کۆمەڵ، بخزێین. ئەمە مانای وایە ئێمە خۆمان _ ئێمەین ئەوانەین، کە بوونیان هەیە_ لەناو ئەو بوونەوەرانەدا لە خۆمان ترازاوین)}.[٢٠٢]

من بۆچوونەکانی (هایدیگەر)م لەو سەرچاوانە وەرگرتووە. تۆ ئەمەی خۆتت لە کوێ هێناوە؟ ئێستایش پێت وایە ئەو گوتەیە هیی (هایدیگەر)ە؟ ئەگەر وەڵامی من نادەیتەوە، دەتوانیت بە یەکێ لە خوێنەرەکانتی بڵێیت، ئاخۆ هیی ئەوە، یان نا؟ خۆزگە

[٢٠١] K. E. Løgstrup, Martin Heidegger, DET lille FOLAG, printed in Denmark ١٩٩٦, side ٥٢

[٢٠٢] http://evans-experientialism.freewebspace.com/heidegger٥a.htm

هەر لە سەرەتاوە کاتێ ئەو گوتەیەت لە کتێبێکی (هایدیگەر) وەرگرت، سەرچاوەکەیت بنووسیایە، کە ئێستا بە ئاسانی بۆی دەگەڕاینەوە و پێویستی نەدەکرد ئەم بەدواداچوونەی بۆ بکەین. ئەمڕۆیش درەنگ نییە، ئەگەر ناوی سەرچاوەکە بۆ خوێنەر ئاشکرا بکرێت. کتێبی هەیە، شتی وای تێدا نووسیبێت؟

لە پۆلی شەشەمی ئامادەییدا ڕستەی (A car hit Tom: ئەکار هیت تۆم)، واتە (ئۆتۆمۆبیل لە تۆمی دا)مان لە وانەی گرامەری ئینگلیزیدا وەرگرت، کە وا دێتە گوێچکەوە: (ئەکاهی تۆم)... (ئەکاهـ)ی کێیت؟ (ئەکاهـ)ی تۆم. (ئەکاهـ)ی منیت؟ دەبینین لە زمانی کوردیدا ماناکەی تەواو گۆڕاوە. هەر ئەو ڕۆژە ئەم نوکتەیەم لێ دروست کرد:

گۆرانیبێژێکی میللیی خۆمان لە لەندەن بانگهێشت کراوە و لە هۆڵەکەدا، پێش ئەوەی بچێتە سەر شانۆ، گوێی لێ دەبێت وا خەڵک ئەمە دەڵێن، لە کاتێکدا ئەم خۆی ئاگای لە ڕووداوەکە نییە و نازانێت باسی چییش دەکەن. بەم شێوەیە دەیکاتە گۆرانی: (ئەکاهی تۆم، ئەکاهی تۆم، زەلیلی تۆم، گیانەکەم، بۆ ڕەحمێ ناکەی بە خۆم؟ زۆر لەمێژە ئەکاهی تۆم. گەر دەزانی چەند ئەکاهی تۆم. بە سکی برسی، بە چاوی کز و بە پشتی کۆم. شەوانە ئەکاهی تۆم، وەک دیل بم لە لەشکری داگیرکەری ڕۆم. ڕۆژانە هەر ئەکاهی تۆم، بۆیە دایمە دەکڕووزێمەوە و یەک ژەم بە تێری ناخۆم. ئەکاهی تۆم،

ئەکاهی تۆم، بۆت دەگریم، فرمێسکم خوڕە دەکات وەک ئاوی چۆم. هەر ئەکاهی تۆم، هەر ئەکاهی تۆم، دەست هەڵناگرم، تا ماوم لە شیوەن و ڕۆڕۆم. ئەکاهی تۆم، ئەکاهی تۆم، سەرجەم خەمی دنیا هاتووە بۆم. ئەوەتا ئێرە جێ دەهێڵم و بۆ شوێنێکی چۆڵی دووردوور دەڕۆم. ئەکاهی تۆم، ئەکاهی تۆم).

وا خۆی پیشان دەدات، کە وشەکان زۆر کاریگەرن، بۆیە بە گریانەوە دەریاندەبڕێت و فرمێسک هەڵدەڕێژێت. (تۆم) خۆی یەکێکە لەوانەی بۆ ئەوە هاتووە گوێ لە گۆرانیی ئەو گۆرانیبێژە بگرێت، کە لەگەڵ ئەوەیشدا ئۆتۆمۆبیل لێی داوە، بەڵام هەر نایەوێت ئاهەنگەکەی لە دەست بچێت. زۆری لا سەیرە، کە ئەو گۆرانیبێژە ئاوا بە خێرایی ڕووداوەکەی ئەمی کردووەتە گۆرانی و بۆی دەگری، بەڵام تەنیا هێندە تێدەگات، کە دەگوترێت (ئۆتۆمۆبیل لێی داوە). دەیەوێت مانای وشەکانی تریش بزانێت، بۆیە کوردێکی دانیشتووی لەندەن لەوێ دەدۆزێتەوە. پێی دەڵێت خێرا بۆی وەربگێڕێت. کاتێ گوێی لەو وشانە دەبێت، لە سەری خۆی دەدات و دەڵێت: (ئەوە دیارە من هەر ئۆتۆمۆبیل لێی نەداوم، بەڵکوو ئەو هەموو بەڵایەشم بەسەر هاتوون و نەمزانیوە! گۆرانیبێژێکی کورد لەبەر حاڵی من خەو و خۆراکی لێ هەڵگیراوە، شەو و ڕۆژ دەگری، وا بۆ چۆڵەوانییەکی دووردوور سەر هەڵدەگرێت، کەچی خۆیشم هێندە بێباکم! لە هەمووی ناخۆشتریش، ئەوەیە، دەمێکە

ئۆتۆمۆبیل لێی داوم، بەڵام وا ئێستا هەستی دەکەم. ئەوە من چیم بەسەر هاتووە و لە چ دنیایەکدام؟)...

ئەگەر ئەو گوتەیەی تۆ بۆ (هایدیگەر) بکرێتە ئەڵمانی، چی دەڵێت؟ دوور نییە تەپڵ لێ بدات و ئەم گۆرانییە بچڕێت: (دادێ ئەزێ بجەنگم، سەربازەکی چەلەنگم... چەکێ مەیە گرانە، دیلان دەنگێ تۆپانە... دادێ تە گۆت نەرینە، ڤینا وەلات شیرینە، سۆز بت قەت ئەم ڤە ناکەین، دوژمن جێهێ مە ڕینێ).[٢٠٣]

لە مووسڵ، لە ماڵی قوتابییاندا فێری ئەوە بووبووین هەر بۆ خۆشی بڵێین فلان فیلۆسۆف لە فلان کتێبدا وای گوتووە، لە کاتێکدا تەنیا ناوی فیلۆسۆفەکە ڕاست بوو، دەنا نە کتێبەکە بوونی هەبوو و نە گوتەکەیش. ئەمەمان بە ڕێگەیەکی کاریگەریش دەزانی، تاکوو ڕەخنە لە یەکتر بگرین، بێ ئەوەی کەسێ دڵگران ببێت. ئەو ژنەی خزمم لە لاپەڕەکانی سەرەتادا باس کرا، کە خۆی و مێردی بە ئیفلاسی لەو شارە گەڕابوونەوە، هەر جارێ دەهات سەر لە خوشکەکەی بدات، دواوەی ئۆتۆمۆبیلەکەیانی پڕ لە خواردن دەکرد و بۆی دەهێنایین، کە منیش هەر پێنجشەممەیەک بۆ هەولێر

---

[٢٠٣] گۆرانیی گۆرانیبێژی دەنگخۆش و یاخی (ئەردەوان زاخۆلی) بوو، کە بەعس تیرۆری کرد. گۆرانیبێژێکی میللی وشەکانی بەم شێوەیەی ئێستا گۆڕیبوو، تاکوو لەگەڵ شەڕی قادسیەدا ڕێک بکەوێت. مردووی دەهێنایە قاقای پێکەنین، کە هەندێک منداڵ و گەورە لەگەڵیان دەگوتەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەڵێم هێشتا (هایدیگەر) لەو سەیرتری دەڵێت، چونکە ئەم لاساییی لاسایکەرەوە دەکاتەوە.(LOL)

دەگەڕامەوە، وانەی ئابووریم بە کچ و کوڕەکەی دەگوت. ئەوان لە پۆلی شەشەمی ئامادەییدا بوون. جارێکیان مەنجەڵێک بریانیی گەیاندە دەستمان، کە بۆ ژەمی ئێوارە خۆم و هاوڕێکانم خواردمان، بەڵام کەمێک لە بنی مەنجەڵەکەدا مایەوە و بۆ سبەیم هەڵگرت، بەو مەبەستەی کاتێ لە زانکۆ دەگەڕێمەوە، بیخۆم. لە گەڕانەوەدا بینیم مەنجەڵ هیچی تێدا نەماوە. گوتم (سارتەر) لە کتێبی (مەنجەڵە بەتاڵەکان)دا دەڵێت: (کاتێ دەبینیت مەنجەڵ بەتاڵە، گەمژەییە خەتاکە بخەیتە ئەستۆی خۆیەوە، بەڵکوو پێویستە بیر لەو دەستە چەپەڵانە بکەیتەوە، کە بەتاڵی دەکەن). بێگومان (سارتەر) کتێبی وای هەر نییە، بەڵام (دەستە چەپەڵەکان) ناوی تێکستێکی شانۆییەتی، کە لە ساڵی ١٩٤٨، واتە لەدوای شەڕی دووەمی جیهانیدا نووسیویەتی.[٢٠٤] هاوڕێیەک گوتی: {بەڵام (کامیۆ) لە کتێبی (مەنجەڵەکان هەر بۆ ئەوە باشن بەتاڵ بکرێن)دا ڕەخنە

---

[٢٠٤] بەکورتی بریتییە لە چیرۆکی ژیانی لاوێکی خوێنگەرم، ناوی (هۆگۆ)یە و چووەتە ناو پارتێکی چەپەوە، کە بە نهێنی کار دەکات. لە یەکێ لەو کۆبوونەوە نهێنییانەدا بڕیار لەسەر کوشتنی سەرکردەیەکی حزبی سۆشیالیستیی هاوپەیمانی سۆڤیەت دەدرێت، بەوەی پارتەکە وای بە چاک دەزانێت ئەو کەسە لە ژیاندا نەمێنێت. (هۆگۆ) زۆر بە جۆشەوە ئەو ئەرکە لە ئەستۆ دەگرێت و تێیشدا سەر دەکەوێت، بەڵام دەخرێتە زیندانەوە. ئەو پارتەی بە نهێنی کاری دەکرد و (هۆگۆ) تێیدا ئەندامە، دەسەڵات دەگرێتە دەست. (هۆگۆ) ماوەی زیندانییەکەی تەواو دەکات و دێتە دەرێ. دەبینێت ئەو سەرکردەیەی کوشتوویەتی، وا پەیکەرێکی گەورەی لە ناوجەرگەی شاردا بۆ کراوە. کاتێ لە هۆکارەکەی دەپرسێت، پێی دەڵێن قۆناغەکە وا دەخوازێت، چونکە حزبەکەیان ئەمڕۆ ئەو ڕێگەیەی گرتووە، کە سەرکردە کوژراوەکە باوەڕی پێی هەبووە. ئێستا هاوڕێ کۆنەکانی دەیانەوێت بە هەر شێوەیەکە گیانیشی لە ناو بەن.

لەو بۆچوونەی سارتەر دەگرێت و پێی وایە مەنجەڵەکان بێگوناهـ نین، مادام بەو چێشتە خۆشانەی ناویان، مرۆڤە برسییەکان تەفرە دەدەن).

ئەو ڕۆژە میوانێکمان هەبوو، کە نەیدەزانی ئێمە ئەوانە هەر بۆ گاڵتە دەڵێین. جارێکان لای دوو سێ کچی زانکۆ دانیشتووە و هەمان ئەو گوتەیەی من وەک خۆی دەڵێتەوە، تەنانەت ناوی کتێبەکەیش دەهێنێت. ئینجا ئاماژە بەو ڕەخنەیەی (کامیۆ) و کتێبەکەیشی دەکات، گوایە لەو کتێبەی (سارتەر)ی گرتووە، بەڵام دەڵێت ئەو ڕەخنەیە زۆر نابەجێیە. بەوەندە ناوەستێت و بە حەماسەوە گوتەکەی (سارتەر) بە مەسەلەی هەژاری، برسێتی و بێکارییشەوە دەبەستێتەوە. دوایی بۆمان دەرکەوت وا دوو سێ کەسی تریش هەمان ئەو گوتانە دەڵێنەوە.

ڕاستییەکەی بەشێکی زۆری ئەو گوتانەی ڕەخنەگری میللی تێهەڵکێشی گوتارەکانیان دەکات، یان ئەوەتا خۆی دایتاشیون، یان لە ڕێگەی ئاواوە پێی گەیشتوون، بۆیە هەندێکیان کاتێ لەبارەی سەرچاوەی ئەو گوتانەوە پرسیاریان لێ دەکرێت، خۆیان دەدزنەوە و پەنا بۆ شێوازی تر دەبەن، ئەو شێوازەی هەر کەسێکی تر دەتوانێت بیگرێت، کە هەر ئەوە دەریدەخات ئەوانە ناوی ئەو فیلۆسۆفانەیان تەنیا بیستووە، دەنا بەرهەمەکانیان نەدیون. هیوادارم تۆ لەوانە نەبیت، کە لەم دوو

گوتارەتدا وەک ئەوانت کردووە. هیوام وایە لانی کەم لەم دایەلۆگەوە وەک نووسەرێکی جیاواز بتبینم.

لە گفتوگۆی (منداڵێک بە دزییەوە کتێب دەخوێنێتەوە)دا باسی چەمکی (ئیلهام)م کردووە، بەوەی کاتێ ڕەخنەگر تێکستێک دەخوێنێتەوە و پەنا بۆ زمانی وەسف دەبات، ئەوا تەنیا پشت بەو ئیلهامەی خۆی دەبەستێت. واتە ڕەخنەگری میللی ئاگای لە سەرچاوەکانی مەعریفە نییە و لە ڕێی ئیلهامەوە ئەو وێنە سادانەی خەیاڵی خۆی دەگوازێتەوە. تۆ پێنج شەش ساڵ دوای ئەوە هاتوویت هەمان قسەی منت کردووەتەوە. نووسیوتە: (بەشی هەرە زۆری نووسەری کورد بۆ نووسینی دەق پشت بەستووە بە ئیلهام، نەک بەمەعریفە و ڕاوەستان لەسەر ئەو چەمکانەی گرێدراوی ڕاستەوخۆی ژیانی مرۆڤن). جارێ بەر لە هەرچی هیچ چەمکێک هەیە گرێدراوی ڕاستەوخۆی ژیانی مرۆڤ نەبێت؟ مادام هەر چەمکێک لە ڕێگەی پرسیار لەبارەی بوونمانەوە، لە دایک بووە و گەشەی کردووە، ئەوا بێگومان سەرجەمیان پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بە ژیانمانەوە هەیە. ئەگەر وایە ئەم وەسفە چییە؟ ئەوەی تۆ لە بۆچوونەکەی منت زیاد کردووە، تەنیا ئەو وەسفەیە، کە زیادەیە و گوتنی سەیرە. ئایا من نەمدەتوانی وا بڵێم؟ بەهەرحاڵ بەشێک لەو نامەیە وەردەگرم، کە هەر ئەو ڕۆژەی گوتارەکەت بڵاو کرایەوە، بۆم نووسیت:

{کاک ئارامی ئازیز! چ لە سەرەتای ئەم نامەیە و چ لەوانی پێشوومدا گوتوومە زۆر چەمک بە کار دەهێنیت، بۆ ئەوەی لێیان قووڵ ببیتەوە. ئەوەتا هەر بۆ نموونە چەمکی (ئیلهام)ت بە شێوە میللییەکەی بە کار هێناوە. نووسیوتە: (بەشی هەرە زۆری نووسەری کورد بۆ نووسینی دەق پشت بەستووە بە ئیلهام، نەک بەمەعریفە و ڕاوەستان لەسەر ئەو چەمکانەی گرێدراوی ڕاستەوخۆی ژیانی مرۆڤن). بە ڕاستی من دەبێت لێرە بوەستم و بپرسم دەبێت ئەو برا ئازیزەی من (ئیلهام Inspiration) بە چی تێگەیشتبێت؟! چۆن ڕەخنەگرێک پێی وا بێت یەکێ لە فاکتەرە سەرەکییەکانی لاوازیی ڕەخنە نەبوونی ڕۆشنبیرییەکی گەورەیە، کەچی ڕێگا بە خۆی دەدات گوتەیەکی ئاوا سادە بنووسێت؟! ئەرێ ئەو ڕەخنەگرە نەیزانیوە ئەو چەمکە لینکی لەناو فەلسەفە و فیکری دنیادا هەیە و بەو ئاسانییە نییە؟ بە ڕاستی سەیرە، ئەو ڕەخنەگرە بەشی هەرە زۆری نووسەران تۆمەتبار بکات بەوەی پشت بە ئیلهام دەبەستن و لە چەمکەکان قووڵ نابنەوە، کەچی خۆی ئاوا لە ئیلهام تێگەیشتبێت!! ئەرێ هیچ نووسەرێک هەیە ئینجا ئەو نووسەرە هیی ئەدەب بێت، یان هیی هونەر، یاخود هیی ڕەخنە، پشت بە ئیلهام نەبەستێت؟ بێگومان نابێت هەبێت، بەڵام کاتێ ڕەخنەگر ئاگای لە فیکرە سەرەکییەکانی دنیا نییە و تەنیا پشت بە ئیلهام دەبەستێت، ئەمەیان گرفتەکەیە. ئایا مەبەستت ئەوەیە؟ من خۆم دوو جار لە گفتوگۆدا لەبارەی ئەو چەمکەوە دواوم. یەکەمیان، لەو گفتوگۆیەی (....)دا، کە تۆ بینیوتە و لەو بارەیەوە سەرنجیشت بۆ نووسیوم. دووەمیان، لە گفتوگۆی (،،،،،)دا. لەوەی (......)دا پێم لەسەر ئەوە داگرتووە، کە کاتێک ڕەخنەگر تەنیا پشت بە ئیلهام دەبەستێت، ناتوانێت دۆخی تێکست تێ بپەڕێنێت و شتی نوێی تێدا بدۆزێتەوە، بەڵکو بەپێی ئەو ئیلهامەی لەو کاتەدا بۆی هاتووە هەندێک شتی سادە دەردەبڕێت. ئەمە پەرەگرافەکەیە: (ڕەخنە فانتازیای تێکست

لەسەر ئاستەکانی فیکر و ئیستاتیکادا دەخوێنیتەوە و هەوڵی دۆزینەوەی ماناکان دەدا، نەوەک فانتازیاکانی خۆی لەسەر بنیات بنێت. من لە شوێنێکی دیکەشدا باسم لەوە کردووە، کە زمانی شیعر بۆ ڕەخنە دەست نادات، چونکە ئەو زمانە سیفەتێکی مەزاجییانەی هەیە و هەر جارێک بەشێوەیەکی جیاوازتر لەوەی پێشووی دەردەکەوێت. سەرچاوەی ئەو ڕەخنەیە مەعریفە نییە، بەڵکو ئیلهامە. ڕەخنەگری وەسفی هەیە لە کاتێکدا ئیلهامی بۆ هاتووە و گوتوویەتی: "زۆر کەس لە نەزانییەوە بێت، یان لە هەرچییەکی دیکەوە بێت وا دەزانن زمان نووسەر دروست دەکات"، کەچی جارێکی دیکە بەشێوەیەکی دیکە ئیلهامەکەی پێ گەیشتووە و گوتوویەتی: "لێرەدا نووسەر زۆر وەستایانە زمانێکی نایابی دروست کردووە و بەو زمانەش بە چاکی وەسفی دەرەوە و ناوەوەی شتەکانی کردووە. ئەوەی توانای دروستکردنی زمانی نەبێت، هەر نەنووسێت باشترە". ئیلهام بۆ نووسینی تێکستی ئەدەبی چاکە و فرەدەنگی مسۆگەر دەکات، بەڵام لە ڕەخنەدا کۆمێدیایە، کاریکاتێرە).

من مەبەستم ئەوەیە کاتێ ڕەخنەگر تێکستێک دەخوێنێتەوە و پەنا بۆ زمانی وەسف دەبات، ئەوا تەنیا پشت بەو ئیلهامەی خۆی دەبەستێت. واتە ڕەخنەگری وەسفی ئاگای لە سەرچاوەکانی مەعریفە نییە و لە ڕێی ئیلهامەوە ئەو وێنە سادانەی ناو خەیاڵی خۆی دەگوازێتەوە. پێنج شەش ساڵ بەسەر ئەو بۆچوونەی مندا تێپەڕیوە و پێم بڵێ تۆ ئەمڕۆ چیی نوێت خستووەتە سەری؟ من بەردەوام گوتوومە تەنیا نووسەری ئەدەبی گێڕانەوەم. هەرگیز ڕێم بە خۆم نەداوە بڵێم زۆربەی هەرە زۆری نووسەری کورد خاوەنی ڕۆشنبیریی گەورە نین، بەڵام تۆ ڕەخنەگریت و ئەو شتە سادە و بەسەرچووانەت نووسیوەتەوە. هیوادارم دیسان وەک جاری پێشووت نەڵێیت (من ڕەخنەگر نیم)، چونکە بە ڕاستی سەیرە یەکێ خۆی بە ڕەخنەگر نەزانێت و ئەو حوکمانەیش دەربکات. دووبارەی دەکەمەوە

چەمکی (ئیلهام)یشت وەکو زۆربەی چەمکەکانی ترت تەنیا بە ئیلهام بە کار هێناوە. واتە تێیدا قووڵ نەبوویتەوە و لەناو بوارەکانی مەعریفەدا بۆ وردەکارییەکانی نەگەڕاویت. من لەو گفتوگۆیەی (....)دا ڕێک مەبەستم لە ڕەخنەگری لەم شێوەیەیە، کە ئیلهام تەنیا لەو زانیارییە سادانەی خۆیانەوە وەردەگرن و ئاگاداری سەرچاوە مەعریفییەکان نین. دەتوانیت لەبارەی (ئیلهام)ەوە شتێکی دیکەم پێ بڵێیت، کە تاکو ئێستا نەتگوتبێت، بۆ ئەوەی من خێرا لەو بۆچوونەی خۆم پەشیوان ببمەوە؟ من لەو گفتوگۆیەی (،،،،،،)دا لایەکی تری ئەو چەمکە باس دەکەم، کە لە خۆم ڕادەبینم بڵێم توانیومە شتێکی جیاواز لەوەی پێشووم بڵێم. گفتوگۆکەت بۆ دەنێرم، بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە و بزانیت هیچ نووسەرێک هەیە پشتی بە ئیلهام قایم نەبێت. ئایا ئیلهام خۆی شتێکی دابڕاوە لە مەعریفە؟ ئایا فەیلەسووف و ڕووناکبیران پشت بە ئیلهام نابەستن؟ بەڵام ئیلهام لای خودێک، کە خاوەنی هۆشیارییە و توانای پرسیاری هەیە جیاوازە لە هیی خودێک، کە لەناو قەرەباڵغیدا تواوەتەوە. ڕەخنەگرە وەسفییەکانی ئێمە لە جۆری دووەمیانن}.

دەتوانم زۆر شتی تر لە بەرهەمەکانتدا دەستنیشان بکەم، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان لە منت وەرگرتوون، بەڵام جارێ با هێندە بەس بێت.

# ئایا من موفلیسم؟

لێت ناشارمەوە دەمویست وەک چۆن لێرەدا بایەخی زۆرم بە هەر چەمکێک دا، کە فڕێت داون، بە هەمان شێوە لەسەر چەمکی (موفلیس)یشدا بوەستم، بەڵام ئێستا هەست دەکەم پێویست نییە، چونکە ئەوە پێشان درا، کە هەر یەکێ لەو فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزانە چۆن لەم دنیایە، یان لەم ژیانە دەڕوانن، ئەو ژیانەی تۆ پێت وایە کەلێنەکانی بە نووسین پڕ دەکرێنەوە، بۆیە هێندە بەسە، کە بزانین مرۆڤ ئەگەر نەبێتە بەشێک لەم دنیایە، ئەوا پێویستە هەموو شتەکانی لە دەست بدات و ئیفلاسی هەڵبژێرێت. خۆ ئەگەر بووە بەشێکی دانەبڕاوی ئەم دنیایە و کەلێنەکانی بوون و (ژیان!)ی بە هەر شتێک پڕ کرانەوە، ئەوا وەک ئەوانەی ترە و شتێکی نییە بە ناوی جیاوازییەوە. ئەمە مانای ئەوە نییە هەر هیچ باس لەو چەمکە ناکەم، بەڵام وەک گوتم بە هەمان قورسایی ئەوانەی تر نا. ئەوەی گرنگە لێرەدا بیکەم، ئەوەیە، پانۆرامایەکی ئەم

دنیایە بخەمە بەر چاو، کە تۆ هێندە گەشبینانە، دروستتر ساکارانە لێی دەڕوانیت.

سەدەی بیستەم سەدەی نەمانی هیوایە بە مۆدێرنیتی، واتە نەمانی هیوا بەو جیهانەی وا چاوەڕێی لێ دەکرا ببێتە پارادایس، بۆیە ئاراستەیەکی نوێ لە فەلسەفەی ڕەشبینی دەست پێ دەکات، کە پێشتر بە ڕاستی لە (شۆپێنهاوێر) و (نیتشە)وە سەری هەڵدابوو. (ئۆسڤاڵد شپینگلەر) لە ١٩١٨دا کتێبی (داڕووخانی خۆرئاوا) چاپ دەکات، کە پێ لەسەر داڕمانی فیکری و شارستانەتی خۆرئاوا دادەگرێت. واتە ئەو شارستانەتییە ئەگەر سەرەتا وەک فیکرەیەکی تەواو و بە توانا ناوەکییەکەیەوە پێ دەگات، کە لە ڕوخساردا دەبێتە واقیعێک، ئەوا لەناکاو ڕەق دەبێتەوە، خوێنی دەیبەستێت و هێزی لێ دەبڕێت. ئەودەم ناوی شاری لێ دەنرێت.([٢٠٥])

ڕەشبینییەکەی دەگاتە ئەوەی وا لە شار بڕوانێت، شتێک نییە جگە لەو ئاوێنەیەی وێرانبوونی شارستانیەت پێشان دەدات. هەر لە سەدەی بیستەمدا کۆمەڵێک ئاراستەی تری فەلسەفەی ڕەشبین دەردەکەون و تاکوو ئەمڕۆیش بە شێوەی جیاوازجیاواز درێژەیان هەیە، کە زۆربەیان ڕەخنەی گەورە لە واقیعی مۆدێرنیتی دەگرن و دەیانەوێت تێی بپەڕێنن، لەوانە:

---

[٢٠٥] اسوالد اشبنجلر، تدهور الحضارة الغربية، ترجمة احمد الشيباني، الجزء الاول، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت- لبنان، ص٢١٧

سترەکچرالیزم، پۆستسترەکچرالیزم، دیکونسترەکشن و زۆری تر.

چەند ساڵێک لەمەوبەر شاعیرێکی لاوی خۆمان نووسیبووی حەیفە من لە ئەورووپام، کە ئەوە بوو بابەتەکەیم بە ئاڕاستەی دایەلۆگدا برد و لەوێدا لەبارەی ئەورووپاوە، کە ژینگەی مۆدێرنیتییە، ئەم چەند وشەیەم بۆ نووسی:

{ئەرێ ئەو فیلۆسۆفەی ئەورووپا شێتی کرد، پێی نەگوتوویت (ئێستا)ی ئەورووپا وەهمە و بۆ شاردنەوەی ڕابردووە؟ پێی نەگوتوویت مۆدێرنیتی لە عەدەم زیاتر شتێکی دیکەی لە خۆیدا هەڵنەگرتووە؟ ئایا هەر لەبەر ئەوە نییە هەندێک لە ڕەخنەدۆزان پێیان وایە پۆستمۆدێرنیتی لە (نیتشە)وە دەست پێ دەکات، بەوەی باوەڕی وایە، کە مۆدێرنیتی و ئەو عەقڵانیەتیەی بەرهەمیشی هێناوە، پێوەندییەکی ناماقووڵیان لەگەڵ ڕابردوودا پێک هێناوە، کە ئەو پێوەندییە لەسەر بنەمای چەپاندن و دوورخستنەوە وەستاوە؟ ئەرێ پێی نەگوتوویت مۆدێرنیتی دەیەوێت سیمایەکی ڕەهایانە بە (ئێستا)ی مرۆڤ بدات، بگرە دەیەوێت بوونی مرۆڤی ئەمڕۆ بسڕێتەوە؟ پێی نەگوتیت هاوشێوەی عەقڵانیەت مرۆڤ دوور دەخاتەوە، بگرە هەر وجوودی مرۆڤ بە لاوە دەنێت؟ ئەرێ هەق نییە بچیت جارێکی تر هەردوو کتێبی (بوون و کات) و (تەکنیک، حەقیقەت و وجوود)ی (مارتین هایدیگەر) بخوێنیتەوە، کە جەخت لەسەر

هەندێک لە بۆچوونەکانی (نیتشە) دەکاتەوە و پێی وایە مرۆڤ لەم ئەورووپایە شوێنی ئامێر دەگرێتەوە؟ ئایا ئەو فیلۆسۆفە پێی نەگوتوویت مەترسیی گەورەی تەکنیک، کە ئەورووپا شانازیی پێوە دەکات، ئەوەیە، تەگەرە دەخاتە بەردەمی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی ڕەسەن بگەڕێتەوە؟ (فرۆید) هیچ نەبێت لە هەر دوو کتێبی (ئاییندەی وەهم) و (نیگەرانی لە شارستانیەت)دا پێی نەگوتوویت ئەورووپا لەسەر چ بنەمایەک دامەزراوە؟ ئەریَ بیرت نەماوە کاتێ لە پێوەندیی نێوان نامۆبوون و شارستانیەتی کۆڵییەوە، گەییشتە ئەو باوەڕەی، کە نامۆبوون ئەنجامی ململانێی نێوان خود و کۆنترۆڵەکانی شارستانیەتە، بەوەی شارستانیەت دەبێتە هۆی چەپاندنی ئارەزووەکانی تاک و تووشی نیگەرانی و شپرزەییی دەکات؟ ئایا (میشێل فۆکۆ)، کە هەموو تەمەنی خۆی بۆ تێگەیشتن لە ئەورووپا تەرخان کرد، پێی نەگوتی مۆدێرنیتی، ئەوەی ئەورووپا شانازیی پێوە دەکات، تەنیا کۆت، زنجیر، بەندیخانە و سیستێمی چاودێریی بەرهەم هێناوە؟ ئەریَ ئەو فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزە هەر لە کتێبی (مێژووی شێتی لە سەردەمی کلاسیکی)ـەوە تاکوو بەرهەمەکانی دیکەی بەردەوام ڕەخنە لە عەقڵ ناگرێت، کە ئەورووپای لەسەر دامەزراوە و بە ڕووەکەی دیکەی شێتیی نازانێت؟ ئەریَ ناڵێت نەک هەر مرۆڤ لە کۆت و زنجیر ڕزگار ناکات، بەڵکوو لە ڕێگەی زانستەوە یاسا بەسەر کۆمەڵگەدا دەسەپێنێت، دامودەستگەی پۆلیسی و زیندان بە هێز دەکات،

شێوازەکانی ئەشکەنجە دادەهێنێت و زۆری دیکە؟ ئەریَ (هابرماز) پێی نەگوتیت هیچ نەبێت لەدوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە ئەوروپا لە مەترسییەکی گەورەدایە و دەبێت ڕزگار بکرێت؟ (دێریدا) لەو بارەیەوە هیچی پیَ نەگوتوویت؟}.

ئەمە ئەو دنیایەیە، کە ڕەخنەدۆزانی پۆستمۆدێرنیتی، واتە ئەوانەی ڕەخنە لە واقیعی مۆدێرنیتی دەگرن، دەیخەنە بەر چاومان، بۆیە من شتێک لەناویدا نابینم کەلێنی بوونم پڕ بکاتەوە. ئایا هێشتا دەڵێیت: (من بڕوای تەواوم بەو تیۆرەی هایدگەر هەیە، کە مرۆڤ دەبیت بە نیگەرانییەوە بەردەوامی بە بوون و داهێنانەکانی خۆی بدات. مرۆڤ ئەگەر نائومێدی بیوەستێنێت ڕەنگە دواجار خۆکوشتن هەڵبژێریت)؟

وەک پێشتر گوتم من لەم دنیایەدا هەموو شتێک لە دەست دەدەم، بێجگە لە زمان. لەو کاتەی وازم هێنا و لە دۆخێکی نالەباردا بووم، تۆی ڕەخنەگر دەرفەتەکەت قۆزتەوە و هێرشت کردە سەرم، هێشتا ئەو زمانەم لە دەست نەدا و نەهاتم لە هەمان ئاستی زمانی تۆدا بە کاری بهێنم. وەک بینیمان زمان لای (هایدیگەر) واتە بوون. زمان بوونی منە. ئەوەی بوونی ڕەسەنی هەبێت، زمان لە دەست نادات، بەڵام ئەوەی بوونی ساختەی هەبێت، هەر لە بنەڕەتەوە نەبووەتە خاوەنی زمان، تاکوو ترسی لەدەستدانی هەبێت. مەبەستم تۆ نییە، چونکە وەک گوتم هەرگیز نابمە دادگا و هەڵسەنگاندنی ڕەوشتی کەس

به کاری خۆم نازانم، بەڵکوو مەبەستم بە گشتی لە ڕەخنەگری میللییە. وەک گوتیشم ئەمە زمانی هەمیشەی تۆ نەبووە. ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەو نامەیەی، کە ئەودەم بۆم ناردیت:

{ئازیزی من، دەمێکە پێم گوتوویت زمان ئامانجە، نەوەک نووسین. من دەشێ وازم لە بڵاوکردنەوە هێنابێت، بەڵام مانای ئەوە نییە دەستم لە زمانی خۆم هەڵگرتووە. بەشێک لەوانەی وازهێنانی من وا لێک دەدەنەوە، کە ڕووخان و خۆبەدەستەوەدانە، وا لە زمان دەڕوانن، کە بریتییە لە نووسین. ئەگەر نەتنووسی، زمانت نییە، کە ئەمە لای من پێچەوانەیە. وەک گوتم دەستم لە زمانی خۆم هەڵنەگرتووە، کە تەعبیرە لە کەسایەتیم و هۆشیاریم دەردەخات. من بنووسم، یان نەنووسم، هەر لە ڕێگەی ئەم زمانەوە پێوەندی بە دنیاوە دەکەم. ئەوەتا بە هەمان زمان لەگەڵ تۆدا دەدوێم. من هەر بەم زمان و هۆشیارییە ژیانم بە ڕێ دەکەم. دەیڵێمەوە نووسین فۆرمێکە لە فۆرمەکانی زمان، کە زمان بێژمار فۆرمی هەن. ئایا نەمدەتوانی لە هەر دەستگەیەکی کەلتووری دابمەزرێم و ڕۆژانە گوتارێک بۆ ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە بنووسم؟ بە تۆی ئازیزی دەڵێم وازهێنانی من بڕیارێکی ناوەوەی خۆمە و ئاڕاستەیە بۆ دەرەوە، نەوەک بەپێچەوانە. مادام دەتوانم بەردەوام بم و بەرهەمم هەیە، ئەوا وازهێنان ویستی خۆمەو بەسەرمدا نەسەپاوە.... نیگەرانی ڕێگەی لێ

گرتووم لە ڕۆژنامەی حزبەکاندا ببمە نووسەر و پارەی پێ پەیدا بکەم. ئەگەر پێت وایە من دەستم لە زمانی خۆم هەڵگرتووە و لەگەڵ کەلتووری کۆمەڵگەدا ئاشت بوومەتەوە، تەنیا حوکمێکە داوتە، دەنا نووسەر بم و نووسەر نەبم، ئەوە زمان و تێگەیشتنی منن!}

لەو گفتوگۆیەی هاوڕێیەکی چیرۆکنووس دە ساڵ لەمەوبەر لەگەڵیدا کردووم و ناوی (منداڵێک بە دزییەوە کتێب دەخوێنێتەوە)یە، لەبارەی پرسیاری فەشەل و فاشیلەوە، وام وەڵام داوەتەوە:

{من پێم وایە زۆرجار فەشەل، یاخود فیاسکۆ خۆی لە سەرکەوتن گەورەترە، چونکە هەمیشە ئەو وێنانەی مرۆڤی فاشیل ویستوویەتی پێیان بگات، گەورەترن لەو وێنانەی مرۆڤی سەرکەوتوو پێیان گەیشتوون. دەتوانم بڵێم فاشیل ئەو شوێنەی تێ پەڕاندووە، کە مرۆڤی سەرکەوتوو بە دڵنیایی تێیدا ڕاکشاوە. فاشیل لەناو دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوەدا دەژی، کە ئەمە سەرچاوەی داهێنانە. هەموو فەشەلێک ئەنجامی هەوڵەکانە. بۆ ئەوەی فاشیلت هەبێت، ئەوا پێویستە پێشتر هەوڵدانت هەبێت. بە دڵنیاییەوە پێت دەڵێم هەوڵەکانی فاشیل بەردەوام لە هەوڵەکانی سەرکەوتوو گەورەترن. فەشەل ئازارێکی قورسە، بەڵام فاشیل بە توانایەکی بێوێنەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. نووسین بە درێژاییی مێژووی خۆی پەناگەی

فاشیلەکان بووە، ئەوە ئەگەر نەڵێم فاشیلەکان ئەو ژینگەیەیان خوڵقاندووە. نووسین خۆکوشتنە لەسەر ئاستی سیمبۆڵدا. لە هەموو شتێک فەشەلت هێناوە و ئەنجام (خۆت دەکوژی = خۆت دەنووسی). خۆت و ئەوانەی دیکەیش دەنووسیتەوە. سایکۆلۆجیا پێمان دەڵێت زۆرجار فەشەل بووەتە مویتیڤێکی گرنگ لای فاشیل و گەورەترین داهێنانی هەر لەو بوارەدا بۆ مسۆگەر کردووە، کە پێشتر تێیدا کورتی هێناوە. من دەمەوێت داهێنان و سەرکەوتن لە یەکتر جیا بکەمەوە، چونکە سەرکەوتن پابەندی بڕیار و هەڵسەنگاندنی ئەوانی دیکەیە بۆ ئێمە. ئەمە ئەو شتە بوو، کە (سارتەر) بە دوژمنی خۆیی دەزانی... بەڵام داهێنان ئەو وزە بێسنوورەیە، کە خۆمان لەناو خودی خۆماندا دەیدۆزینەوە و لەناکاو دەریدەخەین. سەرکەوتن دڵنیایی دەبەخشێت، دڵنیاییش کۆتاییە، بەڵام داهێنان نیگەرانی و دڵەڕاوکێ بۆ نووسەر دەهێنێت و سەرەتایەکی دیکەیە بۆ داهێنانەکانی دواتری}.

کەواتە من دە ساڵ لەمەوبەر بێ ئەوەی زانیبێتم، ڕەخنەگرێک لە گوتارێکدا بە فاشیلم دەزانێت، ئاوام لەبارەی ئەو چەمکەوە گوتووە، بۆیە وەک گوتم بە خۆشحاڵییەوە لێتی وەردەگرم. کتێبی منداڵیم، کە لای تۆ کتێبێکی باشە وەک لە گوتاری یەکەمتدا گوتووتە، بە ئاشکرا ئەوەی تێدا گوتراوە من هەر لە

سەرەتاوە فەشەل و مایەپووچیم بە بەردا بڕاوە و هەر ئەوانەیش کردمییانە نووسەر.

ئەوە ئەلفوبێیە، کە هەر ڕەخنەدۆزێک، یان لێکۆڵەرەوەیەک لەبارەی چەمکێکەوە بنووسێت، سەرەتا بە پێناسەی ئەو چەمکە دەست پێ دەکات. نابێ خوێنەر بزانێت مەبەستی تۆ لە چەمکی موفلیس چییە؟ نەدەکرا پێناسەیەکی بۆ بکەیت، هەتا ئەگەر کورتیش بووایە؟ تۆ دڵنیایت من بەو ئاستە گەیشتووم، پێم بگوترێت موفلیس؟ بەرهەمەکانم تاکوو ئەو ڕادەیە داهێنەرانەن؟

ئایا کاتێ بێدەنگ دەبین، مانای وایە هیچمان نەماوە بیڵێین؟ چوار ساڵ دەبێت لەو بارەیەوە گوتارێکم لە ژێر ناونیشانی (بێدەنگی وەک پرسیارێکی ئۆنتۆلۆجی)دا نووسیوە و هەوڵم داوە بە وردی ئەو چەمکە شی بکەمەوە، کە ئەمە بەشێکیەتی:

{کاتێ بێدەنگی و دەنگ وەک دوالیسمێک سەیر دەکەین، هیچ ئەنجامی گرنگ بە دەستەوە نادەین، بەڵام ناشکرێت جیاوازی لەنێوانیاندا نەبینین، کە بە بڕوای من بینینی ئەو جیاوازییە لە بەرژەوەندیی بێدەنگیدایە، بەوەی هەر قووڵبوونەوەیەک لەو چەمکە پەراوێزخراوەدا ئەوەمان بە سەردا دەسەپێنێت تێڕوانینی باو تێ بپەڕێنین و بە شێوەی تر لێی بڕوانین. لە زمانی کوردیدا پێشگری (بێ)، کە بە مانای (نەبوون) دێت، بە

هەر وشەیەکەوە بلکێت، پێچەوانەی دەکاتەوە و ئاماژەی ئەوە دەدات، کە شتێکی نێگەتیڤە وەک لە (بێهێز)، (بێتوانا)، (بێبەهرە) و زۆری تردا دەردەکەوێت، بۆیە وشەی (بێدەنگی) مانای نەبوونی دەنگە، لە کاتێکدا لە زمانی عەرەبی (صمت) و لە ئینگلیزی (Silence) دەگوترێت، کە مانای نەبوونی دەنگ ناگەیەنن. بە هەمان شێوە لە زمانی ئەڵمانی و ئەسکەندەناڤیدا وشەکان پێوەندییان بە دەنگەوە نییە. واتە لە ڕووی ئۆراڵەوە هیچ ئاماژەیەکی نێگەتیڤانە بۆ ئەو چەمکە هەست پێ ناکەین، تاکوو پێمان بڵێت (بێدەنگی) بۆیە بێدەنگییە، چونکە دەنگی نییە وەک ئەوەی لە زمانی ئێمەدا هەیە. لە زمانی کوردیدا جیاوازی لەنێوان (لسان Tongue) و (لغة language)یشدا ناکرێت، لە کاتێکدا ئەو دووانە لای زمانەوانەکان لەوانە لای (سۆسێر) جیاوازن و ئەرکی جیاوازیشیان هەیە. (سۆسێر)، کە بە دامەزرێنەری سیمۆلۆجیا دادەنرێت، پێی وایە زمان بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە و زوبان (Tongue) بەو مەبەستە دایهێناوە تاکەکان بە کاری بهێنن.

بەوەدا چەمکی بێدەنگی پێوەندیی بە دەنگ، زمان، زمانی ئاخاوتن و نووسینەوە هەیە، باسێکی قووڵە و لە بواری لینگویستیک و فەلسەفەدا بەردەوام پرسیاری ماندووکەر بووە، بە ڕادەیەک لە (پلاتۆن) و زووترەوە تاکوو (دێریدا) و دواتر هەر یەکەی بە شێوەی خۆی ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە

سەرکێشە بووەتەوە، تەنانەت لە بواری شێوەکارییشدا بێدەنگی، کە بە ڕەنگی سپی ئاماژەی پێ دەدرێت، بایەخێکی گەورەی فیکری و ئێستاتیکیی هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا ئەو بوارەمان نییە بچینە ناو وردەکارییەکانیەوە. کەلتووری کوردی وێنەی هەر کەلتوورێکی دیکەی ترادیشناڵ نەک هەر لە ڕووی زمانەوانییەوە وەک نەبوویەک لە بێدەنگی دەڕوانێت، بەڵکوو لە ڕووی کۆمەڵایەتییشەوە مرۆڤی بێدەنگ بە بوونەوەرێکی دەستەپاچە لە قەڵەم دەدات، بەوەی دەنگ ڕێگەی سەرەکییە بۆ خۆگونجاندن لەناو کۆمەڵگەدا. دەنگ لایەنە فیزیکییەکەی زمانە، مادام قورگ، زوبان، مەلاشوو، ددان، لێو و شتی تر بەشداریی تێدا دەکەن، بێدەنگییش لایەنە مێتافیزیکییەکەیەتی. ئەگەر وەک (هایدیگەر) پێی لەسەر دادەگرێت مرۆڤ لەنێوان ئەو هەموو بوونەوەر و شتانەی لە ناویاندا دەژی، تاکە بوونەوەرە لە توانایدا هەیە لەبارەی (بوون)ـەوە پرسیار بکات و لێی تێبگات، ئەوا دەکرێت بڵێین مرۆڤ تاکە بوونەوەریشە دەتوانێت بێدەنگ ببێت و لە بێدەنگیی خۆی تێبگات، مادام بێدەنگی لە سەرچاوەیەکی ڕەسەنە. دەنگ زۆربەی کات ئاڕاستەیە بۆ ئەوانی تر و لەژێر جەبری کۆمەڵێک فاکتەری وەک کۆمەڵایەتی، ئابووری و جیۆگرافیدایە، بۆیە دەشێ دەنگ شتێکی ساختە و شێواو بێت، بەوەی ڕێگەی سەرەکییە بۆ خۆگونجاندنی مرۆڤ لەناو گروپەکاندا، لە کاتێکدا بێدەنگی دایەلۆگی خودە لەگەڵ خۆیدا. دەکرێت بگوترێت بێدەنگی

تەعبیر لە بوونی ڕاستەقینەی مرۆڤ دەکات، بەوەی زیاتر لە دەنگ خاوەنی ئازادییە. بەم شێوەیە بێدەنگی، بەتایبەتی لای داهێنەر، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە (بوون)ێکی ڕەسەن و سەربەخۆی هەیە و نایەوێت وەک (بوون)ی ڕووکەش و ساختە لە خودی خۆی داببڕێت، نەبادا لە پرۆسێسی (بەشتبوون)دا ببێتە بابەت و لە کۆمەڵدا بتوێتەوە. کەواتە بێدەنگی نەگوتنی شت نییە، بەڵکوو گوتنی شتە بۆ ئەو خودەی بیر دەکاتەوە و پرسیاری ئۆنتۆلۆجیی هەیە}.(٢٠٦)

هەر (هایدیگەر) دەنووسێت: (مرۆڤ بەو ڕادەیەی وەڵامی قسە دەداتەوە، قسە دەکات. وەڵامدانەوە گوێگرتنە. وەڵامدانەوە هەیە، کاتێ ئینتیما بۆ بێدەنگی هەیە. مرۆڤ بەو ئەندازەیەی لەگەڵ قسەدا هاوشێوەیە، قسە دەکات. قسە قسەکەرە).(٢٠٧) کەواتە گوێگر داوای لێ کراوە گوێ لەوە بگرێت، کە نابیسرێت، بە شێوەیەک نەبیستراو بیستراوە.(٢٠٨)

ئەمە پێداگرتنی (هایدیگەر)ە لەسەر بایەخی گەورەی زمان لە کردنەوەی وجووددا، کە پێی وایە بێدەنگی مانای نەبوونی دەنگ نییە، بەڵکوو وردبوونەوەیە لە خودی زمان، بگرە بۆ

[٢٠٦] http://www.hemin.dk/mla/node/٥٢٣

[٢٠٧] مارتن هیدجر، انشاد المنادي، (قراءة في شعر هولدرلن وتراكل)، تلخيص وترجمة بسام حجار، المركز الثقافي العربي، بيروت، الطبعة الاولى،١٩٩٤، ص٢٠

[٢٠٨] كرد محمد، الشعر والوجود عند هيدغر، رسالة مقدمه لنيل شهادة دكتوراه في الفلسفة، ، السنة الجامعية ٢٠١١_، ٢٠١٢ص١٤٧

بەردەوامییە لە گەیاندن و دایەلۆگدا. نەبوونی بەشێکە لە ماهییەتی ئێمە. یان دەکرێت بڵێین ئەو بێدەنگییە لە لایەک دایەلۆگی نێوان خود و خودە و لەلایەکی تریش دایەلۆگە لەگەڵ ئەوەی تردا. بەڵێ، دایەلۆگ، واتە بەردەوامیی پرسیار، نەوەک وەستان لە شێوەی وەڵامدا وەک ئەوەی تۆی ڕەخنەگری ئێمە بە پشتبەستن بە کەلتووری میللی، بە هێنانەوەی گوتەی داپیرە و باپیرانمان، گوتووتە. ئەوەتا (هایدیگەر) لە شوێنێکی تری هەمان کتێبدا دەنووسێت: {توانای قسەکردن و گوێگرتن لە بنەڕەتدا پێکەوە دەژین. (ئێمە دایەلۆگین). واتە: ئێمە دەتوانین لە دۆخی گوێگرتن لە یەکتردا بین. ئەم کارە بەو مانایەیە، کە ئێمە هەردووکمان یەک دایەلۆگین}.([٢٠٩])

هەمیشە بێدەنگی ئەو پرسیارە بووە، کە منی بە خۆیەوە خەریک کردووە. دەتوانم بڵێم لانی کەم لە چیرۆکی (ماچی قوتوو)ـەوە دەست پێ دەکات، کە یەکێکە کۆمەڵەی (سەدەی یەکەمی خەیاڵ). لە زۆربەی بەرهەمەکانمدا بێدەنگی ڕووبەری گەورە داگیر دەکات. لە شیعریشدا ئەزموونێکم هەیە بە ناوی (ئەزموونێکی مەزن)، کە لە کتێبی (ڕاگەردان)دا بڵاو کراوەتەوە. باس لە بایەخی سەرنەکەوتن، نەوەک هیی سەرکەوتن، دەکات و لە خوارەوە دەیخوێنینەوە:

---

[٢٠٩] مارتن هيدجر، انشاد المنادي، (قراءة في شعر هولدرلن وتراكل)، تلخيص وترجمة بسام حجار، المركز الثقافي العربي، بيروت، الطبعة الاولى،١٩٩٤، ص٦٠

ماوەیەکی زۆرە بە دوای کتێبێکدا دەگەڕێم
کەسێک تێیدا باسی سەرنەکەوتنەکانی خۆی کردبێت،
دەستم ناکەوێت.
زۆرن ئەوانەی لەبارەی سەرکەوتنەکانیانەوە
کتێبی قەبەیان چاپ کردووە.
بۆم دەرکەوتووە سەرنەکەوتووەکان
خۆپەرستن،
نایانەوێت نهێنیی سەرنەکەوتنەکانیان
بە کەسی نزیکیشیان بڵێن.
لە گەڕانی خۆم بەردەوامم،
چونکە دەزانم تێیدا سەر ناکەوم.
با منیش لەو ڕێگەیەوە
ببمە خاوەنی ئەزموونێکی مەزن.
تۆ بڵێی ڕۆژگارێک نهێنیی ئەو کارە گرنگەم
لە کتێبێکدا بنووسم، یان دڵم بێت
بە دەستگیرانە ئازیزەکەمی بڵێم؟

سەرکەوتن واتە وەستان و دەستهەڵگرتن لە گەڕان، بەڵام ئەوە سەرنەکەوتنە دەبێتە پاڵنەری بەردەوامیمان، کە ئەو بەردەوامییە هەم بەرهەمی پرسیارە و هەم بەرهەمهێنەری پرسیاریشە. هەر لە کتێبی (ڕاگەردان)دا چیرۆکێکم هەیە ناوی (چیرۆکی کوڕەکەچەڵ نا، هیی کوڕەقژدرێژ)ە. لە

هەشتاوحەوتدا نووسراوە و دواتر دەستكاريم كردووە.
كارەكتەرە سەرەكييەكەی شەست ساڵ خەريكی لەدەستدانی
ئەو سامانە زۆرەيە، كە دايكوباوكی بۆيان جێ هێشتووە.
لەلايەن خەڵكەوە سووكايەتيی زۆری پێ دەكرێت و سێ بەشی
تەمەنی لە زيندانداا بە سەر دەبات، هەر بۆ ئەوەی سامانەكەی
بدۆڕێنێت، چونكە پێی وايە تاكوو مايەپووچ نەبێت، نابێتە
مرۆڤێكی سەربەخۆ و ئازاد. لە تەمەنی شەستساڵيدا بە
ئاواتەكەی دەگات و هيچی نامێنێت، بەڵكوو دەكەوێتە كۆڵانيش.
ڕوو لە كرێكاری و دەستفرۆشی دەكات. دوو ژن بە جارێ
دێنە ناو ژيانی و دەبنە هاوڕێی. هەر يەكەی لەسەر شێوازی
خۆی دەيەوێت لەبارەی ڕابوردوويەوە بزانێت، بەڵام ئامادە
نييە وەڵاميان بداتەوە، ئەگەرچی سوور دەزانێت بەو هۆيەوە
لێی دەتۆرێن. تەنيا ئەو ساڵانە بە هی خۆی دەزانێت، كە
سامانەكەی لە دەست داوە و بووەتە كرێكار و دەستفرۆش.
چيرۆكەكە زۆر لەوە زياترە و نامەوێت كورتی بكەمەوە، بەڵام
مەبەستمە بڵێم ئەو بيرۆكەيە هەميشە لای مندا هەبووە و بە
شێوەی جياواز كارم پێ كردووە، كە وەك بينيمان ڕيشەی
لەناو فەلسەفەدايە.

لێت ناشارمەوە و پێشتريش لە كەسم نەشاردووەتەوە، كە من
لە منداڵييەوە كەسێكی فاشيل و موفليسم. لە قوتابخانە جێگەم
نەدەبووەوە، چونكە باوەڕم بەو بابەتانە نەبوو، مامۆستاكانم

پێیان دەگوتم. لەناو پارتیدا شوێنم نەبووەوە، چونکوو باوەڕم بەو شتانە نەبوو، بەرپرسەکانم دەیانویست بە ئاسانی وەریانبگرم، بۆیە لە تەمەنی بیستسالییەوە کەوتمە ڕەخنەگرتن و لە بیستودووسالیدا بۆ هەتاهەتایە جێم هێشت. لەناو کۆمۆنیستەکانیشدا هەر شوێنم نەبووەوە. بەکورتی نەمویست ببمە خاوەنی هیچ شتێکی ئەم دنیایە. من بە ڕاستی لە هاوینی ١٩٩٢ەوە ئازادم، کە دنیای ئایدیۆلۆجیام جێ هێشت و بە تەواوی ڕووم لە دنیای نووسین کرد، تاکوو بیکەمە کەناڵێکی گرنگی زمان و جیاوازییەکانی خۆمی لە ڕێگەوە بگەیەنم. من لەدوای ئەو ڕاگەیاندنەوە زیاتر لە جاران لە تەنیاییدا نغرۆم، بەڵام بەوەدا خۆمم لە دەست نەداوە، بەرگەی دەگرم. دەیڵێمەوە و بە دەنگی بەرزتر دەیڵێمەوە:

ئەوەی لە دەستم نەداوە و لە دەستی نادەم، ئەم زمانەمە. ئەوە ئەو زمانەیە ناهێڵێت یەک کەس بەوە تۆمەتبارم بکات، کە لە ئاستی نزمدا کێشەیەکم بۆ دروست کردووە. یەک کەس لە خۆی ڕانابینێت پێم بڵێ لە ژیانی ڕۆژانەیشمدا ئەو زمانەم لە ئاستی نزمدا بە کار هێناوە. بەم زمانە ژیانی ڕۆژانەم بە سەر دەبەم. ئەوەتا هەر بەو زمانەیش لەگەڵ تۆی ئازیزدا گفتوگۆ دەکەم. ئەگەر ئارەزووی گفتوگۆت هەیە، بە خۆشحاڵییەوە تاکوو ئەو کاتەی دەتەوێت، لەگەڵت بەردەوام دەبم. ئەم شتانە بۆیە دەنووسم، چونکە وەک لە سەرەتادا گوترا، بایۆگرافیایە و

له شێوەی نامەدایە. واتە لە شێوەی ژیاننامەدا ئەم بابەتەم نووسیوە، دەنا ناکرێت نووسەر لە گوتاری ئەکادێمیدا بە لای باسی وادا بچێت. سروشتی بابەتەکەیش ئەوە دەخوازێت. نەدەکرا ڕێگەیەکی تر بۆ قسەکردن لەبارەی ئەو شتانەی لەبارەمەوە گوتراون، بگرم. هەمیشە حەز دەکەم لە نووسیندا ئازادیی بێسنوورم هەبێت، تاکوو وەک ئەوەی دەمەوێت، بنووسم.

## ڕەخنەگری میللی چۆن کەلێنەکانی بوون و ژیانی خۆی پڕ دەکاتەوە؟

وەک بینیمان تۆ خاوەنی ئەم گوتەیەیت: (نووسەری ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەنووسێت، کە لێنەکانی بوون و ژیانی لە ڕێگەی نووسینەوە پڕ بکاتەوە)، کە باوەڕم وایە بەر هۆشیاریی هەر خوێنەرێکی یاخی بکەوێت، هێڵنجی دێنێتێ، بگرە دەیڕشێنێتەوە. (هێڵنج: Nausea) بە مانا سارتەرییەکەی، کە میکانیزمێکی سایکۆلۆجییە، لای مرۆڤی گۆشەگیری یاخیدا دروست دەبێت، بەوەی نایەوێت (بوون)ی لە دەست بدات و بکرێتە شت وەک لە (ئەنتۆنی ڕۆکانتان)ی کارەکتەری نۆڤێلی (هێڵنج)ی ئەو فیلۆسۆفەدا دەیبینین. ڕاستییەکەی ئەو هێڵنجدانەیە بوونی ئێمە دەپارێزێت و ناهێڵێت داگیر بکرێت. دەپرسم: ئایا نووسین (کە لێنەکانی بوون و ژیانی) تۆی پڕ کردووەتەوە؟ هیوادارم نەیکردبێتەوە. خۆزگە ئەمجارە، کاتێ دەیخوێنیتەوە، وەک مرۆڤێکی یاخی و نووسەرێکی داهێنەر دڵت تێک هەڵبێت، بگرە

لەسەر شێوازی (ئەنتۆنی ڕۆکانتان) بڕشێیتەوە، کە ئەمە نیشانەی ئەوەیە هەڵوێستەت کردووە. ناتەوێت (بوون)ی خۆت لە دەست بدەیت و ببیتە شت. مانای وایە ئەم دایەلۆگە بە گرنگ دەزانیت. من هەر خۆم دەمەوێت بزانم تۆ ئەگەر ئەم دایەلۆگە بە گرنگ نەزانیت، ئەدی چی بە گرنگ دەزانیت! بۆ نموونە گوتارێک لەبارەی چییەوە دەنووسیت، کە پێت وایە لەم دایەلۆگە گرنگترە؟ لەو گوتارەتدا ناوی چەند لەو فیلۆسۆفانە دەهێنیت؟ چۆن کار بە چەمکەکانیان دەکەیت و ئاماژە بە سەرچاوەکانیان دەدەیت، کە پێیان لەسەر دایەلۆگ داگرتووە؟

ئەگەر نەتویست وەڵامی ئەو پرسیارەی من بدەیتەوە، ئایا دەتوانیت بە هاوڕێ نزیکەکانتی بڵێیت ئاخۆ نووسین (کە لێنەکانی بوون و ژیان)تی پڕ کردووەتەوە؟ یان ئەگەر یەکێ ئەو پرسیارەی لێ کردیت، چ وەڵامێکی دەدەیتەوە؟

وەک بینیمان من بە شایەتیی خۆت موفلیسم. تۆی ڕەخنەگر لە ڕێگەی نووسینەوە بوویتە خاوەنی چی؟ هیوادارم بتوانیت بڵێیت: (نەبوومەتە خاوەنی هیچ، بەڵکوو هەر خۆمم. بوونم لە دەست نەداوە و بۆ شت نەگۆڕاوم). ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت تۆ ئەو گوتەیەت، بگرە هەردوو گوتارەکەتت تێ پەڕاندوون و بە هیی خۆتیانیان نازانیت. لە ئێستاوە من پێی دڵخۆشم و بە گەرمی دەستەکانت دەگوشم. چ خوێنەرێکی پرسیارکەر و یاخی پێی خۆش نییە لە دەمی نووسەرێکەوە ئەمە ببیستێت؟ چ

خوێنەرێکی لەم شێوەیە بە پەرۆشەوە بەرهەمەکانی نووسەرێک ناخوێنێتەوە، کە (بوون)ی خۆی پاراستووە؟ لە بەردەمی دامودەستگەکاندا ملی کەچ نەکردووە و بۆ ئەوە جەنگاوە نەکرێتە شت؟[210]

---

[210] (بەشتبوون: Reification)، بەو مانایەی (هایدیگەر)، (سارتەر) و فیلۆسۆفانی تری ئەگزێستێنشالیزم مەبەستیانە، کە خۆت ناوت هێناون و بە خوێنەرت گوتووە دەیانناسیت. بەگشتی ئەوانە پێیان وایە هەر کاتێ تاک بوونی خۆی لە دەست دەدات و دەبێتە بەشێک لەو دامودەستگایانە، ئەوا لەوە دەردەچێت بوونەوەر بێت، بەڵکوو بۆ شت دەگۆڕێت. (بە دیاریکراوی لەگەڵ کەسم نییە). ئەگەر پێویستی کرد، بۆ ئەو چەمکە دەگەڕێمەوە و زیاتری لەبارەوە دەنووسم، کە پێشتریش نووسیومە.

# چەند خاڵێك لە شێوەی پەراوێزدا

دوو نموونەت لەوانە هێناوەتەوە، کە وازیان هێناوە و ڕاگەیاندنیان نەنووسیوە. دەتوانی نموونەیش لەو نووسەرانە بهێنێتەوە، کە بە هۆی پرسیارەوە ئیفلاسیان کردووە؟ بێگومان جگە لە من. ئەوە زانیمان من بە هۆی پرسیارەوە ئیفلاسم کرد، بەڵام کێی تریش؟ (هایدیگەر) زۆری پرسیار کردووە. تۆ بڵێی ئەو ئیفلاسی نەکردبێت و ئێمە نەمانزانیبێت؟

لە گوتاری یەکەمتدا گوتووتە هاوڕێکانم منیان کردووەتە نووسەر، دەنا نووسەر نیم. هەر کەسێ لەبارەی منەوە نووسیبێتی، لە ڕێگەی بەرهەمەکانمەوە ناومی بیستووە. هەیانە سەرەتا کتێبمی فڕێ داوە و دوایی بە شێوەیەکی تر بۆی گەڕاوەتەوە. دەتوانی ناوی هەندێکیان بهێنیت و ئاماژە بە نووسینیان بدەیت؟ ئەگەرچی دەبووایە هەر لەو گوتارەتدا وات بکردایە، وەک خۆت دە ساڵ لەمەوبەر گوتووتە دەبێت جورئەتمان هەبێت، کاتێ شتی وا دەڵێین، بەڵام ئێستایش درەنگ نییە وا بکەیت. لە خۆم ڕادەبینم بڵێم زۆربەی ئەوانەی

لەبارەی بەرهەمی منەوە نووسیویانە، لە داهێنەرەکانی دنیای کوردین. کاتێ (ئەسپیدیلۆن)م چاپ کرد، کەس نەیدەزانی کێم و لە چ شارێکەوە هاتووم، کەچی ئەو کۆمەڵەچیرۆکەم سەرنجی نووسەرە دیارەکانی ڕاکێشا و یەکێکیان هەر زوو وەک داهێنانێکی نوێ بە خوێنەری ناساند.

لەبارەی کتێبی نووسەرێکەوە نووسیوتە: (ئایا ئێمە خاوەنی خوێنەرگەلێکین، کە ڕاستگۆبێت لەگەڵا خۆیی و دەقدا).

منیش هەر ئەو ئێوارەیە ئەم پرسیارانەم لێ کردیت: {هەست ناکەیت ئەو ڕستەیە زیاد لە پێویست تەقلیدییە؟ ئایا ڕستەیەکی وەک (خوێنەر دەبێت لەگەڵ خۆی و دەقدا ڕاستگۆ بێت) لە ڕەخنەدا جێگەیەکی هەیە؟ ڕەخنەی ئێمە لەوەتەی هەیە ئەمەی نەگوتووە؟ ئایا ئەمە تێڕوانینی تیۆلۆگییانە نییە بۆ خوێنەر و تێکست، کە لە ماوەی ئەو سەدەیەدا ڕەخنەگران، ئەوانەی تۆ لە گوتارەکانتدا ئاماژەت بە ناوی هەندێکیان داوە، ویستوویانە تێی بپەڕێنن؟ حەز دەکەیت لەو بارەیەوە گفتوگۆ بکەین؟}. ئێستایش دەپرسم ئایا ئەو شتانەی تۆ لەبارەی ئەو کتێبەوە گوتووتن، کەسێکی تر، کە دوور و نزیک پێوەندیی بە دنیای نووسینەوە نەبێت، ناتوانێت بیان نووسێت؟ وەک لەو نامەیەدا پێم گوتوویت، ئەو نووسەرانەی تر، کە لەو تەوەرەیەدا لەگەڵت بەشدارن، جیاواز لە تۆ لەبارەی هەمان کتێبەوە دواون. (بە

گوتەی تۆ بێت، ئەو کتێبە ئاستێکی بەرزی نییە، لە کاتێکدا ئەوانەی تر بۆچوونی جیاوازیان هەیە).

کام لەوانەی لەبارەی بەرهەمی منەوە نووسیویانە، قسەیەکی نزیک لەمەی گوتووە؟

هەر لە گوتاری یەکەمتدا نووسیوتە: (سالینجەر) و (خوان رۆلفۆ) وازیان هێناوە و ڕاگەیاندنیان نەنووسیوە.

ئەوە پێوەندیی بە خۆیانەوە هەیە. ئەوان وایان نەکردووە، بەڵام من وا دەکەم. ئەمە حەز و بڕیارە. وەک چۆن کەس ناتوانێت بە نووسەرێ بڵێ بۆ قاوە دەخۆیتەوە، نەوەک چا، بە هەمان شێوە ناتوانێت لێی بپرسێت بۆچی نانووسیت، بۆچی بەرهەم بڵاو ناکەیتەوە، بۆچی واز دەهێنیت، بۆچی ڕایدەگەیەنیت و زۆری تر. (بارت) لە گفتوگۆیەکدا ناوی دوو کۆمەڵ شت دەهێنێت، کە حەزی لە هەندێکیانە و حەزی لە هەندێکیان نییە. دواجار دەڵێت: (حەز دەکەم، یان حەز ناکەم، ئەمە لای کەسانی تر بایەخی نییە. ئەمە لە ڕوخساردا بێمانایە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوە مانای وایە جەستەی من جەستەی تۆ نییە).[211] (بارت) چەند ساڵ نەینووسی، چونکە نەخۆش بوو. یەک نووسەر نەهات بڵێ وا نییە، بەڵکوو هیچی پێ نەماوە... بەڵام کاتێ من خۆم بە نووسەری ئەدەبی گێڕانەوە بزانم و

---

[211] متاهات، (نصوص وحوارات في الفلسفة والادب)، رولان بارت: معنى ان تكون مثقفا، ترجمة: حسونه المصباحي، مراجعة: د. قدامة الملاح، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٩٠، ص٨٦

بەرهەمەکانم لاواز بن، دەکرێت بپرسیت ئایا فلان نووسەر لەم ئاستەی نووسیوە. ئێستا من لە تۆ دەپرسم: کام لەو نووسەرانەی ناوت هێناون، لەم ئاستەی زمانی تۆدا نووسیویەتی؟ کامەیان بە زمانی ڕۆژانە باسی چەمکی فەلسەفیی کردووە؟ پێشتریش زۆرم لێ پرسیویت. تۆ وەک ڕەخنەگرێک چەند گوتارت لەبارەی (سالینجەر) و (ڕۆلفۆ)وە نووسیوە؟ چەند لە بەرهەمەکانیانت بۆ زمانی کوردی وەرگێڕاون، تاکوو منیش نووسەری ئەدەبی سوودیان لێ ببینم؟

گوتووتە من بۆیە ڕاگەیاندنم بڵاو کردووەتەوە، تاکوو لەو ڕێگەیەوە خوێنەر بۆ خۆم ڕابکێشم. واتە ڕۆژگارێک دەگەڕێمەوە. ئەمە پێی دەگوترێت (شێروخەت)، کە پەنجای بە لای شێر و پەنجای بە لای خەتدایە. واتە هەر کەسێک یاریی شێروخەت بکات، ئەوا یان دەیباتەوە، یان دەدۆڕێت، کە سێیەمی نییە.

وەک لە سەرەتادا گوتم من سەر بەو تێگەیشتنە نیم، پێی وایە بڕیار هیی پیاوە و پیاویش نابێت لە قسەی خۆی پەشیمان ببێتەوە. لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە، لە یەکەم چیرۆکمەوە تاکوو ئەمڕۆ لە دژی ئەو تێگەیشتنەدا جەنگاوم. هەندێک فاکتەر وایان کرد واز لە بڵاوکردنەوە بهێنم، فاکتەرێکیش ئەوەتا بۆ ماوەیەکی کاتی گەڕاندمییەوە. دەشێ سبەی هەندێک

فاکتەری تریش بێنە پێشەوە و بە یەکجاری بمگەڕێننەوە. لە دوانزدە کتێب کەمترم نین بۆ بڵاوکردنەوە.

لە هەشتاکانەوە ئەوەم بیستووە، بگرە بووەتە گوتەیەکی سواو، کە هەر ڕۆشنبیرێک بە قەدەر خۆی کێشە دروست دەکات. کێشەکەی تۆ لەم گوتارەدا دروستت کردووە، ئەمەیە؟ یەکێک ناوی ئەو هەموو فیلۆسۆفەی هێنا بێت، شانازی بەوە دەکات لە شێروخەتدا بردوویەتییەوە، لە کاتێکدا هێشتا ئەنجامەکەیشی دەرنەکەوتووە؟ کەسێک لاپەڕەیەکی لە هەر کتێبێکی داهێنەرانەدا خوێندبێتەوە، بە لای باسی وادا دەچێت؟ نە خۆم ڕۆژێک لە ڕۆژان شانازیم بەوەوە کردووە، کە لە شێروخەتدا بردوومەتەوە و نە منداڵانی تری گەڕەکیش. ئەوپەڕی گوتوومانە بەختمان هەبوو. ئەرێ ئەمە شتە باست کردووە، تاکوو منیش بەم شێوەیە قسەی لێوە بکەم؟

گریمان پێشبینییەکەت دێتە دی و شێرەکە دەردەچێت. ئایا ئەمە هیچ پێوەندیی بە فیکری ڕەخنەییەوە هەیە؟ ئەمە یارییەکی زۆر تەقلیدیی دەجالەکانە و لە هەردووکمان دوورە. ئەوان بە خەڵکی ساکار دەڵێن چارەنووسی ئێوە لە ئاییندەدا ئاوا و ئاوا دەبێت. لەم دنیایە بەمە دەگەن و دوای مەرگیش واتان بەسەر دێت. ئینجا چونکە ئەو ئاییندەیە دیار نییە و کاتەکەی بێسنوورە، کەسیش دوای مردن ناگەڕێتەوە، بۆیە ناکرێت یەکێ لەوانە بە دەجالی خۆی بڵێت پێشبینییەکەی

کورتی هێناوە. مرۆڤی ڕەخنەگر چۆن خۆی بە یارییەکی واوە خەریک دەکات؟

لە نامەی تایبەتدا بەڵگەم پیشان داویت، کە ئەگەر تۆ نەبوویتایە، ئێستا ئەم پێوەندییە کزەیشم بە دنیای کەلتووریی کوردییەوە نەدەما، کە کۆمەڵێک ناوی جوان لە خۆی دەگرێت و خۆشم دەوێن. خۆزگە هەشت نۆ چەمکی ترت فڕێ دەدان و چەند گوتەیەکی دیکەی وەک (نووسەری ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەنووسێت، کە لێنەکانی بوون و ژیانی لە ڕێگەی نووسینەوە پڕ بکاتەوە)ت دەنووسین، لەگەڵ چوار پێنج گوتەی وەک ئەوەی بۆ (هایدیگەر)ت هەڵبەستووە: (من بڕوای تەواوم بەو تیۆرەی هایدگەر هەیە، کە مرۆڤ دەبیت بە نیگەرانییەوە بەردەوامی بە بوون و داهێنانەکانی خۆی بدات. مرۆڤ ئەگەر نائومێدی بیوەستێنێت ڕەنگە دواجار خۆکوشتن هەڵبژێریت)، بەڵام ئەمەت نەگوتبایە، چونکە وەک بینیمان توانیم لەسەر ئەوان بوەستم و بە زمانێکی تر بنووسم، لە کاتێکدا لەبارەی ئەمەیان تەنیا لەم ئاستەدا دەکرێت بێمە دەنگ. هیوادارم جاری داهاتوو بەم شتانە کاتی خوێنەر نەگرین. ئەگەر تۆ لێم بپرسیت نزمترین ئاستی نووسینەکەت لە کوێدایە، ئەوا خێرا دەست دەخەمە سەر ئەم شوێنە.

گوتووتە نامەکانی منت هەر سەیر نەکردوون. دەمەوێت لێرەدا یەک پرسیارت لێ بکەم: ئایا ئەو شتانەی من لەم نامانەدا بۆم نووسیویت، لە گوتارەکانتدا بە کارت نەهێناون؟ هەر بە ڕاستی سەیرت نەکردوون و نەتخوێندوونەتەوە؟ ئایا ئەمە سەیر نییە ڕەخنەگرێک شانازی بەوەوە بکات، کە نامەی نووسەرێکی ئەدەبی گێڕانەوەی سەیر نەکردووە؟ ئەرێ ئەوە چۆن لێک دەدەیتەوە، ڕەخنەگرێک وای پێشان داوە نووسینەکانی نووسەرێک لەو ئاستەدا نین، بیانخوێنێتەوە، کەچی لە ماوەی ساڵێکدا بە دوو گوتار هێرشی کردووەتە سەر؟ بۆ ئێمە خوێنەری وایشمان هەیە، کە ئەمەی بەسەردا تێدەپەڕێت؟ گوتووتە دەتتوانی وەڵام بدەیتەوە. چۆن دەتوانی وەڵامیان بدەیتەوە، ئەگەر نەتخوێندوونەتەوە؟ خۆیشت دەزانی من هەرگیز نەمگوتووە بە شێوە تەقلیدییەکەی وەڵامم بدەرەوە، بەڵکوو گوتوومە با گفتوگۆ لەبارەی ئەو چەمکانەوە بکەین، کە ناوت هێناون.

گوتووتە لەسەر پێشنیازی هاوڕێیەکت وەڵامی نامەکانمت نەداوەتەوە. ئایا تۆ لە سەرەتادا هەندێک وەڵامی زۆر لاوازت نەدانەوە و دوایی وەستایت؟ وەرە، ئەوەت لێ بووبێتە کێشەیەکی گەورە، کە خوێنەرێک هەیە لەبارەی ئەو گوتارانەتەوە پرسیارت لێ دەکات، گوتارت بۆ دەنووسێت و بە کۆمەڵێک سەرچاوی گرنگت دەناسێنێت، بە ڕادەیەک بچی بە

یەکێ لە هاوڕێکانت بڵێی، کە تووشی گرفتێکی وا بوویت، تاکوو ئەویش پێت بڵێ با بۆ خۆی هەر بڵێ، وەڵامی مەدەرەوە! دەبێ ئەوە کێ بێت و لە چ ئاستێکدا بێت! ئەو گوتەیەت وا دەکات خوێنەر بیری بۆ لای ئەو نووسەرانە بچێت، کە هاوڕێتن و لێتەوە نزیکن، بەڵام من خۆم کاری وا ناکەم. کەمێکیش سەختە عەقڵم وەریبگرێت نووسەر هەبێت قسەی وا بکات و بڵێ پرسیار گرنگ نییە، تەنانەت من وەک پێشتریش گوتم ئەمە بە قسەی تۆیش نازانم، بەڵکوو تەنیا ئەوەیە بۆ ئەوەی خۆت لەو هەڵوێستە ڕزگار بکەیت، کە پرسیارت لێ کراوە و وەڵامت نەداوەتەوە، ئەم چەند وشە ساکارەت نووسیون. (ئەمە هەر خوێندنەوەی خۆمە، دەنا حوکم نییە و دەشێ وا نەبێت).

گوتووتە بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندنی وازهێنانم دوو مانگ دوای بڵاوکردنەوەی کتێبی (ڕاگەردان) و (ڕێگەکانی ژەهر)ە، گوایە کاتێ زانیومە لەو دوو مانگەدا نەفرۆشراون، نائومێد بووم و وزام هێناوە. ئایا (ڕاگەردان) و (ڕێگەکانی ژەهر) پێکەوە دەرچوون؟ ئایا ماوەی نێوان دەرچوونی (ڕێگەکانی ژەهر) و بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندنەکەم لە دە ڕۆژ زیاترە؟ دەتەوێت چەند شایەتت بۆ بهێنم، کە سێ مانگ بەر لە بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندنەکە بە هاوڕێیانی خۆمم گوتووە واز دەهێنم؟ ئایا ئەگەر گوتاری ڕەخنەگرێک بە هێنانی شایەت پووچ ببێتەوە،

ئەو ڕەخنەگرە لە چ ئاستێکی زمان و تێگەیشتندا نووسیویەتی؟ ئایا پێنج ساڵ پێش ئەو ڕاگەیاندنە لە گوتارێکمدا باسی وازهێنانم نەکردووە؟ دەبێ ئەوەیش بگوترێت، لەو کاتەی دەمویست ڕاگەیاندنەکە بڵاو بکەمەوە، شتێک هاتە پێشەوە، کە گفتوگۆ بوو لەبارەی بابەتێکەوە لەگەڵ هاوڕێیەکمدا، بۆیە لانی کەم حەفتەیەک دوا کەوت. خۆشبەختانە هاوڕێکەم لە ژیاندا ماوە.

ئەم چەند وشەیەیش لێرەدا بە پێویست دەزانم:

بە گشتی ڕەخنەگری میللی لەسەر شێوازی حزبەکان خوێنەری وەک جەماوەر بەسەر چەند بەرەیەک دابەش کردووە، کە ئەوانە هەر بە ڕاستی ڕقیان لە یەکترە و ئەو ڕقە بە نووسینیانەوە دیارە. تۆ کاتێ مێژووی فەلسەفە دەخوێنیتەوە، کە پڕە لە جیاوازی، بەڵام هیچ کاتێ هەست بەو ڕقە ناکەیت. (پلاتۆن) و (ئەریستۆ) لە خاڵە سەرەکییەکانی فەلسەفە لە یەکتر جیاوازن، بەڵام فیلۆسۆف و ڕەخنەگرانی تر بە درێژاییی مێژووی فەلسەفە بە بایەخەوە لە هەردووکیانیان ڕوانیوە. (مارکس) و (نیتشە) چەند دژی یەکن، (لەگەڵ پارێزم بۆ وشەی دژ)، کەچی بە خۆشەویستی هەردووکیان دەخوێنیتەوە. (فۆکۆ) و (هابرماس) چەند لە یەک جیاوازن،

بەڵام بەرهەمی هەر کامیان دەخوێنیتەوە، هەست بە گەورەیی ژیان دەکەیت و بۆچوونەکانیان بە گرنگ دەزانیت. ئەو هەستەت لا دروست نابێت کامیان لە کامیان گەورەترە. لە دنیای کوردیدا شتەکە تەواو پێچەوانەیە. هەرگیز دیوتە (هابرماس) بۆ ئەوەی (فۆکۆ) بشکێنێت، بڵێ بەزیوە، خراپە، نازانم چییە؟ (پۆل ریکۆر) لە (ئایدیۆلۆجیا و یۆتۆپیا)دا ڕەخنەی لە زۆر نووسەر گرتووە، تەنانەت نازانی ڕەخنەیە، چونکە هێرش نییە و ڕق هەر بە تەواوی تێیدا ونە. هەندێک لەو نووسەرانەی ناویان لە لیستی چاکەدا نووسراوە، ئەو لیستەی ڕەخنەگری میللی بۆ نووسەرانی کردووە، کە کێ باشە و کێ خراپ، ئەوا نەک هەر بەو دابەشکردنە ڕازین، بەڵکوو بەرگرییش لەو جۆرە ڕەخنەگرە دەکەن. ئەوانە تەنیا کاتێ بە ئاگا دێنەوە، کە بەر خۆیان دەکەوێت. هەیانە ناتوانێت لەم ڕووەوە چەند دێڕێک بنووسێت، تاکوو لانی کەم بەرگری لە خۆی بکات. ئەمە بۆیە دەڵێم، چونکە نووسینیانم خوێندووەتەوە و دەزانم لە چ ئاستێکدان. ئەرێ ئەوە چ نووسەرێکە دڵی بەوە خۆشە ڕەخنەگری میللی بەو زمان و تێگەیشتنە چەند وشەیەکی لەبارەی بەرهەمەکانیەوە نووسیوە و پێی گوتووە داهێنەرە؟ هاوکاتیش بەوە دڵخۆشە بە نووسەرێکی تری گوتووە هیچ نییە؟ (ئەمەیش هەر بە گشتی دەڵێم، دەنا نە لەگەڵ تۆمە و نە لەگەڵ هیچ کەسێکی تری دیاریکراو، بەڵکوو دیاردەیەکە و هەیە)

پرسیار و بەدواداچوونی تریشم هەن، بەڵام با هێندە بەس بێت. ئەگەر لەسەر هەموو شتێکی ئەو دوو گوتارەتدا نەوەستاوم، مانای وا نییە شتێکی لەوانە گرنگتریان تێدایە. ئەگەر تۆ خۆت پێت وایە شتی گرنگ لەو دوو گوتارەتدا هەن، دەتوانیت بۆمیان دەستنیشان بکەیت، تاکوو بە خۆشحاڵییەوە گفتوگۆیان لەبارەوە بکەم؟ ئەگەر هەر کەسێکی تریش هەیە و باوەڕی وایە لەم دوو گوتارەدا بەر شتێکی گرنگ و نوێ کەوتووە، بگرە ئەگەر وا دەزانێت خوێنەری زۆر ساکاریش ناتوانێت ئەمانە بنووسێت، با بێت ئاگادارم بکاتەوە. هەردوو گوتارەکەت کورتن و ڕەنگە بگەنە دوو هەزار وشە، لە کاتێکدا من ئەم نامەیەم لەبارەیانەوە نووسی. بێگومان ئەگەر تۆ بێیت و ئەوانەی من ورد بکەیتەوە، زیاترت دەوێت. واتە نووسینی داهاتووی تۆ لەبارەی ئەم نووسینەی منەوە، وا دەخوازێت قەبارەکەی گەورەتر بێت، کە لە ئێستاوە من بەوە خۆشحاڵ دەبم.

# پێداگرتنەوەی زیاتر لەسەر دایەلۆگ

کاک ئارام سدیقی ئازیز!

دیسان دەیڵێمەوە: بە خۆشحاڵییەوە هەر وشەیەکت دەخوێنمەوە، کە لەبارەی ئەم نووسینەمەوە دەینووسیت. ئەوەیش دەڵێمەوە: ئەگەر هەندێجار تۆنی ڕەق لەناو زمانمدا بە دی دەکەیت، ئەوە توورەبوونەکە ئاڕاستەیە بۆ بابەتەکە، نەوەک بۆ خودی خۆت، لە کاتێکدا تۆ لام ئازیزیت و بریتی نییت لەم دوو گوتارە. ئەگەر تۆیش هەمان شت لە بەرانبەر ئەم نووسینەی مندا بکەیت، بە سنگی فراوانەوە لێت وەردەگرم، بە مەرجێ نموونەی لێ بهێنیتەوە و بە ئارگیۆمێنتەوە قسەی خۆتی لەبارەوە بکەیت. ئەوانەی لە نزیکەوە دەمناسن، دەزانن، کە لە ئاستی بەرهەمەکانی خۆیشمدا ڕەقم. نە ئەوەی من گوتوومە، پیرۆزە و کۆتاییە، نە ئەوەی تۆیش دەیڵێت. ئەمڕۆ لە پرسیاری من خۆت بدزیتەوە، سبەی ناتوانیت لە پرسیاری خوێنەری تر ڕا بکەیت. باوەڕم وایە لەمەودوا هەر نووسەرێکی داهێنەر بەم شێوازە هێرشی بکرێتە سەر، بە پرسیار ڕووبەڕووی ڕەخنەگرەکە دەبێتەوە. هەموو ئەوانەی نووسیونی، ڕستە بە ڕستە وەریاندەگرێت و لە شێوەی پرسیار دایاندەڕێژێتەوە. دەپرسێت: ئەمە مانای

چییە؟ مەبەستت لەمە چییە؟ دەتوانی لەم ڕووەوە زیاترم بۆ بنووسیت؟ دەکرێت بزانم سەرچاوەکەی لە کوێیە؟ ئەو فیلۆسۆفەی ناوت هێناوە، لە چ کتێبێکدا وای گوتووە؟ دەتوانیت کەمێکم لەبارەی ئەو کتێبەوە بۆ بنووسیت؟ و هیی تریش.

ئایا ڕێی تێ ناچێت لەدوای بڵاوبوونەوەی ئەم نامەیەوە ڕەخنەگری میللی سڵ لەوە بکاتەوە هێندە ناوی فیلۆسۆفان بهێنێت و بە ئارەزووی خۆی چەمک فڕێ بدات، کە ئەمە دەبێت تۆ لەپێش منەوە پێی خۆشحاڵ بیت، بەوەی ئەم نامەیە بەرهەمی هاوبەشی هەردووکمانە.

دیارە ئەمە ئەو ڕەخنەگرە میللییانە ناگرێتەوە، کە نانیان بەو شێوازی نووسینەوە بەندە و ناتوانن بەبێ ئەو گوتانە گوتارێکی کورتیش بنووسن. ئەو ڕەخنەگرە میللییانە ناگرێتەوە، کە سوور دەزانن ئەوەی دەیڵێن، هەمان قسەی خەڵکی گەڕەکیانە و گوێی نادەنێ، بەڵام تۆ بڵێی لەمەودوا بەشێک لە خوێنەرە ساکارەکانیشیان وەک جاران گوێیان لێ بگرن، بێ ئەوەی لێیان بپرسن ئەم زمانەتان بۆ ئاوا لاوازە و ئەو گوتانەتان لەبەرچی هەمان گوتەی خۆمانن؟ تۆ بڵێی ئیتر

دەستگە چاپەمەنییە ئاستنزمەکانیش کتێبیان بۆ چاپ بکەن؟(212)

هیوادارم تۆ لەو ڕەخنەگرانە نەبیت، یان لانی کەم لەدوای ئەم دایەلۆگەوە ئەو ئاستە جێ بهێڵیت و گوتاری لەم شێوەیەت نەخوێنمەوە.

ئەگەر وا بزانیت من باوەڕم وایە تۆ هەر لەم ئاستەی ئێستاتدا دەمێنیتەوە، ئەوە بە هەڵەدا دەچیت. دیارە ئەگەر وا بکەم، ئەوە ڕەگەزێکی گرنگم پشتگوێ خستووە، کە زەمەنە. ئەگەر وا بزانیت من پێم وایە توانای تۆ هەر لەو دوو گوتارەتدا کورت دەبێتەوە، دیسان بە هەڵەدا دەچیت. تۆ بەرهەمی لەوانە جیاوازت هەن، بەڵام ئەمانە ڕاستەوخۆ بەر بوونی من کەوتن، بۆیە بە دایەلۆگ ڕووبەڕوویان بوومەوە. سەرەتا گوتم و ئێستایش دەیڵێمەوە:

---

[212] مەبەستم ئەو دەستگە چاپەمەنییانە نییە، کە هەتاکوو ئێستا بەسەریاندا تێپەڕیوە، چونکوو من خۆم دەزانم زمان زۆر فریودەرە. کاتێ هەستی پێ دەکەیت، کە بە ئازارەوە لەسەری دەوەستیت. لەم ڕووەوە ئەزموونێکم هەیە. وەک پێشتر گوتم ڕۆژگارێک فریوم خواردووە و دواتر بە ئاگا هاتوومەتەوە. ئەمانە تەنیا پرسیارن، دەنا من خۆم یەک دەنک لە بڵاوبوونەوەیان ترسم نییە و لەگەڵ ئەوەدا نیم ڕێگەیان لێ بگیرێت، بەڵکوو لەگەڵ ئەوەدام دەستگە چاپەمەنییەکان کاتێ کتێبی لەم شێوەیەیان بۆ دێت، لەبارەی ناوەرۆکیانەوە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو نووسەرانەدا بکەن. بەهەرحاڵ من هەر بەم مێتۆدە ڕووبەڕوویان دەبمەوە. وەک گوترا پێویستە بەوە ئاسوودە بیت، کاتێ ئەم بەرهەمە هاوبەشەمان کاریگەریی وا بە جێ دەهێڵێت.

لەبارەی ئاییندەتەوە هیچ پێشبینییەکی خراپم نییە، بگرە بە پێچەوانەوە هیوادارم ئەم بابەتەم ببێتە هۆی ڕاچڵەکاندنت، کە ئەوەی هێزمان دەداتێ، وەک لە پێشەکییەکەدا گوترا ئەو ڕاچڵەکاندنەیە. من ئێستا هێندەی تۆ پێویستم بەوەیە بە ڕوانین و تێگەیشتنی خۆمدا بچمەوە و هەوڵی تێپەڕاندنیان بدەم. مەبەستم ئەوەیە ئەم سەرنجانەم تەنیا ئاڕاستەی تۆ نین، بەڵکوو ئاڕاستەی خۆیشمن. با بڵێین پێشتر تۆم نەناسیوە، بەڵکوو هەر لەو ڕۆژەوە، کە ئەم نووسینەم دەست پێ کردووە، دەتناسم. کەواتە تۆ ماوەی یەک دوو مانگە هاوڕێی منیت. تۆ ئەو کەسەیت بە درێژاییی ئەم نووسینە لە هەر کەسێکی دیکە زیاتر بیرم لێ کردوویتیەوە، بۆیە ناکرێت هەستێکی ناخۆشم لە ئاستتدا هەبێت. بەوەدا لە من گەنجتریت، شەپقەکەم دادەگرم و دەست دەخەمە ناو دەستتەوە، بگرە بە گەرمی دەیگوشم. خۆ ئەگەر هاوزام، یان بەتەمەنتریش بوویتایە، هەر وام دەکرد. هیوای ژیانێکی جوانترت بۆ دەخوازم. لات ڕوون بێت ئەوەی یەکەم کەس خۆشحاڵ دەبێت، کاتێ ئەم ئاستەت تێ دەپەڕێنیت، منم. ئەگەر لەم ڕووەوە پێویستت بە هەر کۆمەکییەکم هەیە، بە خۆشحاڵییەوە ئامادەم. با تۆ یەکێک بیت لەوانەی کەلتووری دایەلۆگیان هێناوەتە ناو دنیای بێدایەلۆگمانەوە! دواجار تۆ وا دەبینم لە من جیاوازیت، کە ئەمەیش بە گرنگ دەزانم، چونکە لە ڕێگەی تۆوە هەست بەو جیاوازییەی خۆم دەکەم، بگرە چێژی لێ

دەبینم. تۆ لای من گرنگیت، مادام بەشێکیت لەم دایەلۆگە. ئایا خۆیشت لای خۆت هەر وایت؟ ئایا خۆت بە بەشێک لەم دایەلۆگە دەزانیت؟

هەر لەناو ئەو بازنەیەدا دەپرسم: ئایا هەر پرسیارێک، کە لەلایەن ئەوەی ترەوە ئاڕاستەت دەکرێت، ڕاستەوخۆ بەر (بوون)ت ناکەوێت، بەوەی ئەوە (بوون)ی تۆیە ئەو پرسیارەی ورووژاندووە؟ ئایا بایەخدانت بەو پرسیارە، مانای بایەخدانت نییە بە (بوون)ی خۆت؟

لێرەدا نامەوێت وای لێک بدەیتەوە، کە دەمەوێت ناچارت بکەم دایەلۆگ بکەیت. بەر لە هەرچی تۆ بەوەدا پێشتر قسەی خۆتت کردووە و ئەم نووسینەی من بە پلەی یەکەم لەبارەی دوو گوتارتەوەیە، ئەوا تۆ بەشێکی لەم دایەلۆگە، بگرە دەستپێشخەری ئەم دایەلۆگەیت، هەتا ئەگەر نەشتەوێت بەردەوام بیت. ڕوونتر بڵێم من ئەوەی تۆم بە ئاڕاستەی دایەلۆگدا بردووە، ئەگەرچی لە بنەڕەتەوە بە مەبەستی سڕینەوە نووسراوە. ئەمەمان لانی کەم لای (باختین)دا پێشان دا، کە پێی وایە هەر کاتێ دوو دەنگ هەن، ئەوا دایەلۆگ بوونی هەیە. بەکورتی لەناو هەر دەستەواژە و وشەیەکدا دوو دەنگ بەر یەکتر بکەون، قووڵاییی ئەوانە دەردەکەوێت.

پێ لەسەر ئەوەیش دادەگرم، کە بێدەنگبوونت لە ئاستی ئەم نووسینەمدا، هەرگیز وا لێک نادەمەوە، کە توانای دایەلۆگت نییە، بەوەیِ پێشتر هەر لەم نووسینەدا لانی کەم لای (هایدیگەر) و (ڤیتگینشتاین)دا بینیمان، کە ناکرێت وا لە بێدەنگی بڕوانین نەگوتنی شتە.... ئەگەر بێیت تەنیا لەبارەی ئەو شتانەی نووسیومن، پرسیار بکەیت، بێ ئەوەی هیچیش بڵێیت، هەر بە دایەلۆگی دەزانم و بایەخی گەورەی پێ دەدەم، بەڵام وەڵامدانەوەت بە شێوازی تر، واتە دوورکەوتنەوەت لە ناوەرۆکی بابەتەکە، لای من خوێندنەوەی تری بۆ دەکرێت. باوەڕم وایە لای خوێنەری پرسیارکەری یاخییش ئەو خوێندنەوەیە بە دەست بێت. ڕوونتر بڵێم، کاتێ لەبارەی ئەو بۆچوونانەمەوە نادوێیت و نموونەیان لێ ناهێنیتەوە، بەڵکوو تەنیا خۆت بە هەندێک شتی لاوەکییەوە خەریک دەکەیت، ئەودەم ناتوانم وەک تێپەڕاندن لێی بڕوانم، بەڵکوو وای دادەنێم گەڕانەوەیە بۆ هەمان دۆخی خۆت، کە ڕێگە بە خۆم نادەم بڵێم تۆ ئەو شێوازە ئاسانەیان هەڵدەبژێریت. وەک گوترا لەو نووسەرانە نیم، بڕیار لەسەر ئاییندەی ئەوانەی تر دەدەن، بگرە هەر بڕیاردان بە گشتی و بە هەموو شێوەیەک لە من دوورە. باوەڕیش ناکەم پێویستت بەوە بێت بۆ ئەو دۆخە بگەڕێیتەوە، لە کاتێکدا من ئامادەم بە دڵی فراوانەوە هەر بۆچوونێکت لێ وەربگرم و گفتوگۆی لەبارەوە بکەم، وەک لەم نووسینەدا بینیت.

کاک ئارام سدیقی ئازیز! لێرەدا یەک خاڵی تر بە گرنگ دەزانم، کە ئەویش، ئەوەیە، هیوادارم کاتێ دەگەیتە ئەو باوەڕەی ئەم دایەلۆگە بکەیت، یان بە پێویستی بزانیت هەر سەرنجێک لەو بارەیەوە بنووسیت، ئەوە ڕێت لێ نەگرێت، کە بە منت گوتووە موفلیس، یان هەر شتێکی تری لەم بابەتە. هیوام وایە نەڵێیت: (ئاخۆ چیم پێ دەگوترێت، ئەگەر بزانن نووسینی ئەو کەسەم خوێندووەتەوە و لەگەڵیدا کەوتوومەتە گفتوگۆ، یان سەرنج لەبارەی نووسینەکەیەوە دەنووسم!).

من لای خۆمەوە نەک هەر ئەوە ناڵێم، بەڵکوو بە گەرمی دەستەکانت دەگوشم. باوەڕم وایە هەر خوێنەرێکیش، کە گیانی کرانەوە و تێپەڕاندنی هەیە، ئەمەت بۆ لەسەر جوانی حیساب بکات. وەک زۆربەی فیلۆسۆفان لە (پلاتۆن)ەوە بۆ (هیگڵ) و لەوێوە تاکوو (هابرماس)، بگرە دواتریش، پێیان وایە شتێک نییە گەورەتر لە هێزی گفتوگۆ. هیچ بڕیارێک بە خاڵی کۆتایی دانانرێت، بەڵکوو هەر هەموویان بۆ ئەوەن دەستکاری بکرێن و هەڵبوەشێنرێنەوە، بەوانەی تۆ و منیشەوە.

ئەوەی لەبارەمەوە گوتووتە، تاوان نییە، بەڵکوو لە چوارچێوەی تێگەیشتنی خۆتدا دەرتبڕیوە. دڵنیا بە وەک لە پێشەکییەکەدا گوتوومە ئەوە نەک هێزی لێ نەبڕیم، بەڵکوو وزەی گەورەیشی پێ دام. منیش لێرەدا هەر لەو چوارچێوەیەدا قسەم لەبارەی ئەوەی تۆوە کردووە. لە نامەی تایبەتیشدا وام پێ

گوتوویت. ئایا ناکرێت ئەم چوارچێوەیە تێک بشکێت و ئەوەی ناویشی بگۆڕێت؟ واتە ناکرێت تێگەیشتنێکی تر شوێنی ئەو تێگەیشتنەی پێشوو بگرێتەوە؟ هیچ تێگەیشتنێک نە تەواوە و نە کۆتاییشە، بەوانەی تۆ و منیشەوە، بۆیە پێم وایە ئەوەی بە زیندوویی دەمێنێتەوە، تەنیا ئەو پرۆسەسی تێکشکاندنەیە. تێکشکاندنی تێگەیشتنێک، کە ئێستا هەیە، بە مەبەستی دامەزراندنی تێگەیشتنێکی تری نوێ، بەڵام بۆ دەستپێوەگرتن نا، بەڵکوو بۆ تێکشکاندنی ئەویش و ئەوانەی دواتریش بێکۆتایی. ئەوەی ئەو پرۆسەسە دەپارێزێت و بەردەوامیی پێ دەدات، تەنیا دایەلۆگە.

سەرجەم داهێنانەکان بەرهەمی دایەلۆگن. کوا هێزی یەکێ لەو گوتارانەی لە سەرەتای حەفتاکانەوە تاکوو ئەمڕۆ، کە لە ڕێگەی دایەلۆگەوە بەرهەم نەهاتوون، بەڵکوو بە مەبەستی سڕینەوە و بڕیاردان نووسراون؟ ئەگەر ئەوانە لە ساتی خۆیشیاندا سەرنجی هەندێک خوێنەری ساکاریان ڕاکێشا بێت، ئەوا دواتر تێکەڵی زمانی ڕۆژانەی خەڵک بوونەتەوە و نەماون. ئایا ئێمە دەتوانین ئەمڕۆ بۆیان بگەڕێینەوە و شتی نوێیان لەسەر هەڵبچنین؟ ئەوە چییە وای کردووە ئێمە تا ئەم ساتەیش بۆ فەلسەفەی یۆنانی بگەڕێینەوە، کە چەند سەدەی بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام نەتوانین بەشێکی زۆری ئەو گوتارانەی بۆ نموونە دوو ساڵ لەمەوبەر، کە بە پێوەری چاکە

و خراپە، یان با بڵێین بە مەبەستی سڕینەوە نووسراون، بخوێنینەوە؟ بەکورتی مردووە هەر گیانێک، کە دایەلۆگی تێدا نییە. تۆ و من، مادام بواری گفتوگۆمان هەیە، بۆ لە دەست خۆمانی بدەین؟

دایەلۆگ ئاستی تێگەیشتن و زمانمان بەرز دەکاتەوە، چونکە ئەو پرۆسەسە بەسەرماندا دەسەپێنێت هەتا بێت زیاتر لەسەر خاڵە جەوهەرییەکان بوەستین و لاوەکییەکان بە لاوە بنێین. دەکرێت هەرگیز ڕێک نەکەوین، بەڵام کاتێ هەر یەکەمان لە دیدی خۆیەوە شتی نوێتر لەبارەی ئەو چەمکانەوە بڵێت، مانای وایە پرۆسەسەکەمان بە زیندوویی ڕاگرتوە و جیاوازییەکان دەرکەوتوون، کە ئەمە لە ئێستاوە لای من بایەخی گەورەی هەیە و بە خۆشحاڵییەوە ئامادەی دایەلۆگێکی وام. تۆ دەڵێیت چی؟ بێگومان کاتێ دەڵێم دایەلۆگ، مەرج نییە هەر ڕاستەوخۆ بێت، بەڵکوو لەناو هەر گوتارێکیشماندا، کە لەبارەی هەر چەمکێکەوە دەینووسین، دەکرێت دایەلۆگ بهێنینە بوون، هەتا ئەگەر ناوی یەک کەسمان نەهێنابێت، کە فیکری سەرجەم فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزان دایەلۆگییە، وەک لانی کەم لای (هایدیگەر) و (گادامێر)دا پێشانمان دا، بەڵام هەندێجار وا پێویست دەکات بە شێوەی ڕاستەوخۆ ئەو دایەلۆگە بکرێت، وەک ئەوەی ئێستا لەنێوان تۆ و مندا هەیە. باسێکت

لەبارەمەوە دەست پێ کردووە و بەم شێوەیە درێژەم پێی داوە، کە ئەوەتا نۆرەت هاتووەتەوە.

گوتمان دایەلۆگ بەسەرماندا دەسەپێنێت هەتا بێت زیاتر لەسەر خاڵە جەوهەرییەکان بوەستین و لاوەکییەکان بە لاوە بنێین، بۆیە نووسینی داهاتووت، ئەگەر هەر ڕێگەیەک بگرێت، ئەوا پێویستە لەو شتانە دوور بکەوێتەوە، کە لێرەدا تێمان پەڕاندوون.

پێم وایە ئەو بابەتانەی لێرەدا ماون یەکلا بکرێنەوە، دیارن، کە دەتوانم بڵێم گرنگترینیان بایەخی پرسیارە: ئاخۆ تۆ هێشتا پێت وایە پرسیار بەو شێوەیەیە، لە گوتارەکەتدا باست کردووە، یان جیاوازە؟ ئینجا گوتەکەی (هایدیگەر)، کە ئایا هیی ئەوە، یان نا؟ ئەگەر هیی ئەوە، لە چ کتێبێکی وەرگیراوە؟ دەکرێت هەندێکی تر لەو بارەیەوە بنووسیت؟ گوتەکانی خۆت، لەوانە (نووسەری ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەنووسێت، کە لێنەکانی بوون و ژیانی لە ڕێگەی نووسینەوە پڕ بکاتەوە). مەبەستت چییە و چۆنی لێک دەدەیتەوە؟ لەم ڕووەوە چەند لەگەڵ بۆچوونی من ناکۆکیت، کە لەم نووسینەدا دەرمخستووە؟ هەروەها قسەکردن لەبارەی ئەو پرسیارانەی لێرە و لەوێ ئاڕاستەت کراون. دیارە دەتوانیت دەست بخەیتە سەر هەر چەمکێک، هەر وشەیەک، هەر ڕستە و هەر پەرەگرافێکی ئەم نووسینەم، چ بە مەبەستی پرسیارکردن و چ بە مەبەستی ڕەخنەگرتن. ئامادەم

بەوپەڕی ئارامی و دڵفراوانییەوە لەبارەی ئەمانە و زۆری تریشەوە گفتوگۆت لەگەڵ بکەم، بە تایبەتی دوای ئەوەی زانیم ئەم جۆرە گفتوگۆیە کاریگەریی هەیە، لە کاتێکدا سەرەتا دەترسام وا نەکەویتەوە. لە دڵەوە دەڵێم ئێستا زۆر چێژی لێ دەبینم.

لە تێکڕای ئەم نووسینەدا، یان لە کۆی ئەم دایەلۆگەدا دەمەوێت بەوە بگەم: تۆ من نییت و من تۆ نیم. ئەمە هەموو شتەکەیە. پێت وا نییە جیاوازی گرنگە؟ من لەدوای ئەم دایەلۆگەوە هەرگیز ئەوەی پێشوو نیم، بەڵکوو کەسێکی تری جیاوازم، کە وەک پێشتر گوترا بەشێکی هۆکارەکەی بۆ ئەو دوو گوتارەت دەگەڕێنمەوە. ئەوان منیان هێنایە دەنگ و بۆ ئەم دایەلۆگەیان ڕاکێشام. ئایا تۆ هەمان ئەوەی جارانیت، یان جیاوازیت؟ تۆ دەتەوێت لە کۆی ئەم نووسینەدا بە کوێ بگەیت؟ ئەو دوو گوتارەت ئەمەیان بە من نووسی و بەم ئاستەیان گەیاندم، ئایا ئەم نووسینەم هێندەی ئەو دوو گوتارەت هێزی هەیە، بۆ ئەوەت پاڵ پێوە بنێت ئەم ئاستەم تێ بپەڕێنیت؟ دەتوانیت خۆت و منیش بە ئاستێک بگەیەنیت، جیاواز بێت لەوەی تاکوو ئێستا پێی گەیشتووین؟

**لێرەوە خۆشەویستیت بۆ دەنێرم، کە لەوە زیاتریشم نییە.**

**کاروان کاکەسوور**

# پاشکۆ

له کاتێکدا وا ئەم بەرهەمە بۆ چاپ دەنێرم، هەر لەلایەن ئەو هاورێیەی دوو گوتارەکەی تۆی بۆ ناردووم، نامەی نووسەرێکی ئەدەبی گێڕانەوەیشم پێ دەگات، کە بۆ نووسەرێکی لاوی ناردووە و تێیدا بە هەمان زمان و تێگەیشتنی ئەم دوو گوتارەی تۆ باس لە چەمکی خەیاڵ و گێڕانەوە دەکات. لەوێدا بە دەرفەتی دەزانێت سەرجەم کارەکانی من بێنرخ پیشان بدات. ڕاستییەکەی نامەکە لە نێتدا بڵاو کراوەتەوە، بۆیە دەکرێت وەک هەر بابەتێکی تری گۆڤار و ڕۆژنامەکان بە شتی گشتی بزانرێت و سەرنجی لێ بدرێت. ئەمەی خوارەوە دەقی نامەکەیە:

**(سڵاو کاکە ....ی ئازیز! دەستەکانت خۆش بێ بۆ نووسینی رۆمانەکەت، لەڕاستیدا هەست دەکەم شێوازی نووسینی تۆ زۆر لە نووسینی کاروان کاکە سوورەوە نزیکە، هەردووکتان پڕن لە گێڕانەوەو خەیاڵ بە جۆرێک کە هەندێ جار زەحمەت بێت کۆکردنەوەیان و کردنیان بە تێکستی وەک**

ڕۆمان، بەڵکو دەتوانم بڵێم کە کاروان زۆر جار نووقسانییەکی گەورەی هەبوو لە بەستنەوەی ڕووداوەکانی ناو چیرۆک و ڕۆمانەکانی و زۆر بە زەحمەت دەسەلاتی بەسەردا دەشکا (بێگومان ئەمە ڕای منە)، بەڵام ئەوەی تۆ بەستنەوەی باشترە و لێرەوە زیاتر لای من جێگای دڵخۆشییە، بەڵام لەهەر دوو باردا ئەو لێشاوە لە خەیاڵ و گێڕانەوە ڕەنگە هەندێ جار زیان بە تێکستی گێڕانەوە بگەیێنێ، بێگومان ئەو ڕووداوانەی ناو مێژوو زیاتر پێمان دەڵێ کە ڕووداوەکان لەناو هەڵەبجەو ئەنفال دا دەدۆزینەوە وەک ئەوەی ناو ڕومانەکە پێمان بڵێ، مەبەستم ئەوەیە بڵێم کە ڕووداوێک هەیە لەناو مێژوودا کە حازر و ئامادەیە تۆ ئەو ڕووداوە دێنیتەوە کاراکتەرەکانی خۆتی تێ دەهاوێژی، دەبوایە لای من بە پێچەوانەوە بۆ ئەوەی زیانی زۆری بە تێکستەکە نەگەیاندبایە، بەهەر حاڵ من شێوازی نووسینی تۆم پێ خۆشەو هیوای بەردوامیت بۆ دەخوازم، پێم خۆش نییە هەر لە خۆمەوە وەک هەموو کەسانیتر موجامەلەی وشکت بکەم چونکە من هەست دەکەم ئەدەبی گێڕانەوە ئیشی هەموو کەسێ نییە هەتا بڵێی کارێکی جدییە، بەڵام یەکێ لەوانەی کە هەست دەکەم بۆ کارەکانی دەسووتێ تۆیت، تۆ یەکیکیت لەوانەی من دڵم پێیان خۆشە و ئەو متمانەیەم پێیتە، بۆیە هیوای بەردوامی بۆ تۆی ئازیز .

برات : ...).

ئەمە تێگەیشتنی نووسەرێکە، تەمەنی ئەزموونەکەی لە سی (٣٠) ساڵ تێپەڕیوە.

من دەمەوێت لێرەدا هەندێ پرسیاری لێ بکەم، بەو مەبەستەی زیاتر لەو بارەیەوە بۆمان بدوێت. ئەودەم پێم خۆشە گفتوگۆ لەبارەی ئەو چەمکانەوە بکەین. لێی دەپرسم مەبەستی لە (پڕن

له گێڕانەوەو خەیاڵ) چییە؟ دەتوانیت لەبارەی ئەم گوتەیەوە (نووقسانییەکی گەورەی هەبوو لە بەستنەوەی رووداوەکانی ناو چیرۆک و رۆمانەکانی و زۆر بە زەحمەت دەسەلاتی بەسەردا دەشکا)، هەندێکم بۆ بنووسیت؟ دەتوانیت نموونە بهێنیتەوە؟ چۆن نووسەرێک پڕ بێت لە (خەیاڵ و گێڕانەوە)، بەڵام لە پێکبەستنەوەی ڕووداوەکاندا دەستەوستانە؟ لەگەڵ پاریزی زۆرم بۆ ئەو ڕستەیە، کە خوێنەر ئەستەمە لە زمانی مندا بەر دەربڕینی وا بکەویت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەڵێم هیوادارم ئەو لەو بارەیەوە قسەی ترمان بۆ بکات.

ئەوە نەک هەر نوقستانی نییە، کە نووسەری ئەدەبی گێڕانەوە ڕووداوەکان بە یەکەوە نابەستێتەوە، یان با بڵێین بەو شێوەیەی ئەو لێی تێگەیشتووە، پێکەوەیان گرێ نادات، بگرە پێچەوانەکەی لاوازییە. ئەو نووسەرەی دەستەڵاتی بەسەر خەیاڵیدا دەشکێت و ڕووداوەکان پێکەوە دەبەستێتەوە، مانای وایە خەیاڵی هێشتا کاڵە و لە سنووری زمانی ڕۆژانە دەرنەچووە. دواتر بۆی دەگەڕێمەوە.

سەرەتا نووسیویەتی (شێوازی نووسینی تۆ زۆر لە نووسینی کاروان کاکە سوورەوە نزیکە)، کەچی دواتر دەڵێت: (بەڵام ئەوەی تۆ بەستنەوەی باشترە و لێرەوە زیاتر لای من جێگای دڵخۆشییە).

ئەمە چۆن لێک دەداتەوە؟ ئەگەر تەنیا بۆ ئەوەیەتی بەرهەمی من بێنرخ پیشان بدات، ئەوە شتێکی ترە، دەنا بووە نووسەرێک لاسایی نووسەرێکی تر بکاتەوە، بەڵام لەو باشتر بنووسێت؟ ئەگەر شێوازی لە هی من نزیکە، واتە هەوڵی داوە وەک من بنووسێت. خۆ ئەگەر شێوازەکەی دوورە، نەوەک نزیک لەوەی من، ئەوا ناومی بۆچی هێناوە؟ دیارە ڕۆمانەکەی ئەو نووسەرە لاوەم نەدیوە، بۆیە تۆمەتێکی وای ناخەمە پاڵ، بەڵکوو لەو نامەیەم وەرگرتووە، کە دەشێ هەر هیچی لەوەی من نەچێت، بەڵکوو بۆ ئەوە گوترابێت، تاکوو لەو ڕێگەیەوە ئەم هێرشە بکاتە سەرم و هاوکات ئەویش بشکێنێت. بەوە دڵی داوەتەوە، کە پێی گوتووە لە من چاکترە. ئەمە چ شێوازێکی نوێی دەربڕینە؟

لەبارەی سەرجەم نامەکەیەوە پرسیارم هەیە، بەڵام ئێستا تەنیا ئەمانەم بە پێویست زانین.

هێندەیش دەڵێم هەر کەسێ ئاگای هەم لە ئەلفوبێی فەلسەفە و هەم لە تیۆرییەکانی ئەدەبی گێڕانەوەی ئەم سەد ساڵەی ڕابوردوو بێت، دەزانێت ئەم شێوازی پێکبەستنەوەیەی ئەو باسی دەکات، کودەتای بەسەردا کراوە و نەماوە. ئەمە پێوەندیی بە ئەدەبی کلاسیکەوە هەبوو، کە لە (سەرەتا، ناوەڕاست و کۆتایی) پێک دەهات. واتە چیرۆک، یان ڕۆمان بە سەرەتایەکی دیار، یاخود لە خاڵێکی دیاریکراوەوە دەستی پێ

دەکرد، ئینجا دەگەیشتە مەبەستێکی دیاریکراو، کە خوێنەر چاوەڕێ بوو لە شوێنێکی دیاریکراویشدا کۆتاییی پێ بێت و هەر کۆتاییشی دەهات. ئەمەیش ئەوەی دەسەپاند هەموو ڕەگەزەکانی وەک کارەکتەر، ڕووداو، کات، شوێن، زمان و هیی دیکە هەم ڕوون بن و هەم سنووردار، بەڵام لەگەڵ بەرهەمەکانی (دۆیستۆیڤسکی) و دواتر لەگەڵ دەرکەوتنی (جۆیس)، (پرۆست)، (فۆکنەر)، (ولف) و ئەوانەی تردا قۆناغی نوێ لە ئەدەبی گێڕانەوەدا دەست پێ دەکات و تاکوو ئەمڕۆیش داهێنەران شتی نوێ دەخەنە سەر ئەم ئەزموونە. لەم نووسینەم لانی کەم لای (ئیکۆ)دا باس لەوە کراوە و پێشتریش لە گفتوگۆکانمدا بە وردی لێوەی دواوم. هەروەها لە نامیلکەیەکمدا، کە لەبارەی ڕۆمانی (کازینۆی منداڵان)ـەوەیە، بۆی گەڕاومەتەوە و وردتر لەسەر هەموو ئەمانەدا وەستاوم.([٢١٣])

لە ڕووی تیۆرییەوە ڕەخنەدۆزانی وەک (باختین)، (گۆڵدمان)، (بارت)، (تۆدۆرۆڤ)، (ریکۆر)، (جینێت) و زۆری تر ئەم ئەزموونە نوێیەیان گەورەتر کردووە، کە هەر لێرەدا ناوی هەندێکیان هاتوون. ئامادەم لەو بارەیەوە کاتێ گفتوگۆ دەکرێت، بۆیان بگەڕێمەوە. هەروەها ئەو هەوڵانەی لە بواری

---

[٢١٣] http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٥/٣/karwanKakaswr_ardalan.pdf

لینگویستیکیشدا دراون، خزمەتی گەورەیان بەو ئەزموونە کردووە، بۆیە هەموو ئەوانەی ویستوویانە لەو بارەیەوە بنووسن، پێویستیان بەوە بووە لە بواری زمانیشدا شارەزایی بە دەست بهێنن، لە کاتێکدا ئەو تیۆرییانە هەر لەناو فەلسەفەدا چاویان هەڵهێناوە. یەکێ ئاگای لەوانە بێت، باوەڕ ناکەم ڕێ بە خۆی بدات بەم شێوەیە لەبارەی خەیاڵ و گێڕانەوەوە بدوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بە خۆشحاڵییەوە گوێی لێ دەگرم، ئەگەر هەر شتێک بنووسێت.

لە شێوازی (پۆلیفۆنی)یەوە، کە (دۆیستۆیڤسکی) وەک ڕۆماننووس دایهێناوە و (باختین) لە ڕووی تیۆرییەوە گەشەی پێ داوە، کە دواتر دەگاتە لای زۆر ڕاڤەکاری دیکە و فراوانتر دەکرێت، ئەوا پێکبەستنەوەی زەق، وەک ئەوەی لە ئەدەبی کلاسیکدا هەبوو و ئەو نووسەرەی ئێمە بە زمانی میللی باسی دەکات، بە سەر چووە و شێوازی تری نوێ هاتوون. لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو فەلسەفانەی لە دژی سێنترالیزمدا وەستاونەتەوە، ئەم شێوازە کۆنە بە جارێ لە کەڵک کەوتووە، کە لەسەر پایەی دوالیسمی چاکە و خراپە، خێر و شەڕ دامەزراوە. لەم نووسینەدا بەشێک لەوانە باس کراون و ئامادەم ئەگەر پێویست بکات، هەر لەم بارەیەوە زیاتر بنووسم. ڕۆمانی نوێ کارەکتەری زۆر و جیاواز، ڕووداوی زۆر و جیاواز، کاتی زۆر و جیاواز، شوێنی زۆر و جیاواز،

بگرە هەموو شتێکی زۆر و جیاواز لە خۆی دەگرێت و ڕێگە نادات تەنیا یەک شت دەستەڵاتی ڕەهای هەبێت، بۆیە ئەو پێکبەستنەوەیە هەر ناتوانێت خۆی دەربخات. ڕەگەزەکانی وەک (سەرەتا، ناوەڕاست و کۆتایی) لە ئەدەبی فرەدەنگدا بەهایان نەماوە. تاقەسەرەتا و تاقەکۆتایی لە ئەدەبی نوێدا نەک هەر بە کار نایەن، بەڵکوو شەڕیان لە دژدا دەکرێت. هەر لەم نووسینەدا لانی کەم لای (هایدیگەر) و (گادامێر)دا پێشانمان دا، کە بە هۆی پێداگرتنیان لەسەر دایەلۆگ و کرانەوەدا، ئەو تێگەیشتنە ماڵئاوایی کرد، کە تەنیا یەک لۆژیک و یەک ڕێگەی دەناسی و ئەوانەی تری بە لاوە دەنا. کتێبەکەی (ئیکۆ) لەبارەی (جۆیس)ەوە بە تەنیا شۆڕشێکە بەسەر ئەو تێگەیشتنە لەکەڵککەوتووەدا، کە بە وردی لەسەری وەستاین.

لە کاتێکدا ئەو نووسەرەی ئێمە ئەم خاڵە بۆ من بە کەموکووڕی دەزانێت، گوایە ڕووداوەکان پێکەوە نابەستمەوە، ئەوا فەلسەفە لە (نیتشە)وە بۆ (هایدیگەر)، لەوێوە بۆ (فۆکۆ)، (دۆلۆز)، (درێدا) و ئەوانی تر، لە هەوڵی ئەوەدا بووە ئەو پێکبەستنەوەیە تێک بشکێنێت. هەر بۆ نموونە لای (فۆکۆ)دا بینیمان، کە چەمکی ئارکیۆلۆجی بە مانای کردنەوەی ئەو دیسکۆرسانەن، کە وا خۆیان دەردەخەن قەوارەی یەکگرتوو و چەسپاون. بەم شێوەیە دەیەوێت وشە و شت، دیسکۆرس و بابەت لە یەکتر بترازێنێت و بیانکاتەوە، لێرەوەیە نەک هەر

کۆمەڵێک چەمکی نوێ لە دایک دەبن، بەڵکوو چەمکە کۆنەکانیش مانای نوێ بە خۆیانەوە دەگرن.

مەگەر (دێریدا) بەشی هەرە زۆری تەمەنی بۆ کردنەوەی ئەو گرێیەی نووسەرەکەی ئێمە ناوی ناوە پێکبەستنەوە، تەرخان نەکرد، کە چ لەم نووسینەم و چ پێشتریش لێوەی دواوم؟ پێکبەستنەوە واتە زاڵکردنی یەک دەنگ و سڕینەوەی هەموو دەنگەکانی تر. سێنترالیزمی دەنگ یەکێکە لەوانەی، کە (دێریدا)دا بە (phonocentrism) ناوی دەبات و بە توندی ڕووبەڕووی دەبێتەوە، چونکە ئەمە لەسەر دوالیسمێکدا وەستاوە، پێی وایە دەنگ و ئاوخاوتن دەکەونە سەرووی نووسینەوە. وەک پێشتر بینیمان (نووسین) لای ئەو فیلۆسۆفەدا مانای جیاوازییە و توانای هەیە بەگژ دوالیسمەکاندا بچێتەوە. لەو ڕێگەیەوە دەستەڵاتی ئەو تاقە کەناڵە ناهێڵێت و ڕێگە بە دەرکەوتنی کەناڵی تر دەدات. نووسەرانی ئەدەب لە ماوەی ئەو سەد ساڵەی ڕابوردوودا شانبەشانی فیلۆسۆفان بەگژ ئەو پێکبەستنەوەیەدا چوونەتەوە و لە دەستەڵاتیان کەم کردووەتەوە، بەوەی ئەدەبی فرەدەنگ و فرەکەناڵیان داهێناوە، کەچی نووسەری ئەم نامەیە نەک هەر ویستی تێکشکاندنی سێنتراڵیسمی نییە، بەڵکوو ناڕەزایی دەردەبڕێت، کە ئەوانەی تر هەوڵیان داوە تێکی بشکێنن.

ئەوەی ئەو نووسەرە دەیەوێت، هێندە ئاسانە، نەبێتەوە، بگرە مێژووی چیرۆکی کوردی بەوە دەستی پێ کردووە و دواتر لای چیرۆکنووسە داهێنەرەکان تێک شکێنراوە. نووسەرە تەقلیدییەکانی ئێمە بە گشتی دەستیان بەو پێکبەستنەوەیەوە گرتووە و هەتا ئەمڕۆیش بەریان نەداوە. نایشارمەوە منیش هەر لە سەرەتای دەستپێکردنمەوە ئەو توانایەم نەبوو، کە پێوەندیی نێوان ڕووداوەکان بپچڕێنم، بەڵکوو دواتر پێی گەیشتم. ڕەنگە خوێنەر لە کۆمەڵەچیرۆکی (سەدەی یەکەمی خەیاڵ) و هەندێک تێکستی (ڕاگەردان)دا ئەو جیاوازییەی سەرەتا و دواترم ببینێت.

هیوادارم خوێنەر جارێکی تر بۆ ئەو شوێنانەی ئەم نووسینەم بگەڕێتەوە، کە باس لە دایەلۆگ و کرانەوەیی دەکەن، بەو مەبەستەی بزانێت بۆچوونی نووسەری ئەو نامەیە لە کوێی ئەوانەدایە.

ئەگەر من ئەو ئەلفوبێیە دەزانم، هونەرێکی گەورە نییە، بەڵام نەهامەتییە نەیزانم و خۆمم لا داهێنەر بێت. نەهامەتییە نەیزانم و وا لەوانەی تریش بڕوانم داهێنەر نین.

ڕووداوەکانی من پێوەندییان پێکەوە هەیە و پێشتر لەو نامیلکەیەدا بە وردی پیشانم داوە، بەڵام بەو شێوە تەقلیدییە نا، کە ئەو لێی تێگەیشتووە، بەڵکوو بەو مانایەی هەر خوێنەرێکی

هۆشیار بەرهەمێکم بخوێنێتەوە، دەزانێت بە ئاگاییەوە لە یەکترم ترازاندوون. واتە شوێنەواری ئەو پێوەندییە دەبینێت، کە پێشتر ئەو ڕووداوانە بە یەکتریانەوە هەبووە. شتێکی سەیر نییە ئەو نوخبەیەی ئێمە، کە لە بواری فەلسەفە و تیۆرییەکانی ئەدەبدا خۆی ماندوو دەکات، لە بەرهەمەکانم گەیشتووە و لەبارەیانەوە نووسیویەتی. ڕۆمانی (کازینۆی منداڵان)م بەوە تۆمەتبار دەکرا، گوایە ڕووداوەکانی پێوەندییان پێکەوە نییە و خۆیشم لێی تێناگەم، کەچی جگە لەوەی نووسەرە داهێنەرەکانی خۆمان بە وردی لێی تێگەیشتوون، ئەوا کاتێک کراوەتە فارسییش، وەرگێڕەکە کێشەیەکی وای نەبووە. یەک جاریش نەیپرسی تۆ مەبەستت لەمە چییە و ئەوەیان چ پێوەندیی بەوەی تریانەوە هەیە، بەڵکوو ناوەناوە لە ڤایبەردا سەرسامیی خۆی لە ئاستی ئەو تەکنیکانەدا پیشان دەدا. هەر ئەو وەرگێڕە پێی گوتووم لای خوێنەری بەئاگای ئێرانی ئەو ستایلە بە نوێ و دەگمەن زانراوە. زۆر نووسەر لە چیرۆکی (لەسەر دەستی عادیل سەلیم دەنووسم) نەگەیشتوون، کە لە (٢٠٠٥)دا نووسراوە، چونکە تەکنیکەکانی ناسراو نین. (فەتحیە محەمەد)ی هاوسەری لەو کاتەی خوێندییەوە، تەمەنی حەفتاودوو ساڵ بوو و بە دەست کۆمەڵێک نەخۆشییەوە دەیناڵاند، بەڵام زۆر بە چاکی لێی تێگەیشت. ئەو ژنە تا ئەو ڕۆژەی ماڵئاوایی کرد، بە چوار زمان کتێبی زۆر قورسی دەخوێندەوە و ئەزموونێکی گەورەی هەبوو. هەر ئەو

بەرهەمەم کراوەتە عەرەبی و وەرگێڕەکەی ماناکانی بە دروستی گەیاندوون.

ئایا ئەگەر نووسەری ئەو نامەیە لە بەرهەمی من نەگەیشتووە، مانای وایە لەو ڕۆماننووسانەی ناویان هات، تێدەگات؟ با بێت پێکبەستنەوەکانی (جۆیس) و (فۆکنەر)مان پێشان بدات!

بۆچی دەبێت تێگەیشتنی ئەو پێوەر بێت؟ ئەگەر لە شتێک نەگەیشت، مانای وایە نووسەرەکەی دەستەڵاتی بەسەردا نەشکاوە؟ لەگەڵ ئەوەیشدا داوای لێ دەکەم بە ئارەزووی خۆی • بەرهەمێکم هەڵببژێرێت و پێم بڵێت نەتتوانیوە ڕووداوەکان پێکەوە ببەستیتەوە، بۆ ئەوەی من ئەودەم قسەی تر لەو بارەیەوە بکەم. وەک گوتیشم لە دیدگەیەکی تەواو جیاوازەوە لەو بەیەکبەستنەوەیە دەڕوانم. من شەڕ بۆ ئەوە دەکەم ڕووداوەکان لە یەکتر بترازێنم و پێوەندییان پێکەوە نەهێڵم، بۆیە دەیان تەکنیک بۆ ئەو مەبەستە دادەهێنم، کە هەر خوێنەرێکی هۆشیار هەست بەوە دەکات.

ڕاستییەکەی ئەو نووسەرە نزیکەی دە ساڵ لەمەوبەریش لە گفتوگۆیەکدا کۆمەڵێک قسەی تری لەم بابەتەی کردووە، کە وەک دەردەکەوێت هێشتا ئەو ئاستەی تێ نەپەڕاندووە. لەو گفتوگۆیەیدا لەبارەی فانتازیاوە شتێکی گوتووە، کە بە هەموو مانایەک دوورە لە نووسەرێک، دە لاپەڕەی لە کتێبێکی گرنگی

بواری ئەدەبی گێڕانەوە، یان لە هەر بوارێکی تردا خوێندبێتەوە. من لە گفتوگۆیەکمدا، کە لەبارەی (زمانی نووسین و زمانی ڕۆژانە لە ڕۆمان)ـەوەیە، ئاماژەم بەو بۆچوونەی داوە، کە گوتوویەتی: (فانتازیا خۆی نادات بەدەستەوە و کەمێکی دێتە ناو وشەوە). لێرەدا جارێکی تر دەیخەمەوە بەر چاو:

(ئەو پرسیارە بە شێوەیەک لە شێوەکان پرسیارە لە خودی زمان خۆی و دواجار لە زمانی قسەکردن (لغة الكلام Spoken language) و نووسین Writing) ، کە فەلسەفە بە درێژاییی تەمەنی خۆی پێوەی خەریکە، لە (سۆکرات)، (پلاتۆن)، (ئەرستۆ)ەوە بۆ (ڕۆسۆ)، (هیگل)، (سۆسێر)، (هایدگەر) و (باختین) لەوێوە بۆ (دێریدا). دەمەوێ لێرە ئەوەت بیر بخەمەوە، کە ئەوە (زمانی قسەکردن) و (نووسین)ن لە فکر و فەلسەفەدا بوونەتە جێگەی مشتومڕ، نەوەک (وشە)، چونکوو وشە ئایکۆنە و تەنیا دەخوێنرێتەوە، کەچی (...... ئەو نووسەرە) منی بەوە تۆمەتبار کردووە، گوایە فانتازیام لەناو وشەدا بەند کردووە. من ئەگەرچی هەرگیز شتی وام نەگوتووە، بەڵام زۆرم بە لاوە سەیرە، کە (....) دەڵێ: (فانتازیا خۆی نادات بەدەستەوە و کەمێکی دێتە ناو وشەوە). من هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم ڕۆژگارێک گوتەیەکی ئاوا نە لەو چیرۆکنووسە و نە لە هیچ کەسێکی دیکەوە ببیستم. (وشە)

وەکو (سوسێر) دەڵێ لە دەرەوەی کۆنتێکستدا شتێکە و لەناو کۆنتێکستیشدا شتێکی دیکەیە. جا نازانم چۆن فانتازیا کەمێکی دێتە ناو وشەوە! بۆ نموونە دەشێ وشەی (هێمن) لە کۆنتێکستێکدا ناو بێت و لە یەکێکی دیکەدا ئاوەڵناو. لە کۆنتێکستێکی دیکەدا بکەر و لە یەکێکی دیکەدا بە یارمەتیی یەک وشەی دیکە ببێتە کردار. هەر ئەو پیتانەی ناوی (هێمن)یان لێ پێک هاتووە، لە کۆنتێکستەکانی دیکەدا مانای دیکەی تەواو جیاواز لەوانەی پێشوویان پێک دەهێنن. بڕوانە هەر لەناو وشەی (هێمن)دا (من)، (مێ)، (نم نم)، (هێ)، (نێ)، (مێن)، (منێ) و (هم) هەن. وشەی (هێمن) کاتێ وەردەگێڕرێتە سەر زمانەکانی دیکە، گۆڕانی بنەڕەتیی بەسەردا دێت چ لە دەنگ و چ لە پێکهاتەی پیتەکانیدا. ئەوەی دەمێنێتەوە، مانایە، نەوەک وشەکە خۆی. کەواتە ئەو گوتەیەی (......)، گوایە (وشە) هەندێک فانتازیای دێتە ناوەوە، زۆر سادەیە. ئایا ئێمە دەتوانین داهێنان لە زماندا بکەین، ئەگەر دیدگەمان نەبێت و هەوڵمان نەدابێت لە خودی زمان تێبگەین؟ دەتوانین چیرۆک و شیعر و ڕۆمانی جددی بنووسین، ئەگەر نەمانتوانیبێت ئەو ئاستانە لە یەکتر جیا بکەینەوە؟)[٢١٤]

---

٢١٤ http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٠/٣/karwan_bakhtyar.htm

ئێستایش دەیڵێمەوە، کە نازانم چۆن یەکێک ئەمەی لەبارەی فانتازیاوە نووسیبێت، جارێکی تر ڕێگە بە خۆی دەدات بە هەمان تۆن بە نووسەرانی تر بڵێت دەستەڵاتیان بەسەر خەیاڵیاندا دەشکێت، یان نا.

لێی دەپرسم ئایا فانتازیا و وشە شتی فیزیکن، تاکوو ئەمیان بچێتە ناو ئەوەی تریانەوە؟ خۆزگە دەهات و هەندێکی تری لەو بارەیەوە دەنووسی! وشە لەسەر ئاستی سیمبۆڵدا بە کار دەهێنرێت وەک بۆ نموونە لای (فۆکۆ)دا دەیبینین، کە ئەو لەگەڵ لایەنی فیزیکیی وشەی نییە، بەڵکوو لەگەڵ شێوازی بەکارهێنانیەتی، بەڵام لە هیچ نووسینێکی فیکریدا نەمدیوە نووسرابێت وشە فانتازیای تێ دەکرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا پێم خۆشە پێشانم بدات، کە ئەو پرۆسەسە چۆنە. دەتوانێت هەر لە بەرهەمەکانی خۆیدا نموونە بهێنێتەوە، کە چۆن کەمێک فانتازیای هێناوەتە ناو وشەوە، نەوەک هەمووی؟ لێرەیشدا دیسان بە مانا میللییەکەی باسی لە خەیاڵ کردووە، ئاخۆ دەستەڵاتت بەسەریدا دەشکێت، یان نا، بۆیە سەیر نییە ڕستەیەکی لەم شێوەیە بنووسێت: (زیانی زۆری بە تێکستەکە نەگەیاندبایە).

ئەو زمانە لە تیۆریی گێڕانەوەدا نەک هەر بە کار نایەت، بەڵکوو وەک شتێکی زۆر ساکار سەرنجی لێ دەدرێت. لە دنیای نووسیندا شتێک نییە بە ناوی زیان و قازانج. ئەمە هیی

دنیای فیزیکه و تەنیا لەسەر زمانی ڕەخنەگری میللیدا ڕستەی لەم شێوەیەت گوێ لێ دەبێت. هەروەها ئەوەی دەگوترێت کێ لە کێ باشترە و کێ لە کێ خراپترە، خەسڵەتێکی دیکەی زمانی میللییە، کە وەک شتی فیزیکی مامەڵە لەگەڵ کاری هونەریدا دەکات، وەک ئەو نووسەرەی خۆمان بەو نووسەرە لاوەی گوتووە لە من باشترە. لە دنیای نووسیندا ئاستە جیاوازەکان هەن و ڕەخنەدۆزەکانیش هەر لەوێوە لە ئەدەب و هونەر دەڕوانن، بێ ئەوەی بڕیار بدەن کام نووسەرە باشە و کامەیان خراپە.

ئەمڕۆ نزیکبوونەوەیەکی گەورەتر لەنێوان ژانرە ئەدەبییەکان لە لایەک و بوارە مەعریفییەکان لە لایەکی ترەوە هەیە، کە لەم نووسینەدا بەشێکمان لە ژێر ناونیشانی (جۆرەکانی ئەدەب... چەمک و تیۆری)دا بۆ تەرخان کرد. ئەو ڕۆماننووسەی ئاگای لەو ژانرانەی تر و لە بوارەکانی وەک فەلسەفە، سایکۆلۆجیا، سۆسیۆلۆجیا، لینگویستیک و ئەوانەی دیکە نەبێت، ناتوانێت بەرهەمی قووڵ بنووسێت، بۆیە بێگومان دەستی بەسەر خەیاڵیدا دەشکێت و خوێنەری سادەیش بە ئاسانی لێ تێدەگات. واتە دەتوانێت شتەکانی بە یەک ببەستێتەوە، بگرە هەر خۆیان لە بنەڕەتەوە پێکەوە بەستراونەتەوە.

وەک گوتم بۆچوونی ڕەخنەگری میللی هێزی خۆی تەواو لە دەست داوە. مەبەستم ئەوەیە ڕەخنەگری میللیی ئێمە ئەو

نووسەرانە بە داهێنەر دەزانێت، کە بە سادەیی دەنووسن، دەنا بەرهەمی ئەوانە نە لای ڕەخنەدۆزە بەئاگاکان گرنگن و نە لای خوێنەری هۆشیاریش ئەو هێزەیان هەیە. ئەوانە ئەگەر سەرەتایش هەندێک کاری جوانیان کردبێت، ئەوا دواتر بەوەدا خۆیان لەناو ئەو تێگەیشتنە میللییەدا قەتیس کردووە، نەیانتوانیوە ئەو ئاستە سەرەتایەی خۆیان تێ بپەڕێنن، بۆیە هەمیشە بەو زمانە میللییە ناڕەزایی دەردەبڕن.

دە ساڵ لەمەوبەر پرسیومە: (ئایا ئێمە دەتوانین داهێنان لە زماندا بکەین، ئەگەر دیدگەمان نەبێت و هەوڵمان نەدابێت لە خودی زمان تێبگەین؟ دەتوانین چیرۆک و شیعر و ڕۆمانی جددی بنووسین، ئەگەر نەمانتوانیبێت ئەو ئاستانە لە یەکتر جیا بکەینەوە؟)

هەست دەکەم ئێستایش ئەو پرسیارانەم نرخی خۆیان لە دەست نەداوە. ئەوەیشمان بینی، کە (میلان کۆندێرا) پێی وایە ئەوەی فیلۆسۆف دەیکات، هەر ئەوەیە ڕۆماننووسیش کردوویەتی. ئەو تێگەیشتنە تەنیا لای ڕەخنەگری میللیدا ماوە، کە نووسەری سادەنووس، ئەو نووسەرەی لە ئاستی زمانی خەڵکدا دەنووسێت، داهێنەرە.

لەو نووسەرە لاوە دەپرسم، کە هەوڵی جوانی هەیە و ڕۆژگارێک لە ڕێگەی ئیمەیڵەوە ئاگامان لە یەکتر بووە، ئەو

شتە چی بوو لەم نامەیەدا پێی گەیشت، کە پێشتر نەیدەزانی؟ ئەو چەمکە نوێیە چی بوو بۆ یەکەمجار کەوتە بەر چاوی و وای لێ کرد لێی قووڵ ببێتەوە؟ ئەو سەرچاوەیە چی بوو لە بواری ئەدەبی گێڕانەوەدا ناسیی؟ ئەو شێوازی نووسینە چی بوو، کە هەستی کرد نوێیە؟ هەر بە گشتی لەبارەی ڕۆمانەکەیەوە شتێکی گوتووە؟

ڕەنگە بگوترێت لە نامەیەکدا تەنیا دوو سێ دێڕ لەبارەتەوە نووسراون، دەبێت ئاوا ڕووبەڕووی ببیتەوە. دەڵێم: یەکەم، لای من وەک پێشتر گوتوومە شتێک نییە ناوی نووسینی کورت و نووسینی درێژ، بەڵکوو کاتێ لە بەردەم تێکستێکدام، یان قسەم هەیە و یان نیمە. دووەم، من لە ڕێگەی (پرسیار و وردکردنەوە)وە ڕووبەڕووی دەبمەوە. ئایا ئەگەر ئەو پرسیارانەی من دایەلۆگیان لێ بکەوێتەوە، ئاڕاستەی کرانەوە وەرناگرن، کە ئاڕاستەیەکی کاریگەرە و توانای تێپەڕاندنی هەیە؟ لای ئێمە چەمک هەیە فڕێ دەدرێت و چەمک هەیە قسەی لێوە دەکرێت. ئایا ئەگەر من ئەوەی دووەمیان هەڵبژێرم و لەبارەی هەر چەمکێکەوە بنووسم، کە فڕێ دراوە، ئاستێکی تر لای خوێنەر دەرناکەوێت؟ هیچ نەبێت لەو شوێنەدا، لەو شوێنەی چەمکەکەی لێ فڕێ دراوە، زمان و تێگەیشتنێکی دیکەی جیاواز خۆیان دەرناخەن؟ ئەوەیش گوترا، کە فڕێدانی چەمک تەنیا چەند وشەیەکی ساکاری ڕۆژانەی تێ

دەچێت، بەڵام کاتێ لەسەری دەوەستیت و دەتەوێت لاکەی دیکەی پێشان بدەیت، ئەو لایەی فیلۆسۆف و ڕەخنەدۆزان بایەخیان پێ داوە، پێویستت بەوەیە زۆر زیاتری لەبارەیەوە بنووسیت و بۆچوونەکانیشت، چ بە مەبەستی دەرخستنی جیاوازی و چ بە مەبەستی جەختکردنەوە، لەسەر بۆچوونی ئەوان دابمەزرێنیت.

ئەگەر من بە پرسیار ڕووبەڕووی ئەو بۆچوونانە نەبوومایەتەوە، ئەوا تێدەپەڕین و لەسەر ئەو بۆچوونە میللییانەی تر کەڵەکە دەکران، کە بوونەتە هێزێکی کۆمەڵایەتی و سیمبۆلی و بەردەوام پەلاماری داهێنان دەدەن. پێم وایە ئەگەر ئەم چەند دێڕەی من پاڵپشتی کەلتووری پرسیار و دایەلۆگ بکەن، کە دەتوانم بڵێم لای ئێمە بە شێوەیەک لە شێوەکان هێشتا کزە، ئەوا هەست دەکەم پێویستن. ئەوەیش دەڵێمەوە ئێمە چەند بمانەوێت و چەند خەون بەوەوە ببینین لە ئاستی بەرزدا بنووسین، بەڵام بەوەدا پێوەندیمان بە دنیایەکەوە هەیە، کە تێیدا زمان و تێگەیشتنی میللی دەستەڵاتدارن، ئەوا ناکرێت ڕووبەڕووی نووسەرە میللییەکان نەبینەوە. کاتێکیش ڕووبەڕوویان دەبینەوە، پێمان خۆش بێت، یان ناخۆش کار لە ئاستی زمانمان دەکەن. من ئەم ڕێگەیەم بۆ ڕووبەڕووبوونەوە گرتووەتە بەر، کە دەشێ نووسەرێکی تریش ڕێگەیەکی جیاواز لەوەی من بگرێت. هەتا ئێستا

نووسەرێکم نەدیوە بە زمانی میللی باسی لە چەمکێک کردبێت و شتی گرنگی بە دەستەوە دابێت.

دوای هەموو ئەو شتانە دەڵێم بەوە خۆشحاڵم، کە ئەو نووسەرە ئەمەی بە نووسین دەربڕیوە و بە زمانێکی ئارام و دوور لە توندوتیژییش نووسیویەتی، کە ئەمە ئەو شتەیە من نرخی بەرزی بۆ دادەنێم، بەوەی بواری ڕەخساندووە قسەی تری جیاواز لەو بارەیەوە بکرێت. ئەوانەی بەرهەمی داهێنەران هەر بە قسە دەسڕنەوە، نایەن بڕیارەکانیان بنووسنەوە، تاکوو نۆرەی ئێمەیش بێت پێیان بڵێین بڕیاری ئەوان لە کوێوە هاتووە.



هاوڕێیەکم پۆستی نووسەرێکی سکرینشۆت کردووە و بۆی ناردووم، کە لە فەیسبووکدا لەبارەی ڕۆمانی (ماڵی نانی)یەوە نووسیویەتی:

(کە نووسینی کاروان دەخوێنینەوە، پێویستمان بە شتێکە لە وردبوونەوە زیاتر بێت، تا بتوانین لەو دۆخ و فەزایە تێبگەین، کە لەگەڵ نووسینی کاکەسووردا بەری دەکەوین. نادیاریی گێڕەرەوە، دروستبوونی ڕووداو لەسەر ڕووداو، بە شێوەیەکی چڕ و لە شوێن و زەمەنی جیاوازدا، بە جۆرێکە، بێئاگابوونێکی چکۆلە لە بەشێکی بچووکی نووسینەکە، ئەنجامی گەورەت لە کیس دەدات. لای کاروان شتەکان بە شێوەیەکی جیاواز لەوەی

هەیە و پێی ڕاهاتووین، تەوزیف دەبنەوە. کە دەستمان دایە هەر نووسینێک ناوی ئەم نووسەرەی لەسەر بوو، کە ساڵێک دەبێت بڕیاری وازهێنانی یەکجارەکیی لە نووسین دا، مەحکووم و ناچارین بەوەی وردتر لە زمان ڕابمێنین، بیر بکەینەوە، تا بتوانین تێبگەین)

ئەمە بۆچوونی ئەو ژنەیە، کە تەنیا لە ڕێگەی بەرهەمەکانمەوە ناسیومی. بە چەند دێڕێکی کورت ستایلی منی بە خوێنەر ناساندووە. لام ڕوونە ئەو نووسەرە دوای خوێندنەوە بەمە گەیشتووە، بەڵام پیاوێک، نازانم نووسەرە، یان تەنیا خوێنەر ئەم کۆمێنتەی نووسیوە:

(ئەم بۆچونەی تۆ پێچەوانەی زۆر کەسە کە لەبارەی کاروانەوە دواون، دڵنیا بە کەس واز لەنوسین ناهێنێ ئەگەر دڵۆپێک تەڕایەتیی پێوە مابێ و کانیەکەی وشکی نەکردبێت).

خوێنەرێک ئەمە زمان و تێگەیشتنی بێت، لام ڕوونە لە دنیای من ناگات، کە ئەوە نە گلەییە و نە ڕەخنە، بەڵکوو جەختکردنەوەیە لەسەر بۆچوونەکەی. ئەو خوێنەرەی لە نووسەری تەڕ دەگەڕێت و یەکێکی وای دەوێت لە کانی بچێت، لە هەر شوێنێکدا کۆمەڵێک دەدۆزێتەوە، بەڵام ئەوانەی بەم شێوەیە نین، ژمارەیان کەمە و ڕەنگە هەر نەکەونە بەر چاوی.

ئەو نووسەرەی پۆستەکەی کردووە، ئەم گوتەیەی لە ڕۆمانەکە وەرگرتووە:

(تۆ دەزانیت هیچ کەسێ لەو شتانە سەرکەوتوو نابێت، کە هیوایان بۆ دەخوازێت؟ دەزانیت ئێمە هەر ئەو شتانە بە دەست دەهێنین، کە بیرمان لێ نەکردوونەتەوە؟)

خاوەنی ئەو کۆمێنتەی پێشوو لەو بارەیەوە نووسیویەتی:

(پێچەوانەکەی ڕاستە، هەر شتێک ئەگەر بەجدی هەوڵی بۆ بدەیت بەدەستی دێنیت).

وەک بڵێی کتێبی (چۆن لە ژیاندا سەرکەوتوو دەبیت؟)م نووسیبێت، نەوەک ڕۆمان. مەگەر منیش هەر لە منداڵییەوە لە کۆڵان و گەڕەکی خۆمدا ئەوەم نەزانیوە، کە ئەو نووسیویەتی؟ لە پەند و حەقایەتەکاندا هەزاران جار گوێم لەوە نەبووە؟ ئەگەر چاوەڕێیە ئەو شتەی پێ بڵێم، کە خۆی پێشتر زانیویەتی، ئەوا لە بەرهەمی مندا بەر چاوی ناکەوێت. ئایا نووسەری ئەم کۆمێنتانە ڕۆمانی (ماڵی نانی)ی خوێندووەتەوە؟ خۆ ئەگەر بیخوێنێتەوە، دەزانێت ئەو کارەکتەرە بۆچی وای گوتووە، چونکە پێوەندیی بە زنجیرەیەک ڕووداو و دیمەنەوە هەیە. ژمارەی ئەم جۆرە خوێنەرە لای ئێمە زۆرە. هەر ئەویشە بڕیار دەدات کێ نووسەرە و کێ نووسەر نییە. ئێستا لای ئەو خوێنەرە مادام لەو ڕۆمانەدا نەگوتراوە (هەر شتێک ئەگەر بەجدی هەوڵی بۆ بدەیت بەدەستی دێنیت)، ئەوا بەرهەمێکی خراپە و بە کەڵکی

خوێندنەوە نایەت. نەهامەتییەکە ئەوەیە زمانی هەندێک ڕەخنەگر و نووسەری ئەدەب دوای چاپکردنی کۆمەڵێک کتێب، هەمان زمانی ئەو خوێنەرەیە. گلەییەکانیان هەمان گلەیی ئەو خوێنەرەن.

# سەرچاوەکان

(ڕیزکردنیان پێوەندیی بەوە هەیە، کامیان زووتر لە نووسینەکەدا بە کار هاتووە).

## بە زمانی عەرەبی

### کتێب

_ جاك دريدا، الكتابة والاختلاف، ترجمة كاظم جهاد، تقديم محمد علال سيناصر، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، الطبعة الثانية، ٢٠٠٠

_ ميلان كونديرا، فن الرواية، ترجمة: خالد بلقاسم، المركز الثقافي العربي، المغرب، ٢٠١٧

_ هانز جورج غادامير، طرق هيدغر، ترجمة: د. حسن ناظم وعلي حاكم صالح، دار الكتاب الجديد المتحدة، الطبعة الاولى، ٢٠٠٧

_ فريدريش نيتشه، هذا هو الإنسان، عن الألمانية: علي مصباح، منشورات الجمل، المانيا، ٢٠٠٣

_ برتراند راسل، تاريخ الفلسفة الغربية، الكتاب الثالث، الفلسفة الحديثة، ترجمة: د. محمد فتحي الشنيطي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٧٧

_ جنات بلخن، السرد التاريخى عند بول ريكور، مسائل فلسفية، دار الامان، الجزائر، الطبعه الاولى. ٢٠١٤

_ مارتن هايدغر، اصل العمل الفني، ترجمة: د. ابو العيد دودو، المانيا، منشورات الجمل، الطبعة الاولى، ٢٠٠٣

_ د. عبد المنعم تليمة، مقدمة في نظرية الادب، دار العودة، بيروت، التبعة الثالثة، ١٩٨٣

_ ارسطو، كتاب فن الشعر، ترجمة وتقديم وتعليق: دكتور ابراهيم حماده، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٨٩

_ جيرار جينيت، مدخل لجامع النص، ترجمة: عبد الرحمن ايوب، مشروع النشر المشترك، دار الشؤون الثقافية العامة (افاق عربية)، بغداد، دار توبقال للنشر، ١٩٨٥

_ تزفيطان طودوروف، الشعرية، ترجمة شكري المبخوت ورجاء بن سلامة، دار توبقال للنشر، دار البيضاء، المغرب، الطبعة الثانية، ١٩٩٠

_ د. صبحه احمد علقم، تداخل الاجناس الادبية في الروايه العربية، الرواية الدرامية انموذجا، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الاردن، الطبعة الاولى، ٢٠٠٦

_ الدكتور محمد غنيمي هلال، الادب المقارن، نهضة مصر للطباعة والنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعه التاسعة، ٢٠٠٨

_ ب. كروتشه، المجمل في فلسفة الفن، ترجمة وتقديم: سامي الدروبي، الطبعة الاولى، المركز الثقافي العربي، بيروت، الدار البيضاء، ٢٠٠٩

_ رولان بارت واخرون، طرائق تحليل السرد الادبي، ترجمة حسن بحراوى واخرون، منشورات دار اتحاد كتاب المغرب، الرباط، الطبعه الاولى، ١٩٩٢

_ تزفيتان تودوروف، شعرية النثر (مختارات)، تليها ابحاث جديدة حول المسرود، ترجمة عدنان محمود محمد، مراجعة الدكتور جمال شحيد، منشورات الهيئة العامة السورية للكتاب، دمشق، ٢٠١١

_ فريدريك نيتشه، انسان مفرط في انسانيته، ج٢، ترجمة: محمد الناجي، افريقيا الشرق، المغرب، ٢٠٠١

_ تيودور فون ادرنو، محاضرات في علم الاجتماع، ترجمة جورج كتوره، مركز الانماء القومي، بيروت، بلا سنة الطبع.

_ مارتن هيدجر، انشاد المنادي، (قراءة في شعر هولدرلن وتراكل)، تلخيص وترجمة بسام حجار، المركز الثقافي العربي، بيروت، الطبعة الاولى،١٩٩٤

_ البير كامو، اسطورة سيزيف، نقله الى العربية: أنيس زكي حسن، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت- لبنان، ١٩٨٣

_ هنري برغسون، التطور المبدع، ترجمه من الفرنسية الى العربية: جميل صليبا، اللجنة اللبنانية لترجمة الروائع، بيروت، ١٩٨١

_ اندريه لالند، العقل والمعايير، ترجمه د. نظمى لوقا، الهيئه المصريه العامه للكتاب، ١٩٧٩

_ برتراند راسل، حكمة الغرب، عرض تاريخى للفلسفه الغربية في اطار الاجتماعي والسياسي، الجزء الاول، ترجمة: د. فؤاد زكريا، عالم المعرفة، ٦٢، ١٩٨٣

_ مارتن هايدغر، السؤال عن الشيء (حول نظرية المباديء الترنسندنتالية عند كنت)، ترجمة: اسماعيل المصدق، مراجعة: موسى وهبة، المنظمة العربية للترجمة، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠١٢

_ ايمانويل كانط_ د. جمال محمد احمد سليمان، انطولوجيا الوجود، دار التنوير للطباعه والنشر والتوزيع، سنة الطبع ٢٠٠٩

_ فريدريک نيتشه، الفلسفة في زمن المأساوى الاغريقي، تقديم ميشال فوكو، تعريب: الدكتور سهيل القش، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٣

_ مارتن هيدجر، ما الفلسفه؟ ما الميتافيزيقا؟ هيلدرلين وماهية الشعر، ترجمة: فؤاد كامل ومحمود رجب، دار الثقافه للنشر والتوزيع، القاهرة، ١٩٧٤

_ مارتن هايدجر، كتابات اساسية،الجزء الثانى، ترجمة وتعليق: اسماعيل المصدق، المشروع القومي للترجمة، المجلس الاعلى للثقافة، ٢٠٠٣

_ د. سعيد توفيق، في ماهية اللغة وفلسفة التأويل، الؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٢

_ هانس غيورغ غادامير، فلسفة التأويل (الأصول. المباديء. الأهداف)، ترجمة: محمد شوقي الزين، منشورات الاختلاف، الطبعة الثانية، ٢٠٠٦

_ رولان بارت، درس السيمولوجيا، ترجمة: عبدالسلام بن عبدالعالي، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، ١٩٨٦

_ على حرب، الماهية والعلاقه: نحو منطق تحويلي، المركز الثقافي العربي، الطبعه الاولى، ١٩٩٨

_ تزفيتان تودورف، الحياة المشتركة، بحث انثروبولوجي عام، ترجمة: منذر عياشي، الطبعة الاولى، كلمة والمركز الثقافي العربي، بيروت، ٢٠٠٩

_ مارتن هيدجر، التقنية_الحقيقة_ الوجود، ترجمة: محمد سبيلا و عبد الهادي مفتاح، المركز الثقافي العربى، الدار البيصاء، ط١، ١٩٩٥

_ ميخائيل باختين، شعرية دويستويفسكى، ترجمة: الدكتور جميل نصيف التكريتي، مراجعة: الدكتورة حياة شرارة، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، ١٩٨٦

_ هانز جورج غادامير، التلمذة الفلسفية (سيره ذاتية)، ترجمة: علي حاكم صالح ود. حسن ناظم، دار الكتاب الجديد المتحدة، الطبعة الاولى، ٢٠١٣

_ لودفيك فتغنشتاين، تحقيقات فلسفية، ترجمة وتقديم وتعليق: د. عبد الرزاق بنور، إعداد المنظمة العربية للترجمة، الطبعة الاولى، بيروت،٢٠٠٧

_ بول ريكور، الذات عينها كآخر، ترجمة وتقديم وتعليق، د. جورج زيناتي، المنظمة العربية للترجمة، الطبعه الاولى، بيروت، ٢٠٠٥

_ جيلبير دوران، الخيال الرمزي، ترجمة: علي المصري، الطبعة الثانية، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٩٤

_ متاهات، (نصوص وحوارات في الفلسفة والادب) ترجمة: حسونه المصباحي، مراجعة: د. قدامة الملاح، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٩٠

_ غاستون باشلار، لهب شمعة، د. مي عبدالكريم محمود، أزمنة للنشر والتوزيع، عمان، الطبعة الاولى، ٢٠٠٥

_ وفيق غريزي، شوبنهاور وفلسفة التشاؤم، دار الفارابي، بيروت-لبنان، الطبعة الاولى، ٢٠٠٨

_ بيتر سلوتردايك، (الانجيل) الخامس لنيتشه، ترجمة: علي مصباح، منشورات الجمل، المانيا، ٢٠٠٣

_ امبرطو ايكو، الأثر المفتوح، ترجمة: عبد الرحمن بو علي، دار الحوار للنشر والتوزيع، الطبعة الثانية، سورية، ٢٠٠١

_ جاك دريدا، في علم الكتابة، ترجمة وتقديم: أنور مغيث و منى طلبة، الطبعة الثانية، المركز القومي للترجمة، القاهرة، ٢٠٠٨

_ فريدريک نيتشه، الفلسفة في زمن المأساوي الاغريقي، تقديم ميشال فوكو، تعريب: الدكتور سهيل القش، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٣

_ سيغموند فرويد، الهذيان والاحلام في الفن، ترجمة: جورج طرابيشي، دار الطليعة بيروت، الطبعة الاولى، ١٩٧٨

_ د. عادل مصطفى، فهم الفهم، مدخل الى الهرمنيوطيقا، نظرية التأويل من افلاطون الى جادامر، رؤيه للنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعة الاولى، ٢٠٠٧

_ جاك شورون، الموت في الفيكر الغربي، ترجمة: كامل يوسف حسين، مراجعة: د. إمام عبدالفتاح إمام، عالم المعرفة، سلسلة كتب ثقافية شهرية يصدرها المجلس الوطني للثقافة والفنون والاداب- الكويت، ع٧٦، ١٩٨٤

_ اسوالد اشبنجلر، تدهور الحضارة الغربية، ترجمة احمد الشيباني، الجزء الاول، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت- لبنان.

گۆڤار

_ رولان بارت، من العلم الى الادب، ترجمة: د. منذر عياشي، مجلة الاداب الاجنبية، سوريه، عدد٩٣، سنة١٩٩٧

_ جوليا كريستيفا، التحليل النفسي واللغة، ترجمة: د. زياد عزالدين عوف، مجلة الاداب العالمية، العدد١٣٦، سنة٢٠٠٨

_ الان روب غرييه يتحدث عن نفسه، مقابله اجراها: جاك هنريک، ترجمة: د. مهدي صالح حمادي، مجلة اسفار، بغداد، ١٩٨٥، عدد٢

_ ای. ال. بادر، بناء القصة القصيرة الحديثة، ترجمة: عبدالواحد محمد، مجلة الاقلام، عدد٢، سنة١٩٨٥

_ محمد امنصور، السرد والجنون، لعبة التمثلات القصوى، كتاب الفقدان لمحمد اسليم ، مجلة نقد وفيكر، عدد٥٣، سنة٢٠٠٣

_ تشارلز ليموت، حقل فوكو، ترجمة: خالدة حامد، مجلة الاداب الاجنبية، سوريه، عدد١٠٩، سنة٢٠٠٢

**کتێب/ ئینتەرنێت**

_ كرد محمد، الشعر والوجود عند هيدغر، رسالة مقدمه لنيل شهادة دكتوراه في الفلسفة، ، السنة الجامعية ٢٠١١_٢٠١٢

https://theses.univ-oran١.dz/document/٠٤٢٠١٣٢٢vt.pdf

**گوتار/ ئینتەرنێت**

_ تزفيطان تودورف، الاجناس الادبية، ترجمة: جواد الرامي. لە نێت وەرگیراوە، کە ئەمە لینکەکەیەتی:

http://www.aljabriabed.net/n١٨_١٢jawarami.htm

_ وفيق غريزى، فلسفة كانط وانطولوجيا الوجود_ قراءة فى كتاب انطولوجيا الوجود.

http://post٢modernisme.blogspot.com/٢٠١٥/١٢/blog-post_١٨.html

بە زمانی ئینگلیزی

کتێب

- Friedrich Nietzsche, The Gay Science, Edited by Bernard Williams, Translated by Josefine Nauckhoff, Cambridge University, Seventh printing ٢٠٠٨.

- Paul Ricoeur, Hermeneutics and the Human Sciences, Collected and translated by John B. Thompson, Cambridge University Press, ١٩٨١.

- Gilles Deleuze and Claire Parnet, Dialogues, translated by Hugh Tomlinson and Barbara Habberjam, New York Columbia University Press, ١٩٨٧.

- Gilles Deleuze, Kant's Critical Philosophy, The Doctrine of the Faculties, Translated by. Hugh Tomlinson and Barbara Habberjam, The Athlone Press, London, ١٩٨٤.

- Maurice Merleau-Ponty, The Visible and the Invisible, FOLLOWED BY WORKING NOTES,

Edited by Claude Lefort, Translated by Alphonso Lingis, N o r t h w e s t e r n U n i v e r s i t y P r e s s, EVANSTON, ١٩٦٨.

- Maurice Merleau-Ponty, Phenomenology of Perception, Translated by Colin Smit, London and New York, ١٩٥٨.

- Martin Heidegger, The Principle of Reason, Translated by Reginald Lilly, Indiana University Press, ١٩٩١.

- Alfred Adler, Understanding human nature (W. B. Wolfe, Trans.), New York: Premier Books, Fawcett World Library.

- Paul Ricoeur, Interpretation Theory: Discourse and the Surplus of Meaning, Texas Christian University Press, ١٩٧٦.

- Michel Foucault, THE ARCHAEOLOGY OF KNOWLEDGE AND THE I)ISCQURSE ON LANGUAGE, Translated from the French by A.

M. Sheridan Smith, PANTHEON BOOKS, NEW YORK, ١٩٧٢.

- Claude Levil-Strauss, Structural Anthropology, Translated from the French by Claire Jacobson and Brooke Grundfest Schoepf, BASIC BOOKS, In c., Publishers, New York, ١٩٦٣.

- A. G. Lehmann, The Symbolist Aesthetic In France ١٨٨٥-١٨٩٥, Basil Blackwell, Oxford, ١٩٥٠.

کتێب/ ئینتەرنێت

- Michel Foucault, The Order of Things, An archaeology of the human sciences.

https://is.muni.cz/el/١٤٢٣/jaro٢٠١٣/SOC٩١١/um/Michel_Foucault_The_Order_of_Things.pdf

- **Gilles Deleuze and Felix Guattari, What Is ?Philosophy**

https://transversalinflections.files.wordpress.com/٢٠١٥/٠٤/deleuze-٢٢٠٧-what_is_philosophy-fenomenologie-van-schilderkunst.pdf

JOSEPH CAMPBELL, (The Portable Jung), - Translated by R. F. C. Hull, Published in Penguin Books ١٩٧٦, Reprinted ١٩٧٧

https://archive.org/stream/ThePortableJung/The%٢٠Portable%٢٠Jung_djvu.txt

- Anthony Giddens, Living in a post-traditional society.

http://ls-tlss.ucl.ac.uk/course-materials/ANTH٣٠٢٠_٦٦٧٩٠.pdf

گوتار/ ئینتەرنێت

- Michel Foucault, What Is An Author?

http://seas٣.elte.hu/coursematerial/HarasztosAgnes/Foucault_WhatIsAnAuthor.pdf

- Christopher Hitchens

https://en.wikipedia.org/wiki/Christopher_Hitchens

- Daniel Chandler, An Introduction to Genre .Theory

https://faculty.washington.edu/farkas/HCDE٥١٠-Fall٢٠١٢/Chandler_genre_theoryDFAnn.pdf

- Janet Cameron, Plato's Argument: Art is an .Imitation of an Imitation

http://decodedpast.com/platos-argument-art-imitation-imitation/٢٩٩٠

https://en.wikipedia.org/wiki/Tractatus_Logico-Philosophicus

- Immanuel Kant, An Answer to the Question: Translated by Ted ?What is Enlightenment Humphrey.

https://www.stmarys-ca.edu/sites/default/files/attachments/files/Kant--What٪٢٠Is٪٢٠Enlightenment_.pdf

- Nicolas Xanthos, Wittgenstein's Language Games:

http://www.signosemio.com/wittgenstein/language-games.asp

- **Wittgenstein Biography**

**https://history-biography.com/ludwig-/wittgenstein**

.- Mary Klages, Postmodernism

https://homepage.univie.ac.at/melanie.loidolt/courses/ws٢٠٠٧Inter/postmodern.htm

- **Aili Bresnahan, The Dynamic Phenomenon of Art in Heidegger's The Origin of the Work of Art**

https://www.researchgate.net/publication/٢٧٦٢١٩٢٤٦_The_Dynamic_Phenomenon_of_Art_in_Heidegger's_The_Origin_of_the_Work_of_Art

- **LUDWIG WITTGENSTEIN,** From *Essential Selections in ١٩th and ٢٠th Century Philosophy,* by James Fieser.

https://www.utm.edu/staff/jfieser/class/٢١٦/pri/١١-٢١٦-wittgenstein.htm

- Wolfgang Iser, The Reading Process : A Phenomenological Approach

https://is.muni.cz/el/١٤٢٢/jaro٢٠١٦/SOCv٥v/um/٦١٨١٦٩٦٢/ISER-the-Reading-Process_١_.pdf

- Lisa Marder, **The Lore: Van Gogh Sold Only One Painting During His Life**

https://www.thoughtco.com/van-gogh-sold-only-one-painting-٤٠٥٠٠٠٨

- Adrian Campbell , **Crime and Punishment is ١٥٠ – and its politics are more relevant .than ever**

http://theconversation.com/crime-and-punishment-is-١٥٠-and-its-politics-are-more-relevant-than-ever-٦٩٢٥٩

Heidegger and the concept of - Lilian Alweiss, time.

http://www.naturalthinker.net/trl/texts/Heidegger,Martin/texts%٢٠on%٢٠Heidegger/Alweiss,%٢٠Lilian%٢٠-%٢٠Heidegger%٢٠On%٢٠Time.pdf

- **Martin Heidegger, What Is Metaphysics?**

**http://www.stephenhicks.org/wp-content/uploads/٢٠١٣/٠٣/heideggerm-what-is-metaphysics.pdf**

به زمانی دانمارکی

کتێب

- Hjördis Nerheim og Viggo Rossvær, Filosofins Historie fra Sokrates til Wittgenstein, Oversættelse og biografier: Niels Christian Stefansen, ٢ udgave, ٢. oplag ٢٠٠٠, Politiken Forlag A/S, København.

DET lille - K. E. Løgstrup, Martin Heidegger, FOLAG, printed in Denmark ١٩٩٦, side ٥٢

لینکی گوتارەکانی خۆم لە ئینتەرنێت

http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٠/٣/karwan_bakhtyar.htm

http://www.dengekan.com/doc/٢٠١٥/٣/karwanKakaswr_ardalan.pdf

http://hemin.dk/files/pdf/KKS_majority.pdf

## (كاروان كاكەسوور)

## پێشتریش ئەم كتێبانەی چاپ كردوون:

_ (ئەسپیدیلۆن)، كۆمەڵەچیرۆك.

_ (ئای لەڤیلیا لەڤیلیا!)، ڕۆمان.

_ (منداڵیم ئاسكێك بوو بەسەر پەلكەزێڕینەكاندا بازبازێنی دەكرد)، ژیاننامە.

_ (سەدەی یەكەمی خەیاڵ)، كۆمەڵەچیرۆك.

_ (بولبول و پاشا)، چیرۆكی (هانس كریستیان ئەندەرسن). لە دانماركییەوە وەری گێڕاوە.

_ (زنجیرەیەك، كە لە بیست كتێبی منداڵان پێك هاتووە). لە ئینگلیزییەوە وەری گێڕاون.

_ (مناڵێك بە دزییەوە كتێب دەخوێنێتەوە)، گفتوگۆیەكە (دانا فایەق)ی چیرۆكنووس لەگەڵی كردووە.

_ (سوارەكان بە قاچاغ بووكیان گواستەوە)، ڕۆمانێك بە هاوبەشی لەگەڵ (دوارۆژ كاروان كاكەسوور)دا.

بڕیاردان لەسەر تێکست بە چاک، یان بە خراپ خەسڵەتی سەرەکیی ڕەخنەگری میللییە. ئەو تەنیا یەک حەقیقەت و یەک لۆژیک دەناسێت، کە فەلسەفە بە درێژایی مێژووی خۆی ڕووبەڕووی ئەو تێگەیشتنە ساکارە بووەتەوە و هەوڵی داوە تێکی بشکێنێت. ئەمەیش مانای وایە ئەو تێکستە هەر لە بنەڕەتەوە لای ئەو ڕەخنەگرە میللییەدا گرنگیی نییە، بگرە جاری وا هەیە دەگاتە ئەوەی هەر خودی تێکستەکەیش دەشارێتەوە و پەرەگرافێکی لێ وەرناگرێت، چونکە ئەوەی لێرەدا پێی گرنگە، بڕیارە پێشوەختەکەیە، نەوەک لێکۆڵینەوە، وەک ئەوەی تۆی ئازیز لەم دوو گوتارەتدا کردووتە. (پۆل ریکۆر) پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، هێرمۆنتیکا، واتە تیۆریی ڕاڤەکردن هەر لە بنەڕەتەوە بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی کردارەکانی تێکستە.





